

ئەمین قادر مینە

# ئەمنی ستراتیجیی عیراق و سێکوچکەی بەعسیان: تەرحیل، تەعریب، تەبعیس

ئەمین قادر مینە

# ئەمنی ستراتیجیی عیراق و سێکوچکەی بەعسیان:
# تەرحیل، تەعریب، تەبعیس



ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران
سلێمانی ٢٠١٢

## ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران

دامەزراوەیەکی کەلتورییە بەپێی بڕیاری کۆنگرەی سێی ساڵی ٢٠١٠ ی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دامەزراوە، ئەرکەکەی بریتییە لە دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی هۆشیارکردنەوەی سیاسی، فراوان کردنی چوارچێوەکانی رۆشنبیریی گشتی، تۆکمەکردنی بەهاکانی دیموکراسی‌و مافی مرۆڤ و دادی کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵدا، تاوتوێ کردنی مەسەلەکانی بیری هاوچەرخ‌و دابین کردنی کەرەستەی پێویست بۆ پێگەیاندنی کادیران لە بوارە هەمەجۆرەکاندا.

- ئەمنی ستراتیجیی عێراق‌و سێکۆچکەی بەعسیان
- ئەمین قادر مینە
- بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاری‌و پێگەیاندنی کادیرانی (ی.ن.ك)
- دیزاین: کەمال
- تیراژ: ٢٠٠٠
- ژمارەی زنجیرە: (٤٥٧)
- ژمارەی سپاردنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان (١٣٤٧) ساڵی ٢٠١٢

**سەرپەرشتیاری زنجیرەی کتێب**

**عوسمان حەمەڕەشید گورون**

www.pukhoshiari.com
info@pukhoshiari.com

# ناساندن

ئەم کتێبە بۆ یەکەم جار لەساڵی ۱۹۸۷دا وەك سێیەم کتێبی زنجیرەی لێکۆڵینەوەی دەزگای رۆشنبیری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بڵاوکرایەوە. کتێبەکە لەدوتوێی ٣٦٦ لاپەڕەی مام ناوەنجیدا، هاوپێچ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری نەخشە، زانیارییەکی چڕوپڕی دەربارەی راگواستنو بەعەرەبکردن تا ساڵی ۱۹۸٦ گرتە خۆی.

کتێبەکە کە لەرۆژگاری ئەو سەردەمەدا تەنها ۳۰۰ دانەی لێ چاپ کراوە، لەهەلومەرجی پەرەسەندنی شاڵاوی راگواستنو بەعەرەبکردنو بەکارهێنانی چەکی کیمیایدا نوسراوە. ئەگەرچی نوسینی کتێبەکە نزیکەی ساڵێکی خایاند، بەڵام پرۆسەی کۆکردنەوەو تاوتوێکردنی زانیارییەکان، بەشێنەیی‌و بەبەشداربونی سەدان پێشمەرگەو خەڵکی شارەزای گوندەکان، بەڕێوەچو. ئەم لێکۆڵینەوەیە لەڕوی زانستییەوە لێکۆڵینەوەیەکی زۆر وردەو لەکۆکردنەوەی زانیارییەکاندا رێوشوێنی مەسحی مەیدانی بەکارهێنراوە.

کەم کەس دەزانێ دانەری ئەم کتێبە ئەمین قادر مینەیە، چونکە دانەر لەکاتی دەرکردنی کتێبەکەدا ناوی خۆی لەسەر دانەنا، بەڵکو بەناوی "چیا"وە دەری کرد.

ئەم کتێبە بۆ دۆکۆمێنتکردنی شاڵاوەکانی راگواستنو بەعەرەبکردن لەکوردستاندا سەرچاوەیەکی بنەڕەتی پێکدێنێ. دانەر کتێبەکەی بەسەر ۳ بەشدا دابەش کردوە. بەشی یەکەم توێژینەوەیەکی تیۆریکییە سەبارەت بەئەمنی ستراتیجیی عێراقو تیۆریی ئەمنی قەومیو فەسلێکی ئەم بەشە بۆ ئەمنی قەومیی عەرەب لەروانگەی حیزبی بەعسەوە تەرخان کراوەو دوو بەشەکەی تری، یەکێکی بۆ سیاسەتی راگواستن تەرخان کراوەو ئەوی تر بۆ سیاسەتی بەعەرەبکردن.

ئەم چاپی دووەمە کە پاش دوانزە ساڵ لەدەرچونی چاپی یەکەم دەردەچێ، جیاوازییەکەی ئەوتۆی لەگەڵ چاپی یەکەمدا نیە ئەوە نەبێ هەندێ پەرەگرافو واژەی لێ لابراوە، کە لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی ماوەی ئەو دوانزە ساڵەدا

ڕێکناکەون. دانەر کە ئێستا لەبەریتانیا دەژی، بەفاکسێکی بەڕێوەبەری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی کوردستان لەچاپکردنەوەی کتێبەکەی ئاگادار کرایـەوەو هەر لەسەر داوای بەڕێزیشی ناوی ڕاستەقینەی ئاشکرا دەکرێ.

ئەم چـاپی دووەمـە، جگـە لەپێشـەکیی‌و جگـە لەسـوکە دەسـتکارییەکی زمانەوانی‌و کوژاندنەوەی هەندێ پەرەگراف، وەك لەسەرەوە باس کرا، وەکـو خـۆی لەچاپ دەدرێتەوە، بەو ئومێدەی کە دانەر لەئاییندەدا ئەو هەلەی بـۆ هەڵکـەوێ کە بەکتێبەکەدا بچێتەوەو زانیاریی تازەی بخاتە سەر. لەسـۆنگەی ئەمـەوە، ئـەم چاپەش وەك چاپی یەکەم، تا ساڵی ۱۹۸٦ بڕ دەکا.

سەنتەر

## زانیاری لەبارەی دانەرەوە

* لەدایکبوی ۱۹٥٦ی شاری قەڵادزێیە.
* ساڵی ۱۹۷٥ لەکۆلیجی زانیاری زانکۆی سلێمانی وەرگیرا. ساڵی ۱۹۷۹ بەیەکەمی کۆلیجی زانیاریی بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەماتماتیک وەرگرت.
* ساڵی ۱۹۸۰ بۆ خوێندنی ماجستێر لەماتماتیک لەزانکۆی سلێمانی وەرگیرا. ساڵی ۱۹۸۲ خوێندنی ماجستێری تەواو کرد بەڵام لەبەر هۆی سیاسی نەیتوانی بڕوانامەکەی وەرگرێ.
* ساڵی ۱۹۸۲ چووە ریزی هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە. تا ۱۹۸۸ ئەندامی دەزگای رۆشنبیری‌و لە۱۹۸۹وە تا ۱۹۹۰ ئەندامی دەزگای ناوەندیی رێکخستنی کۆمەڵە بوو. بەناوی زەریاو چیاوە هەندێ وتاری بڵاوکردۆتەوە.
* لەتشرینی یەکەمی ۱۹۹۰ـەوە لە لەندەن دەژی.
* ساڵی ۱۹۹۳ بڕوانامەی ماجستێری لە Engineering Information Systems (هندسة نظم المعلومات) لەزانکۆی South Bankی لەندەن وەرگرت.
* ساڵی ۱۹۹٤ بڕوانامەیەکی تری ماجستێری لەماتماتیک لەئیمپریال کۆلیجی زانکۆی لەندەن وەرگرت.
* لەنیسانی ۱۹۹٦ـەوە تا نیسانی ۱۹۹۸ سەرۆکی مەڵبەندی رۆشنبیریی کورد بوو لە لەندەن.

# پێشەکی

لەم ساڵانەی دواییدا بایەخێکی زۆر بەلێکۆڵینەوە ستراتیجییەکان دراوە، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بەدیاردەی ئەمنی قەومییەوە هەیە، نەك هەر لەسەر ئاستی داموو دەزگا ستراتیجیو ڕەسمییە پەیوەندیدارەکانی دەوڵەتان، بەڵکو لەسەر ئاستی ئەکادیمیش. هەر بۆیە زانستی ستراتیج بۆتە بابەتێك لەبابەتەکانی گەلێ زانکۆو کۆلیجی وڵاتە پێشکەوتووکانی دنیا، بگرە لەهەندێ شوێن کۆلیجو ئامۆژگای سەربەخۆشیان دامەزراندووە بۆ لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی هەموو ئەو دیاردانەی پەیوەندییان بەم زانستەو ژیانی دەوڵەتانەوە هەیە.

ڕژێمی بەعسیش لەعێراقدا بایەخێکی زۆری بەلێکۆڵیەوە ستراتیجییەکان داوە، چ لەسەر ئاستی ڕەسمیو چ لەسەر ئاستی ئەکادیمی، بۆ ئەم مەبەستەش چەندین کۆلیجو ئامۆژگای دامەزراندووە، کە تیایدا زانستی ستراتیجو ئەمنی قەومی دەخوێنرێ، هەر وەك لەباری سەرەنجی بەعسیشەوە رادەو ئەندازەی ئەو مەترسیانە هەڵدەسەنگێنرێ، کە هەڕەشە لەئەمنی ستراتیجیی عێراقو ئەمنی قەومیی عەرەب دەکەن، لەپێناوی دیاریکردنی ڕێوشوێنی لەبار بۆ ڕووبوونەوەی ئەو مەترسیانەو لەباربردنیان.

یەکێ لەو مەترسیانەی بەعس بەدرێژایی تەمەنی خۆی، بەتایبەتی لەوەتەی دەسەڵاتی سیاسیی گرتۆتە دەست، باسی لێوە دەکا مەترسی کوردە، هەر بۆیە مەسەلەی کوردو جوڵانەوەکەی لەبیری ستراتیجیی بەعسدا شوێنێکی دیارو گرنگی گرتووەو هەوڵو تەقەلایەکی زۆریشی داوە ئەو "مەترسی"یە نەهێڵێت یا لەشوێنەواری کەم بکاتەوە، بۆیە ستراتیجی بەعس سەبارەت بەکورد ڕوو لەتواندنەوەو قوتدانی ئەم نەتەوەیەو داگیرو بەعەرەبکردنی نیشتمانو خاکەکەیەتی.

مەبەستی ئەم لێکۆڵینەوەکە نیشاندانو دەرخستنی ئەو مەترسییە کە ڕژێمی بەعس خستویەتیە سەر گەلی کوردو هەڕەشە لەبوونی نەتەوایەتی دەکا، لەپێناوی ئەوەدا لێکۆڵینەوەکە کراوەتە سێ بەش، هەر بەشەش بریتییە لەچەند فەسڵێك.

بەشی یەکەم کە دەربارەی ئەمنی ستراتیجیی عێراقە، لەدوو فەسڵ پێکهاتووە. فەسڵی یەکەم: سەرەتایەکی تیۆری دەربارەی چەمکی "ئەمنی قەومی" کراوەتە چوار باس کە هەر یەکێ لەو باسانە دەربارەی گەشەکردنی چەمکی ئەمنی قەومیو پێناسەکانی، بنەما جیو ستراتیجییەکانی ئەمنی قەومی، ئاستە ناوەکی، دەرەکیو دەولییەکانیو ئاستە هونەرییەکانی ئەمنی قەومی دەدوێ.

فەسڵی دووەم ئەمنی قەومی عەرەب لەبارەی سەرەنجی بەعسەوە دەخاتە روو، ئەویش بەگوێرەی پێویستی کراوەتە سێ باس، کە یەکێکیان دەربارەی پێناسەی بەعسییانەی چەمکی ئەمنی قەومییەو باری سەرەنجی بەعس لەمەڕ نەتەوەو کەمە نەتەوەکان، مەسەلەی دیموکراسیو پێناسەی ئەمنی ستراتیجی عێراق دەرەخا. باسێکیشیان دەربارەی هەڵسەنگاندنی مەترسیەکانی سەر دەوڵەتی عێراقو ئەو فاکتەرانەی رۆڵی کاریگەریان لەداتاشینی ئەم قەوارەیەدا بینیوە نیشاندراوە، هەر وەك گشت ئەو مەترسییە ناوەکیو دەرەکییانەی لەباری سەرنجی بەعسەوە هەرەشە لەئەمنی ستراتیجی عێراق دەکەن، دەستنیشان کراوەو بەدرێژیی باسی لێوە کراوە، لەکاتێکا سێیەمیان بریتییە لەو رێوشوێنانەی رژێمی بەعس گرتویەتیە بەر بۆ نەهێشتنی "مەترسی کورد" لەسەر دەوڵەتی عێراقو بەدرێژیی باسی ئەو ئامارە ناوەکیو دەرەکییانە کراوە، کە رژێمی بەعس بۆ ئەم مەبەستە بەکاری هێناوەو دێنێ.

بەشی دووەم باسی سیاسەتی "تەرحیل"و "تەهجیر"و جۆرەکانی دەکا، ئەمیش کراوەتە پێنج فەسڵ کە فەسڵی یەکەمیان دەربارەی سیاسەتی راگواستنی کوردە لەخاکی کوردستان، کە ئەویش بریتییە لەدوو باس کە یەکەمیان سەرەتایەکە دەربارەی ئەم سیاسەتەو پێڕەوکردنی لەوڵاتانی تریشداو بەراوردکردنیان، باسی دووەمیشیان دەربارەی سنووری کوردستانی عێراقەو ناوچە کوردییەکانی عێراق دیاری دەکا، تا ئەندازەی مەترسیی راگواستنو بەعەرەبکردنی کوردستان رۆشنترو ئاسانتر دەربخا.

بەڵام چوار فەسڵەکەی تر بەگوێرەی جۆرەکانی راگواستن پۆلێن کراون، کە فەسڵی دووەمیان دەربارەی راگواستنی ناوچەکانی تەوەرە ستراتیجییەکانە کە تیایدا بەدرێژی باسی تەوەرە ستراتیجییەکانی ناوەوەو دەرەوەی عێراق کراوە، ئەو

تەوەرانەی رژێمی بەعس بەبیانوی بەرگری کردن لەعێراق‌و پاراستنی دانیشتوانە کوردەکەی راگواستووەو بەعەرەبی کردوون.

فەسڵی سێیەم دەربارەی راگواستنی ناوچە نەوتییەکانی کوردستانی عێراقــە کە ئەویش کراوەتە سێ باس. یەکێکیان بەدرێژی باسی ناوچە (نــەوت)ییــەکانی کوردستانی عێراق دەکـا، چ ئەوانــەش کــە دۆزراونەتــەوەو هێشــتا نــەوتیان لێ دەرنەهێنراوە، هەر وەك ئەوانەش کە (ئیستکشــاف) نــەکراون. لــەکاتێکا باســی دووەمیــان لــەرۆڵی نــەوت لــەژیانی ئــابوری ـ کۆمەڵایــەتی‌و سیاســی گــەلی کوردســتاندا دەکــات‌و شــوێنەوارەکانی دەســت نیشــان دەکـا. هــەروەها ســێیەم باسیشیان دیاریکردنی ئەو ناوچانەیە، کە بەهۆی نەوتەوە راگوێزراون.

فەسڵی چوارەم لەراگواستنی ناوچە سـنورییەکان دەدوێ‌و تیایــدا مەبەســتی رژێمی بەعس لەراگواستنی ئەو ناوچانەدا دەخاتەڕوو، هــەر وەك ئــەو ناوچــانەش دیاری دەکا کە بەر راگواستن کەوتون.

فەسڵی پێنجەمیان دەربارەی جۆرەکانی تری راگواستنە، کە ئەویش کراوەتــە سێ باس. باسی یەکەمیان دەربــارەی راگواســتنی ئــەو شــوێنانەیە کــە بــەهۆی جەنگی عێراق ـ ئێرانەوە کاول کراون‌و راگوێزراون. باسی دووەمیشــیان دەربــارەی راگواستنە بەهۆی جەنگی کوردستانەوە، کە تیایــدا بەدرێــژی باســی سیاســەتی بەسوتماك کردنی خاکی کوردستان کراوەو هەوڵی رژێمیش بۆ بەســوتماك کردنــی هەموو خاکی کوردستان خراوەتەڕوو. هەروەها ئەو ناوچانەش دیاری کــراون، کــە بەهۆی جەنگی کوردستانەوە تەخت کــراون‌و دانیشتوانەکەشــی راگــوێزراون. دوا باســـیان دەربـــارەی هۆکـــانی تـــری راگواســـتن دەدوێ، وەك راگواســـتن بـــەهۆی دامەزراندنی ســەربازگەو باروتخانــەوە، راگواســتن بــەهۆی راپــەڕینی خەڵکــەوەو راگواستن بەهۆی بەستی ئاسکی موسڵەوە.

دوا بــەش، واتــە بەشــی ســێیەم، دەربــارەی سیاســەتی بەعــەرەب کردنــی کوردستان‌و کوردە، کە ئەویش بەسەر دوو فەسڵدا دابەشکراوە. فەسـڵی یەکـەم لەبەعەرەب کردنی کوردستان دەکۆڵێتەوە، بۆ ئەم مەبەســتە فەسـڵەکە کراوەتــە سێ باس کــە یــەکێکیان دەربــارەی سیاســەتی رژێــم‌و مەبەســتەکانێتی لەمــەڕ بەعەرەب کردنی کوردستان، باســی دووەمیــان قۆناغــەکانی بەعــەرەب کردنــی کوردستان نیشان دەداو دەیکاتە چوار قۆناغ‌و خاسیەتەکانی هەر قۆناغێك‌و ئــەو ناوچانەش کە لەم قۆناغەدا بەر شاڵاوی بەعەرەب کردن کەوتون دەخاتــەڕوو، دوا

باسیان لەسیاسەتی (استعماري استطیاني) رژێمی بەعس دەدوێ و زۆربەی ئەو (مستوطنة)انەی لەکوردستاندا دروست کراون نیشاندەدا.

فەسڵی دوومیان دەربارەی بەعەرەب کردنی کوردە، کە تیایدا سیاسەتی رژێمی بەعس لەمەڕ بەعەرەب کردنی کوردیش دەکاتەوە، هەر وەك ئەو عەشیرەتە کوردانەو پەیڕەوکەرانی ئەو ئایینانەی بەعەرەب دانراون دیاری دەکا.

لەدوای هەر بەشێك لەو سێ بەشانە پوختەی بەشەکە دێ کە هێڵە گشتییەکانی ئەو بەشە، بەشێوەیەکی چڕو پڕ، لەچەند خاڵێکدا کۆدەکاتەوە. واتە کۆبەندی بەشەکەیە.

هەروەها بۆ رونکردنەوەی باسەکان چەندین نەخشە خراوەتە ناو لێکۆڵینەوە بەمەبەستی نیشاندانی ناوچە جۆراو جۆرە راگوێزراوەکان، چ بەگوێرەی پارێزگاکانو چ بەگوێرەی جۆرەکانی راگواستن، هەروەها ناوچە تەعریب کراوەکانو قۆناغەکانی بەعەرەب کردنی کوردستانیش دیاری کراوە.

لەکۆتایی لێکۆڵینەوەکەشدا ئەنجامگیری دێ کە تیایدا ئەو ئەنجامانەی لەلێکۆڵینەوەکە هەڵێنجراون خراونەتە روو، کە گرنگترینیان پێویستی یەکخستنی هێزی پێشمەرگەو بوونی ستراتیجێکی بەرزی سەربەخۆی جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانیی کوردستانە لەعێراقدا.

لەکۆتاییشدا چەندین پاشکۆ بۆ زیاتر رونکردنەوەی باسەکان دانراون کە یەکێکیان دەربارەی دابەشبونی ئیدارەی ـ سیاسیی کورستانی عێراقەو یەکە ئیداریەکانو رووبەرەکانێتی بەگوێرەی دابەشبوونی ئیداری ساڵی ١٩٨٤و پاشکۆکانی تریش ئاماری ناوچە راگوێزراوەکانی کوردستان بەگوێرەی جۆرەکانی راگواستن نیشاندەدا: ناوچەکانی تەوەرە ستراتیجییەکان، ناوچە نەوتارییەکان، ناوچە سنوورییەکان، ئەو ناوچانەی بەر جەنگی عێراق ـ ئێران کەوتوون، راگواستن بەهۆی جەنگی کوردستانەوە هەروەها بەهۆی سەربازگەو باروخانەو راپەڕینی خەڵکوبەستەوە.

بەڵگەنەویستو روونو ئاشکرایە کە لێنکۆڵیەوەیەکی لەو بابەتانە روبەرووی گەلی کەندو کۆسپ دەبێتەوە، کە زۆربەیان لەم سەرچاوانەی خوارەوە بناوان هەڵدەگرن:

* ئەم لێکۆڵینەوانە پێویستییان بەئامارو زانیاری فرە هەیە دەربارەی هەموو بوارەکانی ژیانی سیاسی، سوپایی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی... کە لەژێر سایەی رژێمی بەعسدا دەست ناکەونو ئەوانەش کە هەن، پڕن لەکەمو کوڕی یان درۆو ناڕاستن.

* ئەم لێکۆڵینەوانە پێویستییان بەبەڵگەنامە هەیە، بەتایبەتی ئەو سەدان بڕیارە نهێنیو ئاشکرایانەی، کە رژێم دژی گەلی کورد دەری کردون، کە بەدەست خستنیان کارێکی گرانو دژوارە.

* وێڕای نەبوونی سەرچاوەی پێویست، بەتایبەتی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی، دەربارەی ئەم بابەتانە ئەو لێکۆڵینەوانەش کە دەربارەی ئەمنی قەومین بەزمانی عەرەبی تارادەیەك کەمنو ئەوەی دەستیش دەکەوێ، هەر لەبارەی سەرنجی بەعسەوە لەم دیارەیە دەکۆڵێتەوە.

واتە زۆربەی ئەو سەرچاوانەی کە بۆ لێکۆڵینەوەیەکی ئاوهایی پەیوەندییان بەنهێنییەکانی دەوڵەتەوە هەیە، دەسناکەون لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ دراوە چەند لەتوانادایە زانیاری وردو فرەلایەنە بۆ ئەم مەبەستە کۆبکرێتەوەو سودیش لەچەنین سەرچاوەی تایبەتی وەرگیراوە.

ئاماری گوندەکانیش بەهۆی دەیان کادری سیاسیو پێشمەرگەو سەدان خەڵکی شارەزای گوندو لادێکانی کوردستان کۆکراوەتەوەو هەوڵ دراوە زۆر وردو راست بێت، بۆ ئەم مەبەستەش پارێزگای سلێمانی کراوەتە نموونە: بەگوێرەی ئەو ئامارانەی لێرەدا بڵاوکراونەتەوەو لەخەڵکانی شارەزا کۆکراونەتەوە، ژمارەی خێزانە راگوێزراوەکانی ناوچە سنورییەکانی پارێزگای سلێمانی بریتییە لە١٨٥٩٩ خێزان، لەکاتێکا ژمارەی ئەو خێزانانە بەپێی سەرچاوە رەسمییەکانی دەوڵەت بریتییە لە١٨٥٧٦ خێزان* واتە رێژەی هەڵەکردن دەگاتە ١٢,٠٪ کە دەشێ پشتگوێ بخرێ. جا لەگەڵ جیاوازی زەمانی راگواستن ١٩٧٥-١٩٧٨و زەمانی کۆکردنەوەی ئامارەکان، کە هەمووی لەنیوەی دووەمی ساڵی ١٩٨٦دا کۆکراوەتەوە، بەلەبەرچاوگرتنی ئەو رێژە زۆرکەمەی هەڵەکردن دەتوانین پشت بەئامارەکان ببەستین. ئەو زانیاریانەی لێرەشدا کۆکراونەتەوە تا کۆتایی ساڵی

---

* د. خليل أسماعيل محمد، انماط الاستيطان الريفي في العراق، أطروحة دكتوراه مقدمة الى جامعة بغداد مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٨٢، ص٣٧٠.

١٩٨٦ه، واتە ئەو گوندو شوێنانەی لەسەرەتای ١٩٨٧ەوە بەر ڕاگواستن کەوتوون، لێرەدا کۆ نەکراوەنەتەوە، هەروەها نەشتوانراوە زانیاری دەربارەی هەندێ ناوچە، لەبەر دووری، کۆبکرێتەوە.

* * *

لەڕاستیدا ئەم لێکۆڵینەوەیە یەکێ لەپرۆژەکانی ناوەندی کۆمەڵە بوو، بۆیە بەدەرفەتی دەزانم لێرەدا سوپاسی ناوەند بکەم کە ئەو پرۆژەیەیان پێ سپاردمو لەکاتی پێویستیشدا یارمەتییان داومو گرێ کوێرەکانیان بۆ کردوومەتەوە. هەروەها سوپاسی ئەو هەموو کادرو پشمەرگانەش دەکەم کە لەکۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی گوندەکانی کوردستان یارمەتییان داوم، ئەوانەش کە ئەرکی پیاچوونەوەی ئەم باسەیان کێشاوەو سەرنجی بەسودیان هەبووە. هەروەها سوپاسی ئەو هاورێیانەش دەکەم کە ئەرکی تایپو چاپکردنیان بەرکەوتووە.

دانەر

# بەشی یەکەم

## ئەمنی ستراتیجیی عێراق:
## مەترسیەکان و ئامرازەکانی رووبەڕووبونەوەی
## "مەترسی کورد"

# فەسڵی یەکەم

# سەرەتایەکی تێوری دەربارەی چەمکی ئەمنی قەومی

## ١-١-١: گەشەکردنی چەمکی ئەمنی قەومیو پێناسەکانی

### ١- گەشەکردنی چەمکی ئەمنی قەومی:

هەر لەو کاتەوە مرۆڤ هاتۆتە کۆڕی ژیانەوە، خۆی لەشێوەی خێزانو هۆزو تیرەو خێڵدا ڕێکخستووە، ڕووبەڕووی گەلێ مەترسی بۆتەوە کە هەڕەشەی لەژیانو بوونی کردووە. هەندێ لەو مەترسییانە سەرچاوەکەی خودی سروشت بووە، وەك، باوبۆران، لافاو، سەرماو سۆڵە، بومەلەرزەو گیانداری دڕندە. هەندێکی تریش مرۆڤی هاوشێوەی خۆی بووە لەهۆزو تیرەو خێڵەکانی تردا. هەر بۆیە، لەوساوە ترسو خۆپاراستن لەناخی دەروونی مرۆڤدا ڕەگی خۆی داکوتاوەو ئەمنو ئاسایش بۆتە مەرجێکی جەوهەریو پێداویستییەکی بنچینەیی بوونی مرۆڤی ڕێکخراوو کارێکی سروشتی بووە کە مروڤ وریاو بەئاگا بێت لەو مەترسییانەی ڕووبەڕووی دەبنەوە. مرۆڤی ئەوسا بۆ خۆپاراستن پەنای بردۆتە بەر ئەشکەوتو شکێر تا خۆی لەو مەترسییانە بپارێزێت. لەلایەکی تریشەوە، بەپێی ئاستی ئەوسای هێزە بەرهەمهێنەرەکان، هەوڵی دروست کردنو دۆزینەوەی ئامارازی وای داوە، هەم لەهێرشو پەلاماری هۆزو تیرەو خێڵە جیاجیاکانی تر بیپارێزێو هەم هۆیەکیش بێت بۆ ڕەواندنەوەی مەترسیی ئاژەڵی دڕندە، ئامرازێکیش بێت بۆ ڕاوو شکار تا پێداویستییەکانی ژیانی خۆی لێ دابین بکات.

مرۆڤ هەمیشە هەوڵی داوە چەکی نوێو ئامرازی نـوێ دابهێنـێ تـا بتوانـێ بەباشترین شێوە خۆپاراستن مسۆگەر بکات. بەڵام پێ بەپێی گۆڕانو گەشـەکردنی کۆمەڵ، جۆرو ئەندازەی مەترسییەکانیش گۆڕاون، هەر بۆیە جۆرو شێوەی چەكو ئامرازەکانیش، بۆ رووبەروبوونـەوەی ئـەو مەترسـییانە، گـۆڕانو گەشـەکردنیان بەسەردا هاتووە. بەڵام هەرگیز ئەو داهێنانو دۆزینـەوە نوێیانـە نەبونەتـە هـۆی کەمکردنەوەی مەترسییەکان، بگرە رادەی مەترسییەکانی زیاتر کردووە، تەنانەت ئیمپراتۆریەتە گەورەکانی دنیاش کە دەستیان بەسەر بەشـێکی دنیـادا گرتبـوو، بێبەش نەبوون لەترس، جا چ ئەو ترسە راستەقینە بووبێ یا واهیمە.

شۆڕشی پیشەسازی گۆڕانێکی بنچینەیی بەسەر جۆری چەكو تفاقی جەنگی هێنا. هەروەك دۆزینەوە جوگرافییەکانیش ئاسـۆیەکی روونتریـان لەبـەردەم ئـەو گەلو نەتەوانەدا کردەوە بۆ داگیرکردنی وڵاتـانی تـرو بـەتاڵان بردنـی سـەروەتو سامانی ئەو نەتەوانە. هەر بۆیە جۆرو ئەندازەی مەترسییەکانیش گۆڕانی بەسەدا هـات. ئـیتر بـاوی ئـەوە نـەما مـرۆڤ هـەر بـیر لـەو مەترسـیانە بکاتـەوە کـە لەچوارچێوەی وڵاتەکەی خۆیو دەورو بەریا هەرەشەی لێ دەکا، بـەڵکو مـەترسـی شەڕو شـۆڕو جـەنگێن، بەچـەکی نـوێو تـازە، لەلایـەن ئـەو دەوڵەتانـەش کـە کەوتوونەتە ئەودیو دەریاکانـەوە، کەوتـە سـەریان، چـەندین جـەنگی سـەختو خوێناوی لەنێوان ئەو گـەلو نەتەوانـەدا روویـدا لـەپێناوی دەسـتگرتن بەسـەر سەروەتو سامانی ئەو گەلانەدا.

جا هەر چەندە ئەمن مەسەلەیەکی خودییە، پەیوەنـدیی بـەخودی مرۆڤـەوە هەیە، بەڵام ئێستا، لەسەر ئاستی جیهاندا، بۆتە مەسەلەیەکی نەتـەوەیی، هـەر بۆیە بۆ دەربڕینی ئەو واقیعە نوێیە چەندین چەمکی نـوێ لەشـێوەی: "ئـەمنی قەومی"، "ئەمنی ناوچەیی"، "ئەمنی دەولی" هاتونەتە کایەوە.

لەدوای یەکەمین جەنگی جیهانییەوە زاراوەی مەیدانی ژیان لەلایـەن زانـای ئەڵمانی هاوسهۆفەر هاتەکایەوە، دواتـر، ئـەو زاراوەیـە بـوو بەبنچینەی کـارو کردەوەکانی نازیەکانی ئەڵمانیا بۆ پاساودانی داگیرکردنی وڵاتانی تـر. بـەگوێرەی ئـەو زاراوەیـە نەتـەوەی ئـەڵمان بـۆی هـەبوو بـەناوی پاراسـتنی بەرژەوەندییـە نەتەوەییەکانی خۆی، بەناوی دابینکردنی ژیانی خۆی پەلاماری خاكو نیشـتمانی گەلانی ترو نەتەوەی تر بداتو سەروەتو سامانیان بەتاڵان بەرێتو خێـرو بـیری ئەو وڵاتانە بۆ خۆی بەرێت.

هەرچەندە "چەمکی ئەمنی قەومی چەمکێکی نوێیە کە پەیوەندی بەئەرکەکانی دەوڵەتی نوێو حکومەتی ناوەندییەوە هەیە، کە بەتەنها دەسەڵاتی بڕیاردانی مەسەلەکانی سیاسەتو جەنگی هەیە"[1] بەڵام چونکە ئەو دەوڵەتە نوێیانە، زۆربەیان، بەگوێرەی ویستو ئارەزووی دەوڵەتە زلهێزەکانو بەگوێرەی نەخشەکانیان لەدوای یەکەمین جەنگی جیهانیەوە دروست کراون، بۆیە ناکرێو ناشێ ئەم حاڵەتانەی خوارەوە لە چوارچێوەی ئەم پێناسەی سەرەوەدا جێی بکرێتەوە:

هەندێ نەتەوە هەیە کە چەندین دەوڵەتی جیاجیاو رژێمی جیاجیای هەیەو ئێستاش نەیتوانیوە لەچوارچێوەی یەك دەوڵەتی نەتەوەیدا یەك بگرێتەوە، وەك: عەرەب، کۆری

هەندێ نەتەوە هەیە بەشێکی یا پارچەیەکی نیشتیمانەکەی خاوەن دەوڵەتە لەکاتێکدا پارچەکەی تری لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتێکی تردایە، وەك: ئازەر

* هەندێ نەتەوەی تر هەیە پارچە پارچە کراوەو هەر پارچەیەکیشی بەدەوڵەتێکەوە بەستراوەتەوە بێ ئەوەی هیچ پارچەیەکی ڕزگار کرابێ یاخاوەن دەوڵەتی تایبەت بەخۆی بێت وەك:کورد، بەلووچ

جا لەبەر ئەوەی ئەمنی نەتەوەیی پەیوەندی نەك هەر بەدەوڵەتانەوە هەیە، بەڵکو پەیوەندی بەکۆمەڵە نەتەوەشەوە هەیە، بۆیە ئەم حاڵەتانەی سەرەوە بەحاڵەتی تایبەتی دەژمێردرێن.

هەر چەندە هەوڵو کۆششی نەتەوەو دەوڵەتانی دنیا هەمیشە ڕوو لەخۆپاراستنێکی مسۆگەرتر بووە، روو لەوە بووە ئەمنێکی رەها لەجیهاندا بەدی ناکرێ، جا ئەو دەوڵەتە قوڵایی ستراتیجی هەرچەند بێو توانای ئابووریو سوپاییو مرۆیی هەرچەند بێ، بۆیە تەنانەت دەوڵەتە زلهێزەکانی دنیاش دڵنیاو بێترسو لەرز نین بەئەندازەی ئەو مەترسییانەی دەکەوێتە سەریان کەمیش بێ یا توانای لەباربردنی ئەو مەترسیەش لە ئارادا بێ. بۆیە هەمیشە دەوڵەتانی دنیا تێدەکۆشن، بەهەر شێوەیەك بێ، جۆرێك لەجۆرەکانی ئەمن بۆخۆیان مسۆگەر

---

[1] ـ عودة، د.عبدالملك: قضايا الامن القومي في اطار التكامل، مجلة السياسة الدولية، العدد ٥١، ١٩٧٨، ص٢٣-٢٤. وەرگیراوە لە: بغدادي،عبدالسلام ابراهيم،مفهوم الكيان الصهيوني للامن القومي،دارالحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٥، ص١٣.

بکەن تا دڵنیایی لای ئەندامانی کۆمەڵەکەی زیاتر بکا، بۆ ئەو مەبەستەش چەندین ڕێگا دەگرنەبەرو چەندین ئامرازیش بەکار دێنن، وەك: پێکەوەنانی هێزی سوپای نوێو مۆدێرن، دانانی بناغەیەکی پتەوی ئابووری، بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریو ڕۆشنبیری گەل، پەیمان بەستن لەگەڵ دەوڵەتانی دەوروبەرو دنیا........

دۆزینەوەی چەکی ئەتۆمی، گۆڕانێکی بنچینەیی بەسەر دیاردەی ئەمنی قەومیدا هێناو بنچینەکانی لەریشەوە گۆڕی، وڵاتانی دنیا بوونە دوو بەش: هەندێکیان خاوەن چەکی ئەتۆمینو زۆربەشیان بێ بەشن لەو چەکە. جگە لەمە چەمکی ئەمنی قەومیو ئامانجەکانیو ئامرازەکانی بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەش بە گوێرەی بایەخی دەوڵەتان و شوێنو بەرژەوەندیەکانی جیاوازی پەیدا کردووە، واتە: هەموو وڵاتانی دنیا بەیەك پێوەدانگو لەیەك ڕوانگەوە بۆ ئەمنی قەومی ناچن، بەڵکو هەریەکە بە پێی تواناو بەرژەوەندیو سروشتی چینایەتیی خۆی باری سەرنجی تایبەتی هەیە:

* دەوڵەتە زلهێزەکان: چوارچێوەی ئەمنی قەومی ئەو دەوڵەتانە زۆر درێژ دەبێتەوە، تەنانەت لەسنووری ناوچەیی خۆشی تێدەپەڕێ. ئەم دەوڵەتانە بەجۆرێك تەماشای ئەمنی قەومی خۆیان دەکەن، کە هەر گۆڕانێك لەهەر سوچێکی دنیادا ڕووبدات، پەیوەندی بە ئەمنی قەومی ئەوانەوە هەیەو چاك یا خراپ کاری تێ دەکات. بگرە زیاد لەمەش ئەم دەوڵەتانە دەسەڵاتیان "بەهەموو سوچێکی دنیا بڵاوبوتەوە، بگرە ئەمەش بەشیان ناکاتو بەرژەوەندییەکانیان پەل بۆ بۆشایی ئاسمانو بگرەئەستێرەکانی تریش داوێژێ"[2] بۆیە ئەم دەوڵەتانە لە هیچ گۆڕانێکی: سیاسی، سوپایی، ئابووری ......لەدنیادا بێ دەنگ نابنو هەڵوێستیان لەمەڕ هەر ڕووداوێك لەو ڕووداوانە دەردەبڕن.

* دەوڵەتە ناوەنجیەکان: ئەم دەوڵەتانە بەجۆرێك تەماشای ئەمنی قەومی دەکەن، کە قەوارەی نەتەوایەتیو یەکێتی ناوچەکەیان پارێزراو بێتو تا ڕادەیەکیش هەوڵ دەدەن بەرژەوەندیە دیارەکانیان، بەگوێرەی توانای خۆیان بەدی بهێنن.

---

[2] ـ هويدي، امين: الامن العربي في مواجهة "الامن الاسرائيلي"، دار الطليعة، بيروت، ١٩٧٥، ص١٤٨. وەرگیراوە لەهەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٨.

* بەڵام دەوڵەتە بچوکەکان بەجۆرێ تەماشای ئەمنی قەومی دەکەن، کە پارێزگاری لەبوونی خۆیانو ناوچەکەیان بکەن، بەجۆرێ لەم دنیا جەنجاڵەدا بتوانن سەربەخۆیی سیاسیو ئابووری خۆیان بەدەست بهێننو بیپارێزن.

هەروەها لەم سەردەمەی ئێستادا کە بەسەردەمی ناوکی ناسراوە، دەوڵەتانی دنیا هەر بەچەکی کلاسیکیەوە ناوەستن، بەڵکو هەوڵی پەیداکردن یا دروستکردنی چەکی ئەتۆمیش دەدەن تا وەك بەرپەرچێك بەکاری بهێننو وڵاتانی تر زاتی ئەوە نەکەن پەلاماری بدەن، هەر کاتێکیش پەلاماریاندا، ئەوە بەزەرەرو زیانێکی زۆرەوە لەجەنگەکە بێنەوە دەرەوە. بەگوێرەی هەبوون یان نەبونی چەکی ئەتۆمی، وڵاتانی دنیا دەکرێنە دوو بەش:

* هەندێکیان خاوەن چەکی ئەتۆمی هایدرۆجینیو نیترۆنین، ئەو دەوڵەتانە کاتێ نەخشەی ئەمنی قەومیان دادەڕێژن، زۆر وردتر، هەمەلایی ترو بەتێچوونێکی زۆرەوە نەخشەکەیان دادەڕێژن، هەروەها بۆ حاڵەتی ئاساییو نا ئاساییو کاتی تەنگو چەڵەمە نەخشەی جیا جیا دادەڕێژن.

* زۆربەی وڵاتانی دنیا کە بێبەشن لەو چەکەو دەبێ لەژێر سێبەری هەبونی چەکی ئەتۆمیدا نەخشەی ئەمنی قەومی خۆیان دارێژن. بەم جۆرە "شتێکی ئاساییە، بگرە پێویستو ناچارییە، کە هەموو دەوڵەتێك چوارچێوەی ئەمنی قەومی خۆی یاخود ستراتیجی ئەمنی خۆی دابڕێژێ بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی لەهێرشی راستەوخۆو ناراستەوخۆی هێزو دەوڵەتانی ترو لەکنەکردنو نفوزی بێگانەو پیلانگێڕیان بپارێزێ، یەکێتی خاكو گەلەکەیو سەربەخۆیی وڵاتەکەی جێگیر بکا، هەر لەبەر ئەوەشە هیچ دەوڵەتێك لەدنیادا نییە کە بایەخ بەمەسەلەی ئەمنی قەومی خۆی نەداو فاکتەرەکانی هەڵنەسەنگێنێو رێو شوێنی پاراستنو بەهێزکردنی دانەنێت، ئیتر سروشتی چینایەتی دەوڵەتەکەو جۆری رژێمەکەی هەر چۆنێك بێ، کۆنەپەرست بێ یا پێشکەوتنخواز، دیکتاتۆری بێ یا دیموکراتی، سۆسیالیستی بێ یا سەرمایەداری. هەڵبەتە هەر کام لەم دەوڵەتانە بەگوێرەی سروشتی چینایەتی خۆیو فەلسەفەی تایبەتی حوکمڕانی خۆی نەخشەی ئەمنی قەومی خۆی دائەنێ"[3].

---

[3] ـ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، دەزگای راگەیاندن، عێراقو مەسەلەی کورد، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، ١٩٨٤، ل٩.

ب ـ پێناسەکردنی چەمکی ئەمنی قەومی

ریشەی ئەم زاراوەیە بۆ سەردەمێکی دێرین دەگەڕێتەوە، بەڵام لەدوای دووەمین جەنگی جیهانو بەتایبەتی لەناوەڕستی حەفتاکانەوە بایەخێکی زۆرتری پێ دراوە. تا ئێستا پێناسەیەکی دیاریکراوو یەکگرتوو بۆ ئەم زاراوەیە دانەنراوە، چونکە لەلایەکەوە چەندین دامو دەزگای ستراتیجی، سیاسی، ئەکادیمی بایەخیان پێداوەو لێیان کۆڵیوەتەوەو هەر یەکەش لەسوچێکەوە سەیری ناوەڕۆکەکەی کردووە، لەلایەکی تریشەوە هەر دەوڵەتە بەگوێرەی هێزو توانای لەشوێنی لەسیاسەتی نێو دەوڵەتانو ئامانجو ئامرازەکانی بەدیهێنانیدا، لەروانگەی تایبەتی خۆیەوە ، بۆ ناوەڕۆکو پێناسەی ئەم زاراوەیە چووەو فاکتەرەکانی هەڵسەنگاندووە.

ئەگەرچی ناشێ ئەمە ببێتە هۆیەك یا رێگرێك لەبەردەم دانانی پێناسەیەکی وادا، کە بەشێوەیەکی روونو ئاشکرا، مەلایی تاووتوێی ناوەڕۆکی زاراوەکە بکاتو لێکی بداتەوەو بنەماو ئامانجەکانی دیاری بکاتو فاکتەرەکانی هەڵبسەنگێنێ. بەر لەوەی پێناسەیەکی ئاوا بکەین، پەنا دەبەینە بەر راوو بۆچوونی چەندین زاناو توێژەر کە لەباری سەرەنجی جیاجیاوە تەماشای ئەم زاراوەیان کردوەو پێناسەیان بۆ داناوە.

ئەمنی قەومی بە گوێرەی چەمکی نوێ، چەمکێکی هەمەلایەنە هەر بەتەنها مەسەلەی سنوور یا پێکەوەنانی جبەخانەیەکی گەورە نییە، نە مەشقپێکردنێکی قورسیشە، بەڵکو هەموو ئەوانەو بگرە زیاتریشی گەرەکەو پەیوەندی بەکاروباری تریشەوە هەیە، کەسروشتی ئابووری، کۆمەڵایەتی،.....هتدیان هەیە.

بەجۆرە کێشەیەکی کۆمەڵە کە قەوارەی کۆمەڵایەتی، بەهەموو لایەنە جیاجیاکانو پەیوەندیە جیاوازەکانیەوە، دەگرێتە خۆی.[4]

کەواتە ئەمن، بەو مانایە، ئەمنی دەوڵەتە بەو شتانەش کەتێدایەتی[5]و هەموو رواڵەتەکانی ژیانیش دادەپۆشێ. زۆربەی ئەو پێناسانەی بۆ چەمکی

---

[4] مقلد، د. اسماعيل صبري: العلاقات السياسية الدولية، جامعة الكويت، ١٩٧١، ص١٧.

وەرگیراوە لە: محمد ثامر كامل : دراسة في الامن الخارجي العراقي واستراتيجية تحقيقه، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٠ ص١٠٩

ئەمنی قەومی کراون، بەشێوەیەکی گشتی، لەدەوری سێ تەوەردا دەخولێنەوە، کەدەشێ بەم شێوەیە دیاری بکەین:

١- ئەمن، بەو پێیەی رزگاربوونە لەترس‌و نەمانی مەترسی.

٢- ئەمن، بەو پێەی کەپەرەپێدانە.

٣- ئەمن، بەو پێیەی پارێزگاری قەوارەی دەوڵەت‌و پاراستنی بەها بنچینەییەکانیەتی[٦].

١- ئەمن بەو پێیەی رزگاربوونە لە ترس‌و نەمانی مەترسی:

لەم بارەیەوە پرۆفیسورماننگ دەڵێ:" ئەمنی قەومی بریتیە لە رزگاربون لەنائەمنی، کەدەبێتە هەستکردن بەمەترسی، کە لەئەنجامی ئەوەوە هاتووە ئەو شتانەی تێدا دەژین بەو جۆرە رێك نەخراوە کەجێگیر بێ، کەواتە: بە گوێرەی ئەم چەمکە، ئەمن حاڵەتێکە لە ئارامی‌و نەمانی هۆکانی ترس‌و دڵەراوکێ، کاتێك دەوڵەت کردنی ئامانجە نەتەوەییەکانی جێ بە جێ دەکات". ماننگ بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستە باسی ئاستی دەرەکی دەکات، بەتایبەتی رۆڵی سیاسەتی دەرەوە، بێ ئەوەی ئاماژە بۆ ئاستی ناوەکی بکات، هەروەها بەلایەوە ئەمنی قەومی بریتی نیە لەهێز.

کاوفمانیش لای وایە کە زۆربەی باری سەرنجەکان دەربارەی ئەم چەمکە لەجەوهەردا، لەیەك شتی هاوبەشیدا یەك دەگرنەوە کە ئەویش درککردنیانە بەوەی کەئەمن دەلالەت لەهەر شتێ بکا، ئەوا بەشێوەیەکی گشتی، دەلالەت لە دەربازبوون لە ترس دەکات.

هەروەها ناییش دەڵێ: ئەمن، لەدەرئەنجامدا، جگە لەهەستکردن بەنەمانی هەرەشەو مەترسی، هیچی تر ناگەیەنێت.

لەکاتێکا پادلفۆرد و لینکۆلن لایان وایە ئەمن چەمکێکی رێژەیی هەیە، بەو مانایەی کە دەوڵەت لە حاڵەتێکی وادا بێ توانای جەنگینی هەبێ، بەرگری

---

[٥] هويدي، امين: البحر الاحمر والامن العربى، العوامل المؤثرة، مجلة المستقبل العربى، العدد١٢، بيروت، مركز دراسات الوحدة العربية، ١٩٨٠ ص١٠٩.
وەرگیراوە لە: هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٦.

[٦] محمد، ثامر كامل: دراسة في الامن الخارجى العراقي واستراتيجية تحقيقه، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٥ ص٢٧.

لەبوونی خۆی بکا دژی دەستدرێژی، واتە: توانایەکی ماددیو مرۆیی ئەوتۆی هەبێ کە گەلەکەی هەست بکا لەترس دەرباز بووە، بەشێوەیەکی واش شوێنی لەناو دەوڵەتاندا دابین بکاتو بەشداری لەبەدیهێنانی ئەمنی دەولیدا بکات. لێرەدا، ئەمانیش، تەنها ئاماژە بۆ ئاستی دەرەکی دەکەنو بایەخیش بە هێزی ماددیو مرۆیی دەدەن بۆ مسۆگەرکردنی حاڵەتێکی وا، کە ئەمنو ئاسایشی دەوڵەتەکە جێگیرو دابینکراو بێت.

بەمجۆرە دەشێ ئەمنی قەومی بەو دەلالەتە لێك بدرێتەوە، کەخۆپاراستنە لەو هەڕەشەو مەترسیانەی ڕووبەڕووی دەوڵەتێك یا نەتەوەیەك یا هەردوکیان دەبنەوە، بەجۆرێکی وا تەواوی ئەو ڕێو شوێنانەو ئامرازەکانی مسۆگەرکردنی حاڵەتێکی ئاوا، دابینکراوو لەئارادا بێت.

۲- ئەمن بەو پێیەی کە پەرەپێدانە:

ئەمنی ڕاستەقینەی هەر دەوڵەتێك لەناسینو زانینی سەرچاوەکانی هێزەکەی دایە، لەهەموو بوارە جیاجیاکانداو ئینجا پەرەپێدانو گەشەپێدانی ئەو هێزو توانایانە بەشێوەیەکی ڕاستەقینەی ئەوتۆ کەببنە بەرپەرچێکی ڕاستەقینە بۆ ئێستاو پاشەڕۆژی ئەو دەوڵەتە. هەر بۆیە مەکنەمارا دەڵێ: "هەر کۆمەڵێك بەقۆناغی گۆڕان بەرەو کۆمەڵێکی هاوچەرخدا تێدەپەڕێ، کەواتە ئەمن یانی پەرەپێدان، ئەمن بریتی نییە لە هێزی سوپایی، هەرچەندە دەشیگرێتەوە. بەڵکو ئەمن بریتیە لەپەرەپێدانو بە بێ پەرەپێدانیش ناشێ ئەمن بوونی هەبێ"[7].

ئەمن بەلای مەکنەماراوە بریتیە لەلانی کەمی بوونی سیستەم، ئەگەر پەرەپێدانێکی ناوخۆیی، یا لانی کەمی ئەو بەرەپێدانە نەبێ، ئەوا سیستەمو نیزام دامەزراوی دەبێتە کارێکی مەحاڵ. هەروەها بەلای مەکنەماراوە مەسەلەی سوپایی جگە لەرواڵەتێکی رووکەشی تەسکی ئەمنی قەومی، هیچی تر نییە، بەلای ئەوەوە، دەشێ هێزی سوپایی یارمەتیدەری جێگیرکردنی یاساو سیستەم بێت، بەڵام بێ بوونی بنکەیەکی پتەوی یاساو سیستەمەکە ناشێ ببێ. لێرەدا مەکنەمارا پێ لەسەر ئاستی ناوەکی دادەگرێ، کە مەسەلەی پەرەپێدانە.

---

[7] مکنمارا، روبرت: جوهر الامن، ترجمة یونس شاهین، سنة الطبع: بلا، القاهرة، ص۱۲۵.
وەرگیاوە لە: بغدادی، عبدالسلام ابراهیم: مفهوم الکیان الصهیونی للامن القومي، دار الحریة للطباعة، بغداد، ۱۹۸۵، ص۲۳.

هەروەها عەفاف بەزازیش دەڵێ: "دەوڵەت ناتوانێ ئـەمنی خـۆی بێنێتـە دی ئەگەر رادەیەکی دیاریکراو لەسیستەمو دامودەزگا لەناوخۆدا دابین نەکا، ئـەویش بەبێ بوونی رادەیەکی دیاریکراوی پەرەپێدان ناتوانێ بەردەوام بێ"[8].

دیارە پەیوەندیی نێوان ئەمنو پەرەپێـدان لـەوەوە هـاتووە کـە هـەردووکیان هەمەلایەنەنو هەردووکیشیان پەیوەندییان بەخودی مرۆڤەوە هەیە.

ئاشکرایە پەرەپێدان چەند بتوانێ رواڵەتەکانی دواکەوتوویی‌و پاشکەوتوویی چارەســەر بکــاو بەســەریانا زاڵ بێــت، بــەو ئەندازەیــە پێشــکەوتنی ئــابووری، کۆمەڵایەتی‌و سیاسی مسۆگەرتر دەبێ. واتە مەبەست لەپەرەپێدان پەرەپێدانێکی هەمەلایەنی بوارە جیاجیاکـانی ژیـانی کۆمەڵـە، لـەرووی: ئـابووری، سیاســی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، زانسـتی. کەواتــە دەشــێ ئــەمن بــەو دەلالەتــە لێـك بدرێتەوە، کە پەیوەندیی بەپەرەپێدانەوە هەیە. هەرچەندە پەرەپێــدان مــەرجێکی پێویستی بوونی ئەمنو ئاسایشە، بەڵام خودی خۆی بەس نیە بۆ رووبەڕووبوونەوەی مەترسیەکان، بۆیە بەدیهێنانی یەکێتی سیاسی‌و تەبایی کۆمەڵایــەتی کــارێکی پێویستو گونجاوە بەبێ ئەوانە ناتوانرێ مەترسیەکان دوور بخرێنەوە.

٣ـ ئەمن، بەو پێیەی پارێزگاری دەوڵەتو پاراستنی بەها بنچینەیەکانێتی:

ریچارد کوپەر لەپێناسەی چەمکی ئەمنی قەومیدا دەڵێ: ئــەمنی قــەومی بریتیە لەبەدیهێنانی پاراستنی بەهاکانو حکومەتیش دەورێکی دیاری هەیە لەم بوارەدا. لێرەدا کووپەر بایەخ بەهەردوو ئاستی دەرکی‌و نـاوەکی دەدا، بــەڵام بــەبێ ئەوەی دیاری بکا کە مەبەست لەو بەهایانە چییە؟

بەڵام وولفەر ئەم بەهایانە دەکاتە دوو جـۆر: بــەهای بنچــینەیی‌و پێویســتی پاراستنیانو بەها نابنچینەییەکان، واتــە: ئــەمنی قــەومی، بــەلای وولفــەرەوە، بریتیە لەپاراستنی ئەو بەها بنچینەییانە. هەروەها ئەمن بەلایەوە هاوتـای هێـز نییە، بەڵکو پاراستنی ئەو بەهایانەیــە، کــە پێشــتر وەرگــیراون. هــەروەك بــەها بنچینەییەکانیش بەلایەوە جێگیرو نــەگۆڕ نــین، بــەڵکو بەبــەردەوامی گۆڕانیــان بەسەردا دێت وەك: مانەوە، یەکێتیی ناوچەیی، سەربەخۆیی سیاســی‌و ئــابووری،

[8] ـ البزاز، عفاف محمد: الترابط بين الامن القومي العربي والمصالح القومية العربية، الندوة العلمية عن المضمون السياسي للحوار العربي ـ الاوروبي، القاهرة، ١٩٧٧، أعمال الندوة وبحوثها ١٩٧٨، ص٢٠١.

ئایدیۆلۆژیا. بەجۆرە وولڤەر لەوەدا لەکووپەر نزیك دەبێتەوە کە ئەمن بەلایەوە پاراستنی بەهاکانە، بەڵام جیاوازیی لەگەڵ کووپەردا ئەوەیەکە ئەو بەهایانە دیاری دەکا. هەروەها بۆ جێبەجێکردنیش بایەخ بەئامرازە دەرەکییەکان دەدا، وەك خۆ ئامادەکردنی سوپایی، جموجۆڵی دیپلۆماسی.

هەروەها بەلای مۆرگان ئەمنی قەومی تەنها پەیوەندی بەبەرژەوەندییە زیندووەکانەوە هەیە. چونکە بەرژەوەندییەکان، بەلای ئەوەوە، دوو جۆرن: بنچینەییەکان (زیندووەکان)و نابنچینەییەکان.

لەکاتێکا ئەمنی قەومی بەلای فیڤیزۆنو تایلەرەوە هەموو ئەو ئەرکو ڕەنجەیە، کە دەوڵەت لە پێناوی پارێزگاریو پاراستنی باری جێگیر بوونی بەرژەوەندیە ئەمنیەکانیدا دەیکێشیّ، کە بەلایانەوە بریتیە لە خۆپاراستن لە مەترسیەکانی هاوسێکانو ئەو دەوڵەتانەی دەکەونە ئەو ناوچەیەی کە ئەم دەوڵەتەی تێدایە، کەدەیانەویّ لەسەر حیسابی ولاتانیتر سنووریان فراوان بکەن. بەم جۆرە ئەمانیش بایەخ بەلایەنی دەرەکی دەدەنو ئاماژە بۆ ئاستی ناوەکی ناکەن، لەهەمان کاتیشدا ئەو ئامرازانە دیاری ناکا، کە بۆبەدیهێنانی ئەو ئەرکە پێویستن.

هەروەها ئینسکلۆپیدیای کۆمەلایەتیش لەپێناسەکەی خۆیدا دەڵیّ: ئەمنی قەومی بریتیە لەتوانای دەوڵەت بۆ پاراستنی بەهاکانی ناوەوە لەمەترسیەکانی دەرەوە. ئەویش بەهەمان شێوە بایەخ بەئاستی دەرەکی دەدات.

هارتمانیش لەپێناسەکەی خۆیدا دەڵیّ: ئەمنی قەومی بریتیە لەپاراستنی ئەوەی پیّ دەوتریّ بەرژەوەندیە زیندووەکانو بەمانای بەرگریکردن بەکار دیّ لەو بارانەدا کەدەوڵەت خۆی تێدا ئامادە دەکات، بەهۆی بەکارهێنانی هێزەوە، بەرگری لەبەرژەوەندیەکانی خۆی بکات دژی دەستێوەردان.

د. عەلییوەددین هلالیش بەجۆرە پێناسەی ئەمنی قەومی دەکا کە: دڵنیاکردنی قەوارەی دەوڵەتە دژی ئەو مەترسیانەی لە ناوەوەو لەدەرەوە هەڕەشەی لیّ دەکەن، هەروەها، دابینکردنی بەرژەوەندیەکانو سازکردنی بارودۆخێکی گونجاوو لەباریشە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوایەتیەکانی، واتە ئەمن هەر بریتی نیە لەئارەزووی ئەو دەوڵەتە بۆمانەوە، بەڵکو ئارەزوشیەتی کە بەبیّ مەترسیی هەڕەشە دەرەوە لەسەر بەرژەوەندیە زیندووەکانی بژی. یانی ئەمنی قەومی، بەلایەوە، بریتیە لە:

*پاراستنی یەکێتی ناوچەیی دەوڵەتەکە.
*پارێزگاری رژێمە سیاسیەکەی.
*بەدیهێنانی ئامانجو بەهاکانی گەلو پاراستنی یەکێتیەکەی.

کەواتە، پادڵفۆردو لینکۆڵن گوتەنی: چەمکی ئەمنی قەومی هەر پەیوەندی بە پاراستنی ئێستاوە نیە، بەڵکو پەیوەندیشی بە دابینکردنی دواڕۆژەوە هەیە.

ئەم پێناسانەی سەرەوە، هەرچەندە لەباری سەرنجی جیاجیاوە وتراون، دەشێ رێگامان بۆخۆش بکەن، پێناسەیەکی هەمەلایی ئەم چەمکە بکەین، بەجۆرێ دەربڕی ناوەرۆکی چەمکەکەو ئامانجەکانیو ئامرازەکانی بەدیهێنانی بێت.

ئەمنی قەومی، وەك چەمکێکی هەمەلایی، بریتیە لەو رێو شوێنانەی دەوڵەتێك بۆ بەرپەرچی مەترسیەکانی دەرەوە (ئابووری، سیاسی، سوپایی.....)و نەهێشتنی یا پاکۆدانی مەترسیەکانی ناوەوە (چ ئەوانەی هەن یا ئەوانەی لەداهاتوودا پەیدا دەبەن) دەیگرێتە بەر لەپێناوی پاراستنی بەها بنچینەییەکانیدا کەبریتیە لە: یەکێتی خاکەکەی، سەربەخۆیی، ئایدیۆلۆجیای دەوڵەت یا نەتەوەکە یا هەردووکیان پێکەوە. ئەم رێوشوێنانەش بەگوێرەی سروشتی چینایەتی رژێمەکەو فەلسەفەی تایبەتی حوکمڕانیو بنەما جیۆستراتیجیەکانی دەوڵەتەکە دەگۆڕێنو گەلێ لایەنیش دەگرێتەوە کەلەپێش هەموویاندا بینای ئایدیۆلۆجی دەوڵەت یا نەتەوە، لەگەڵ پێداگرتن لەسەر پەرەپێدانی سیاسیو بنیاتنانی هێزێکی سوپایی گونجاودا.

## ١-١-٢: بنەما جیۆستراتیجیەکانی ئەمنی قەومی

بنەما جیۆستراتیجیەکان ئەو پایانەن کە سیاسەتی ئەمنی قەومیان لەسەر بنیات دەنرێ. دیارە بەهێزیو لاوازی بنەما جیۆستراتیجیەکان لەبەهێزیو لاوازی دەوڵەت دا ڕەنگ دەدەنەوە، دەوڵەتیش تا چ ئەندازەیەك بەهێز بێ بەو ئەندازەیەش نەتەوەکەی هەست بەدڵنیاییو ئەمن دەکا. ئەم بنەمایانە بەکارلێککردن لەگەڵ یەکتروچەند فاکتەرێکی تریشدا هێزو تواناو گوڕو تەوژم دەدەن بە دەوڵەتەکە. دەشێ بنەما جیۆستراتیجیەکان، بەم شێوەیەی خوارەوە، بۆ توخمە پێکهێنەرەکانی شی بکەینەوە:

### ١-توخمە جیۆپۆلەتیکیەکان:

ئەو توخمانەن کە لە پێکهێنانی هەر دەوڵەتێکدا دەوری کاریگەرو بەرچاو دەگێڕن، هەر وەك لە ڕەنگڕشتنی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتاندا نەخشی دیاریان هەیە. تەنانەت زاناکانی جیۆپۆلەتیك لەو بڕوایەدان کە: سروشتی جوگرافیایی هەر دەوڵەتێك یەکەم پایەی هێزە نەتەوەییەکەی پێکدەهێنێ[٩]. بەڵکو هەندێکیان زیاتریش دەڕۆن کاتێ دەڵێن: بارودۆخە جوگرافییەکان سیاسەتەکانی دەوڵەت دیاری دەکەن[١٠]. لەبەر ئەوەی توخمە جیۆپۆلەتیکییەکان پەیوەندیی راستەوخۆو ناڕاستەخۆیان بەسیاسەتی: ئابووری، سیاسی، سوپایی دەوڵەتەوە هەیە. بۆیە بایەخی جیۆپۆلەتیك فرەلایەنەیەو کاریگەرییەکەشی لەم فاکتەرانی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

١ـ قەبارەو رووبەر:

پەیوەندییەکی دیالێکتێکی لەنێوان گەورەیی قەبارەو فراوانی رووبەر لەلایەك و بەهێزی دەوڵەت لەلایەکی ترەوە هەیە، چونکە:

* فراوانی رووبەر دەبێتە هۆی زیادبوونی سامانی سروشتی سەرزەمینی و ژێرزەمینی.

* فراوانی رووبەر دەبێتە هۆی بوونی ئاوو هەوای جیاجیا، واتە: دەبێتە هۆی بوونی کشتوکاڵی جیاجیا، کە یەکێکە لەتوخمەکانی ئەمنی بێژوو ئەمنی ئابووری. ئەو دەوڵەتەی کە ئاوو هەوای فرەجۆری تێدایە، دەتوانێ بەشی پێداویستییەکانی خۆی لەبەروبومی کشتوکاڵی و بەرهەمی ئاژەڵداری دابین بکات و پێویستی بەوڵاتانی تر نەبێت. بەجۆرە دەتوانێ پایەکانی ئەمنی ئابووری خۆی بەهێز بکات.

*فراوانی رووبەر، لەرووی سووپاییەوە، قوڵایی ستراتیجی بۆ هێزەکانی دەوڵەت پێکدێنێ، چونکە ئەو دەوڵەتە دەتوانێ، سەرەتای راکێشانی هێزەکانی دوژمن بەرەو قوڵایی خاکی خۆی بگرێتە بەرو بەسەر رووبەرێکی بەرفراواندا پەرش و

---

[٩] سمقلد، د. اسماعيل صبري: المقالات السياسية الدولية، جامعة الكويت،١٩٧١، ص١٢١.

[١٠] السماح، د. علي: الجيوبولتكس، محاضرات بالرونيو، مكتب المستنصرية، ١٩٧٧ ص١١.
وەرگیراوە لە: محمد، ئامر کامل: سەرچاوەیەکی پێشووتر، ل٣٩.

بلاویان بکاتەوە، ئینجا لەقولاییدا بەرگری بکاتو هێزەکانی دوژمن تێک بشکێنێ.
*فراوانی رووبەر یارمەتی دەوڵەت دەدا کە دامەزراوە ئابووریەکانی بەسەر ناوچە جیاجیاکاندا بلاوبکاتەوەو لەشوێنێکدا کۆیان نەکاتەوە، کە بە ئاسانی لەلایەن دەوڵەتە هاوسێکانەوە تێکوپێك بدرێن.
*هەروەها فراوانی رووبەر یارمەتی دەوڵەت دەدا کەپایتەختەکەی بباتە ناوەراستی وڵاتەکەو لەشوێنێکی وادا دروستی بکا کە پارێزراو بێت.
دیارە هەموو کاتێك بەرفراوانی رووبەر نیشانەی بەهێزی دەوڵەت نیە. چونکە رەنگە هەندێ دەوڵەت رووبەرێکی بەرفراوانیشیان هەبێ بەلام لەناوچەیەکی بیابانیدا بێو کەم ئاو بێو بەکەڵکی کشتوکاڵیش نەیەت. هەروەها دەشێ ئەو وڵاتە کەمی دانیشتوانی هەبێو ئەوسا چرِیەکی کەمی دانیشتوان لەچاو بەرفراوانی رووبەردا دەبێتە خاڵێکی لاوازی ستراتیجی دەوڵەتەکە، چونکە دەشێ بەئاسانی لە لایەن هێزەکانی دوژمنەوە ببڕدرێت بەبێ ئەوەی لەمپەرێکی مرۆیی لەبەردەمدا بێ.

٢-شوێن:
شوێن بەیەکێك لەگرنگترین بنەما جیۆپۆلەتیکییەکان دەژمێردرێت کەبەهێزیو لاوازی دەوڵەتی لەسەر هەڵدەسەنگێنرێت چونکە بایەخێکی کاریگەری لەسەر ئێستاو پاشەرۆژی دەوڵەتان هەیە. شوێنی دەوڵەتەکە چەند باشو خاسیەتی ئیجابی دەوڵەتەکە، لەهەموو روویەکەوە، زیاد دەکات. بۆ ئەوەی زیاتر لەبایەخی ستراتیجی شوێن بگەین، دەبێ لەچەند لایەکەوە سەیری بکەین:
-شوێنی فەلەکی دەوڵەتەکە: شوێنی فەلەکی هەر دەوڵەتێك بە گوێرەی هێڵەکانی پانیو درێژی زەوی دیاری دەکرێ، چونکە گۆی زەوی بەگوێرەی ئەم هێڵانە، بە پانایيو بەدرێژایی، دابەش کراوەو کراوەتە چەندین ناوچەی جیاجیا. ئەگەر شوێنی دەوڵەتەکە ژمارەیەکی زۆری لەهێڵەکانی پانی زەوی پێدا رۆیشت، ئەوا ئەو دەوڵەتە شوێنی جیاجیای دەبێ، کە دەبێتە هۆی بوونی ئاوو هەوای جۆراوجۆر، واتە زەمینەی کشتو کاڵی فرەچەشنەی دەبێ، هەر وەك سامانی ئاژەڵی جیاجیای دەبێ، کە دەبێتە هۆی بوونی ئاوو هەوای جۆراوجۆر، واتە زەمینەی کشتوکاڵی فرەچەشنەی دەبێ، هەروەك سامانی ئاژەڵی جیاجیاو

گژوگیای زەبەندیشی دەبێ، واتە ئەو وڵاتەدەتوانێ کشتوکاڵێکی تەواو بکاتە بناغەی سیاسەتی ئابووری خۆی‌و ناوچە جیاجیاکانی تەواوکەری یەکتری بن، کە ئەمەش بایەخێکی ئابووری زۆری هەیە. هەروەها ئەو دەوڵەتەی ژمارەیەکی زۆری لە هێڵەکانی درێژی پێدا دەڕوا، لەدوو سەرەوە سودی لێ دەبینێ، یەکێکیان: دەبێتە هۆی زیاد بوونی ژمارەی کاتەکانی ڕۆژهەڵهاتن کەیارمەتی چاندنی جۆرێك لەکشتوکاڵ دەدا کە چەند جارێك لەساڵدا بکرێت، کە ئەمەش بایەخی ئابووری خۆی هەیە، دووەمیشیان: زۆربوونی هێڵەکانی درێژی دەلالەت لەگەورەیی‌و بەرفراوانی دەوڵەتەکەو درێژبوونەوەی دەکا.

-شوێنی جوگرافی: بایەخی هەر دەوڵەتێك لەشوێنە جوگرافیەکەیدا دەردەکەوێ. بەگوێرەی دووری‌و نزیکی لەئاوەوە، دەوڵەتانی دنیا دەکرێنە دوو بەش: ئەو دەوڵەتانەی لەسەر دەریان، واتە دەوڵەتە دەریایەکان، کە چەندین خاسیەتی باشیان هەیە:

*ڕێگای ئازادیان هەیە بۆپەیوەندیکردن لەگەڵ دنیای دەرەوەدا.

*دەتوانن هێزێکی دەریایی وا پێکەوە بنێن، کە پارێزگاری دەوڵەتەکەیان بکات.

*بۆ بازرگانی دەرەوە سودی باشتر وەردەگرن، چونکە گواستنەوەی دەریایی هەرزانترین جۆری گواستنەوەی کەل‌وپەل‌و کالایە. هەروەها سود لەبەندەرەکانیش وەردەگرن.

*هەروەها دەریاش، وەکوو زەوی، سامانی فرەجۆرو فرە چەشنی هەیە: وەك ماسی، مرواری، کانزای جیاجیا، نەوت.... کە دەشێ لەبەهێزکردنی دەوڵەتدا ڕۆڵ بگێڕن.

*جگەلەوە دەریا بۆ خۆی سنوورێکی جیاکەرەوەیەو ئەو دەوڵەتانەی سنووریان بەسەر دەریاوەیە، ئاسانتر دەتوانن پارێزگاری لەو سنوورە بکەن‌و دڵنیاتریشن لەبڕینی ئەو سنوورە لەلایەن وڵاتانی ترەوە.

بەڵام دەوڵەتە دەریایەکان لەگەڵ یەکتریشدا جیاوازیان هەیە. دەوڵەتی ئەوتۆ هەیە دوورگەیە، یان نیوە دوورگەیە یان کەناری دەریای درێژی هەیە کەچی دەوڵەتی ئەوتۆش هەیە تاقە دەروازەیەکی ئاوی یا دەریایی هەیە.

ئەو دەوڵەتانەی دەروازەی دەرییاییان نیە، بە دەوڵەتی کیشوەری دەناسرێن، کە ئەمەش یەکێکە لەخاڵە لاوازە ستراتیجیەکانی ئەو دەوڵەتانە، چونکە بە ئاسانی دەتوانرێ لەلایەن دوڵەتە هاوسێکانیەوە گەمارۆی ئابووری بدرێن. هەروەك

ناشتوانێ هێزێکی دەریایی بۆ خۆی پێکەوە بنێ، هەر بۆیە ناچار دەبێت لەگەڵ دەوڵەتە هاوسێکانی پەیمانی ئابووری، سیاسی، بازرگانی ببەستێت یا بە شەڕ دەروازەیەکی دەریایی بۆ خۆی بکاتەوە. هەموو دەوڵەتانی دنیا هەوڵ دەدەن بە هەر شێوەیەك بێ، دەروازەیەکی دەریایی بۆخۆیان پەیدا بکەن، ئەگەر لەڕێگەی بەکارهێنانی زەبروزەنگیشەوە بێت.

هەروەها ئەو دەوڵەتانەی هێڵی ترانزێتیان پێدا دەڕوات، بایەخێکی زۆریان هەیەو ئەو دەوڵەتانە ئەگەر بێتو هێزێکی وایان هەبێت پارێزگاری ئەو هێڵانە بکەنو نەهێڵن دەوڵەتانی تر بە بێ ئاگاداری ئەوان سوودی لێ ببینن یا بە کاری بێنن، ئەوا دەرامەتێکی باش بۆ وڵاتەکە پەیدا دەکەن.

-شوێنی پایتەخت: شوێنی پایتەختیش کاریگەری لەسەر دەوڵەت هەیە، چونکە ئەگەر پایتەختەکە لەشوێنێکی وادا بێ دەوڵەتە هاوسێکانی بە ئاسانی بتوانن داگیری بکەن، ئەوا کارێکی خراپ بەسەر دەوڵەتەکەوە بەجێ دێڵێ. بۆیە دەوڵەتانی دنیا هەمیشە پایتەختەکانیان دەبەنە قووڵایی وڵاتەکەی خۆیان یا لەشوێنێکی لاچەپەك دایدەنێن، تا قووڵایی ستراتیجی بۆ پەیدا ببێو لەلایەکی تریشەوە بتوانێ بەباشترین شێوە کاروباری سیاسی-ئیداری دەوڵەتەکەش بەڕێوەبەرێت.

-شوێنی دەوڵەتەکە بەنیسبەت دووریو نزیکی لەزلهێزەکانەوە: ئەم فاکتەرەش لەدیاریکردنی بایەخی شوێنی هەر دەوڵەتێکدا رۆڵی خۆی هەیە، بە تایبەتی کە دروست کردنی هەندێ دەوڵەت قەرزداری دووری یا نزیکیانە لەزلهێزەکانەوە، بەتایبەتی کاتێ بیانەوێ ناوچەیەك بکەنە لەمپەر یا تامپۆن لەنێوان نفوزی دوو دەوڵەت یا زیاتردا. هەروەها ئەم فاکتەرە هۆیەکیش بووە بۆ ئەوەی هەندێ نەتەوە نەتوانن دەوڵەت پێکەوە بنێن، چونکە پەیوەندی بە نفوزو ئەمنی قەومی ئەو دەوڵەتە زلهێزانەوە بووە.

هەرچەندە شوێن یەکێکە لەتوخمە بەهێزەکانی دەوڵەت، ئەگەر شوێنێکی باشی هەبێ، بەڵام لەهەمان کاتیشا دەبێتە جێ سەرنجو چاوتێبڕینی دەوڵەتانی تر بۆ دەستگرتن بەسەر شوێنە ستراتیجیو گرنگەکانی ئەو دەوڵەتەدا، بۆیە ئەگەر دەوڵەتەکە هێزێکی تەواوی نەبێ، ئەوا دەشێ بەئاسانی لەلایەن وڵاتانی ترەوە داگیر بکرێو ناشهێڵن لەکۆمەڵی دوەلیدا وەکو پێویست رۆڵی خۆی بگێڕێ.

### ٣-بیچمی دەوڵەتەکە

دەوڵەتانی دنیا بەگوێرەی بیچمو شێوەیان، دەکرێنە چەند جۆر، وەك: خڕ، چوارگۆشەیی، سێ گۆشەیی، درێژکۆڵەیی، نارێكو پێك، پانو بەرین، گچکە.

بیچمی خڕ یا چوارگۆشەیی بە باشترین شێوە دەژمێردرێت، چونکە لەهەموو لایەکەوە قوڵایی ستراتیجی بۆ دەوڵەتەکەو پایتەختەکەی پێکدێنێ، دەتوانێ پایتەخت بەرێتە ناوەڕاستی دەوڵەتەکە، بە ئاسانتر کاروباری ئیداری دەوڵەت لەوێرا بەڕێوە بەرێتو ڕێگاوبانیش بۆ گشت شارو پارێزگاو شوێنە گرنگەکانی رابکێشێت.

بەڵام ئەو دەوڵەتانەی کەدرێژکۆڵەو باریکنو قوڵایی ستراتیجیان نیە، دەکرێ بە ئاسانی لەلایەن هێزەکانی دوژمنەوە پارچەپارچە بکرێنو ببڕدرێن، بەمجۆرە لاوازیەکی ستراتیجی بۆ دەوڵەتەکە دروست دەکات. ئەو دەوڵەتانەش کە بیچمی نارێكو پێکیان هەیە، لە گەڵێ ڕووەوە پەسەند نین، بە تایبەتی لە ڕووی سوپاییەوە. هەروەك دەوڵەتانی دنیا بە گوێرەی یەك پارچەیی یا چەند پارچەیی دەکرێنە چەند جۆرێك: هەندێ دەوڵەت هەموو خاکەکەی بە یەکەوە بەستراوەتەوەو یەك پارچەیە، بەمجۆرە خاڵێکی بەهێزی ستراتیجی بۆ دەوڵەتەکە پێك دێنێ، بەڵام هەندێ دەوڵەت دوو پارچە یا فرەپارچەن، کە ئەویش خاڵێکی لاوازی ستراتیجی بۆ دەوڵەتەکە دروست دەکا، کە دەکرێ پارچەیەك یا چەند پارچەیەك لەو دەوڵەتە دابڕێتو لە لایەن هێزی ترەوە داگیر بکرێ، چونکە پەرشو بڵاوبوونی پارچەکانی خاکی دەوڵەتێك (بە تایبەتی دەوڵەتە دوورگەییەکان) پێویست بەو، دەکا هێزەکانی دەوڵەتەکە بە سەر هەموو پارچەکانیدا دابەش بکرێت، بەمەش هێزە سوپایەکەی پارچەپارچەو بێ هێز دەبێ.

### ٤-سنوور:

سنوور، بەمانا سیاسیەکەی، دیاردەیەکی مرۆیی دەستکردە. سنووریش بایەخێکی زۆری هەیە بەنیسبەت دەوڵەتانەوە، چ لەڕووی قایمیو ناقایمی سنورەکەی، چ لەڕووی هەڵوێستی لەمەڕ دەوڵەتە هاوسێکانی.

*ئەو سنورانەی کە کێشەو گێروگرفتیان لەسەرە، هەمیشە بوونەتە مایەی هەلگیرساندنی جەنگو شەڕوشۆڕ لە نێوان دەوڵەتە پەیوەندیدارەکانو بەو پێیە زەمینەیەکی نائارامی لەتەواوی ناوچەکەدا سازکردووە.

*ئەو دەوڵەتانەی سنووریان بەسەر دەریاوەیە، لەو لایەوە، باشتر پارێزگاری لێ دەکرێو کەمتر دەبڕدرێ.

*ئەو دەوڵەتانەی سنوورێکی کراوەیان هەیە (بەو مانایەی بەربەست یا لەمپەرێکی سروشتی قایم بۆ پاراستنی دەوڵەتەکە نەبێ) زیاتر هێرشو پەلاماری دەوڵەتانی دەوروبەریان لەسەر هەیە وەك لەو دەوڵەتانەی سنوورێکی سرووشتی قایمیان هەیە.

* ئەو دەوڵەتانەی هاوسێی دەوڵەتێك، یا چەند دەوڵەتێکی لەخۆیان بەهێزترن هەمیشە مەترسی هێرشو پەلاماری ئەو دەوڵەتانەیان لەسەرە، بۆیە هەوڵ دەدەن لەرێگەی رێککەوتنو سازدانو پەیمانبەستن لەگەڵیاندا دۆستایەتی خۆیان لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەدا قایمو باشتر بکەن.

دەشێ سنوور لە ڕووی سروشتی-مرۆیی بەڕەچاوکردنی توخمە ئیتنۆگرافیەکان دیاری بکرێ، وەك: رەگەز، نەتەوە، ئایین، مەزهەب یا زمان، واتە: ئەم توخمانە بکرێنە پیوانگو بنچینەی جیاکردنەوەی کۆمەڵە مرۆییەکانو دامەزراندنی دەوڵەت.

هەر وەك دەشێ سنوور لەڕووی سروشتی ـ جوگرافییەوە دیاری بکرێ وەك وشکایی، زنجیرە چیا، دەشتایی، جەنگەڵ، بیابان، سنووری ئەندازەیی بەپێی هێڵەکانی درێژیو پانیی زەوی یان ئاوی بێ وەك: روبارو چۆم، دەریاچە، زەلکاو، دەریا. واتە ئەم توخمانە بکرێنە بنچینەی دامەزراندنی دەوڵەتو جیاکردنەوەی کۆمەڵە مرۆییەکان بەگوێرەی ناوچە جیاجیاکان.

بەڵام چونکە راستییە مێژوییەکان هەمیشە لەگەڵ رووداوەکاندا یەکانگیر نەبوون، بۆیە زۆربەی سنوورەکانی ئێستای نێوان دەوڵەتان سنووری دەستکردن، واتە: سنووری سیاسیی نێوان دەوڵەتان بەگوێرەی چەندین فاکتەری سیاسی، ئابووری، جیۆپۆلەتیکی دیاری کراونو هێزیش دەوری سەرەکیی تیا بینیوە.

هەروەها سنووری دەوڵەت دەشێ بەنیسبەت هەر دەوڵەتێکەوە قۆقز، رووچاڵ یا راستەکی بێ. ئەو سنوورانە پەسەندن کە بەنسبەت دەوڵەتەکەوە رووچاڵن،

چونکه قـولایی جـوگرافیو سـتراتیجی بـۆ دەوڵەتەکـە زیـاد دەکـەنو دەرفـەتی پاراستنیشی زیاترە، هەروەها سنووری راستەکیش هەر پەسەندە.

بەشێوەیەکی گشتی توخمە جیۆپۆلەتیکییەکان، بەنسبەت هەر دەوڵەتێکەوە، رۆڵی کاریگەریان هەیەو بەهێزیو لاوازییان، راستەوخۆ یا نـا راسـتەوخۆ، کـار دەکاتە سەر بەهێزیو لاوازیی دەوڵەتەکەو رەنگی تیا دەداتەوە.

ب ـ سامانی سروشتی:

سـامانی سروشـتیی هـەر دەوڵـەتێك پەیوەنـدیی راسـتەوخۆی بـەهێزی دەوڵەتەکەو ئەمنی قەومییەوە هەیە، بۆیە باسی ئەمنی قەومی هەر یەکەیەکی سیاسی، بێ تەماشاکردنی ئەو بنکە ئابوورییەی لەسەری وەستاوەو هێـزو گـوڕو چالاکیو بەردەوامی لێ وەردەگـرێ، کـارێکی نەشـیاوە. لەسـۆنگەی ئـەوەی کـە سـامانە سروشـتییەکان ئامـەرازێکی هێـزی سیاسـینو پەیوەنـدییان بـەهێزی سوپاییەوە هەیـە، ئـەو دەوڵەتانـەی خـاوەن سـامانێکی سروشـتیی زۆرن، بـاری ئابوورییان بەهێزترە کە ئەوەیش کار لەهێزە نەتەوەییەکی دەکات، کە پەیوەندیی بەئەمنی قەومییەوە هەیە. ئەو دەوڵەتانەی، وەکو پێویست، سامانی سروشـتییان نییە، ناتوانن بنکەیەکی ئابووری بەهێز دابنێن، واتە: هەمیشە ئـەمنی قـەومی ئەو دەوڵەتانە لەمەترسیدا دەبێ.

هەروەك ئەو دەوڵەتانە بەرهەمو بەروبومیان بەشی پێداویستییەکانی خۆیـان دەکات، باریان زۆر باشترە لەو کەبەشـی پەیداویسـتیەکانی ژیـانی دانیشـتوانی دەوڵەتەکـەیان بەرهـەمو بـەروبومیان نییـە، یـا جۆرێـك لـەجۆرەکانی ئـەو بەرهەمانەیان نییە، چونکە نە لەکاتی شەڕو نە لەکاتی ئاشـتیدا ناکەونـە بـەر پاڵەستۆو گوشاری وڵاتانی تر، بەمجۆرە دەتوانن لەلایەکەوە سەربەخۆیی ئـابووریی خۆیان بپارێزن، لەلایەکی تریشەوە هەڵوێستی سیاسیی سەربەخۆو خاوەن بڕیاری سیاسی سەربەخۆ بن.

ـ سامانی سروشتی لەگەڵ بناوانەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ:

ـ سامانی سروشتیی سەر زەمین: کە پەیوەندیی بەجۆری کشتوکاڵو بەپیتیو بێ پیتی زەویوجۆری ئاوو هەواوە هەیە. هەروەها رادەی سوود وەرگرتن لـەزەویو لایەنی بەرهەمدارییەکەی.

ـ سامانی سروشتی ژێرزەمین: کە بریتییە لەکانزای جیاجیـا، لـەمیتاڵو نـا میتاڵ، کە لەژێر زەویی دەوڵەتەکەدا هەیە، زۆرو زەبەنـدی ئـەو کانزایانـە کـار لەباری ئابووری دەوڵەتەکە دەکاتو دەشێ لەرووی پەرەپێـدانی ژیـانی سیاسـی، ئابووری، کۆمەڵایەتیدا رۆڵی گرنگو بەرچاو بگێڕێ. هەر وەك بوونی نەوت، کـە سەرچاوەیەکی وزەیە، بۆتە فاکتەرێکی گرنگ بۆ بـەهێزکرنی پایـەکانی ئـەمنی قەومی دەوڵەتە نەوتدارەکان.

ـ ئاو: ئاویش بەیەکێك لەسامانە سروشـتییەکان دەژمێردرێـت، بەتایبـەتی چونکە پەیوەندیی بەکشتوکاڵ پەیداکردنی وزەی کارو ئاوییەوە هەیە.

بەڵام بەنسبەت هەر وڵاتێکەوە ئەوە گرنگ نییە کـە چـەند سـامانی هەیـە، بەڵکو لەوەشدایە کە بەئەندازەی ئەو سـامانە مرۆڤـی هـەبێ بـۆ وەبـەرهێنانو سوودوەرگرتن لەو سامانە. هەروەها باش کارپێکردنی بەشێوەیەکی ئەوتۆ ببێتـە مایەی بەهێزکردنی ئابووری دەوڵەتەکەو بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی دانیشتوان.

ئەو دەوڵەتانەی کە خاوەن سەروەتو سامانی زۆرن، بەتایبەتی ئەوانەی نەوت یا کانزای ستراتیجیان هەیە، هەمیشە جێی سەرەنجو چاوتێبڕینی دەوڵـەتانی تـر بون. بۆیە ئەگەر دەوڵەتەکە هێزێکی تەواوی نەبوبێ، ئەوا تووشی گـێرو گرفـتو پـەلاماردانی ئـەم لاو ئـەولا بـووە. دیـارە ئـەو دەوڵەتانـەی کـە دەوڵەمەنـدن، لەلایەکـەوە دەتـوانن هێزێکـی سـوپایی گـەورە پێکـەوە بنـێن بـۆ پاراسـتنی دەوڵەتەکەیان، لەلایەکی تریشەوە توانای مانۆڕی سیاسیو ئابووری بـەرفراوانیان دەبێ، بەپێچەوانەی ئەو دەوڵەتانەی کە هەژارنو ئەو توانایەیان نییە.

ج ـ سامانی مرۆیی:

دانیشتوانی هـەر دەوڵـەتێك، سـامانی مرۆیـی ئـەو دەوڵەتەیـە، هـەر وەك یەکێکیشە لەتوخمە پێکهێنەرەکانی، چونکە ناشێ باسی دەوڵەتی بێ دانیشتوان بکرێ. بایەخی فاکتەری مرۆیی لەبەهێبوونی دەوڵەتدا هیچـی لەفاکتەرەکانـەی تر کەمتر نییە، زۆربەی کاتیش بەهێزیو گـەورەیی دەوڵـەتێك بـەزۆری ژمـارەی دانیشتوانی ئەو دەوڵەتە پێوانە دەکرێ، چونکە:

* زۆری ژمارەی دانیشتوانی هەر دەوڵـەتێك پەیوەنـدی بەبـەهێزبونی بـاری سوپایی ئەو دەوڵەتەوە هەیە، چونکە هێزی مرۆیی شـادەماری هێـزی سـوپاییو پێکهێنەرە بنچینەییەکەیەتی، بەتایبەتی لەسـەردەمی ئێسـتادا، کـە جـەنگی

نێوان دەوڵەتان پێویستی بەژمارەیەکی زۆری هێزی مرۆیی هەیە تا بەگەڕویا بکرێ.

جا ئەو دەوڵەتانەی کە خاوەن هێزێکی مرۆیی زۆرن، دەتوانن هێزێکی سوپایی گەورە پێکەوە بنێن، بەجۆرە پاراستنی دەوڵەتەکەی خۆیان مسۆگەرتر دەکەن. یا لەجەنگدا بارەکە بەلای خۆیاندا دەشکێننەوە، بەپێچەوانەی دەوڵەتانی کەم دانیشتوان کە بەئاسانی، یا راستتر: ئاسانتر دەکرێ بشکێنرێن.

* هەروەها هێزی مرۆیی زۆر، چ لەکاتی شەڕو چ لەکاتی ئاشتیدا، بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئابووریو دامو دەزگاکانی دەوڵەت گرنگو پێویستە، چونکە بەبێ بوونی مرۆڤ ناشێ ماشێنی ئابووریو سیاسی دەوڵەت بەباشی بگەڕێت.
* هەر وەك بوونی سەروەتو سامانی سروشتی زۆرو باش بەکارهێنانیو سوودوەرگرتن لێیو بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی خەڵك فاکتەرێکی گرنگ دەبێ لەبەگەڕخستنی دانیشتوانو باش بەکارهێنانیان.
* جگە لەوەی زۆری دانیشتوان دڵنیایی لای ئەندامانی ئەو نەتەوەیە یا دەوڵەتەکە پەیدا دەکاو ترسیش دەخاتە دڵی دەوڵەتە هاوسێکانیەوە.

بەڵام سامانی مرۆیی هەر لەرووی چەندایەتییەوە لێك نادرێتەوە، بەڵکو لەرووی چۆنایەتیو پێکهاتنی ئیتنۆگرافیو دابەشبوونی دیمۆگرافیشەوە سەیری دەکرێ. ئەو دەوڵەتانەی گەلەکانیان لەرووی ئاستی هۆشیاریو سیاسیو فەرهەنگییەوە پێشکەوتوترە، ئەوا باریان باشترە لەگەڵ دواکەوتووەکان، چونکە باشتر دەتوانن لەبواری زانستی، ئابووری، سیاسی دەوڵەتدا بەشدار بکەن. هەروەها ئەو دەوڵەتانەی لەرووی پێکهاتنی ئیتنۆگرافییەوە هۆمۆجینییە، ریزەکانی قایم ترە لەو دەوڵەتانەی گەلەکەیان لەچەندین نەتەوەو ئایینو مەزهەبی جیا جیا پێکهاتووە، هەرچەندە ئەم فاکتەری ناتەباییە دەشێ لەرێگەی دابینکردنی مافی ئەو نەتەوەو کەمینە ئایینیو مەزهەبیانەوە لەفاکتەرێکی لاوازەوە بکرێتە فاکتەرێکی بەهێز. هەروەها لەرووی دیمۆگرافیشەوە کە پەیوەندی بەجۆری دابەشبوونی دانیشتوانو رێژەی تەمەنەکانو نێرو مێوە هەیە، دەکرێ خاڵە لاوازەکان بکرێنە خاڵی بەهێزی ئەو دەوڵەتە.

سامانی مرۆیی وەك چۆن فاکتەرێکی بەهێزە بۆ دەوڵەت، لەهەمان کاتدا فاکتەرێکی لاوازی دەوڵەتیشە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو دەوڵەتە هەژار بێتو

سامانی سروشتی کەمی هەبێت کە بەشی دانیشتوانەکەی نەکات، یا تەبایی کۆمەڵایەتی تێدا نەبێت و هەمیشە گیرو گرفتی هەبێ، یا گەلێکی دواکەوتوو بێ و نەتوانن باری ئابوری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی دەوڵەتەکە بەرەو پێش بەرن. جا هەر چەندە توخمە جیۆپۆلەتیکییەکان و سامانی سروشتی و مرۆیی بایەخێکی گەورەیان هەیە بۆ هەر دەوڵەتێك، بەڵام ئەم بنەمایە بەجیاجیا، یا بەیەکیشەوە، لەسنورێکی دیاریکراودا کاری خۆیان دەکەن ئەگەر بێت و لەگەڵ توخمەکانی تردا کارلێك نەکەن، کە پەیوەندییان بەهێزی سوپایی و چەکدارکردن، پێشکەوتنی پیشەسازی و تەکنیکی، پەرەسەندنی ئابووری و دام و دەزگاکانی سیستمی سیاسییەوە هەیە.

### ١-١-٣: ئاستە ناوەکی، دەرەکی و دەولییەکانی ئەمنی قەومی[11].

ئەمنی قەومی، وەك چەمکێکی هەمەلایی پێکەوە بەستراوو بەیەکەوە گرێدراو، هەر تەنها ئاستێکی نییە، بەڵکو بریتییە لەچەندین ئاستی جیاجیا کە هەندێکیان پەیوەندییان بەقەوارەو سنووری دەوڵەتەکەوە هەیە، واتە لەچوارچێوەیەکی خۆییدایە، کە ئەویش بەگوێرەی سەرچاوەکانی مەترسی لەسەر ئەو قەوارەیە دیاری دەکرێ. یان بەشێوەیەکی تر: ئاستە ناوەکی، دەرەکی و دەولییەکانی ئەمنی قەومی، یەك لەدوای یەك، دەربڕی سەرچاوەی مەترسییە ناوەکی، دەرەکی و دەولییەکانن.

### ١- ئاستی ناوەکیی ئەمن یا ئەمنی ناوخۆیی:

ئەمنی قەومی هەر دەوڵەتیکی دنیا بەسەر دوو ئاستدا دابەش دەبێ، کە یەکێکیان: ئەمنی ناوخۆیی و ئەوی تریان: ئەمنی دەرەکییە.

ئەمنی ناوخۆیی، بەمانا گشتییەکەی، ئەمنی کۆمەڵایەتییە کە بریتییە لە: بڵاوکردنەوەی ئەمن و ئاسایش و باش جێبەجێکردنی یاساکان و دابینکردنی

---

[11] - بۆ ئەم سەرباسە و سەرباسی ١-١-٤ سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:
- بغدادي، عبدالسلام ابراهيم، مفهوم الكيان الصهيوني للامن القومي، دار الحرية للطباعة، بغداد، الباب الاول، الفصل الاول.
- محمد، ثامر كامل: دراسة في الامن الخارجي العراقي واستراتيجية تحقيقه، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٥، الفصل الاول، المبحث الثاني.
- هەروەها چەند سەرچاوەیەکی تریش.

دادپەروەریی کۆمەڵایەتی بەجۆرێك رەوتی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان، لەبوارە جیاجیاکانیدا، لەچوارچێوەی نەخشەکانی دەوڵەتدا بۆ پەرەپێدانی وڵاتەکە مسۆگەر بکاتو ئەو مەترسیو هەڕەشانەش، جا چ سیاسی، ئابووری کۆمەڵایەتی، دیمۆگرافی یا هیتر بن ـ کە لەناوەوە مەترسی دەخەنە سەر دەوڵەت، لەباربەرێتو نەیهێڵێ.

ئەمنی قەومی هەر دەوڵەتێك چەند قایمو پتەو بێت، کێشەو گیرو گرفتەکانی کەمتر بێت، بەو ئەندازەیە پایەکانی رژێمەکە لەناوخۆدا قایمترو بەهێزتر دەبێت، شوێنی دەوڵەتەکەش لەناوچەکەو لەکۆڕی نێو دەوڵەتاندا بەهێزترو قایمتر دەبێ، هەروەها باشتر دەتوانێ سنوورەکانی خۆیو بەرژەوەندییە نیشتمانیو نەتەوەیەکانی لەهەڕەشەو مەترسییەکانی دەوروبەری بپارێزێت. ئەمە بەپێچەوانەشەوە هەر راستە. بۆیە هەمیشە دەوڵەتانی دنیا هەوڵ دەدەن، چەند بۆیان دەکرێو پێیان دەکرێ، ریزەکانی گەلەکەیان یەکخەن، هۆکانی ناتەبایی و پێکەوە نەگونجان نەهێڵن، بەجۆرە ئەمنی ناوخۆییان بەهێزو پتەو قایمو لەهەمان کاتیشا مسۆگەر دەکەن. ئەو فاکتەرو هۆیانەی کار لەئەمنی ناوخۆیی هەر دەوڵەتێك دەکەن فرەجۆرو فرەبابەتنو پەیوەندییان بەلایەنەکانی سوپایی، ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتیەوە هەیە، چونکە هەر دەوڵەتێك بگری هەندێ کەلەبەرو کەلێن، لەبوارە جیاجیاکانی ژیانی دەوڵەتەکەدا هەیە، کە دەشێ دزی تیا بکرێتو بقۆزرێتەوەو سودی لێ ببینرێت، چونکە بەخاڵی لاوازی دەوڵەتەکە دەژمێردرێت. دەشێ ئەو مەترسیانەی لەناوەوەدا هەڕەشە لەئەمنی قەومیی هەر دەوڵەتێك دەکەنو رووبەرووی دەوەستنەوە، لەم خاڵانەی خوارەوەدا پۆلین بکەین:

١ـ دیاردەی ناجێگیربوونی سیاسی: یەکێکە لەو فاکتەرانەی کارێکی خراپ دەکاتە سەر ئەمنی ناوخۆیی هەر دەوڵەتێك، کە ئەمەش لەئەنجامی ئاڵۆزی باری سیاسیو فرە هێزی بڕیاردەرو بوونی ئایدیۆلۆجی جیاجیاوە پەیدا دەبێت. ناجێگیربوونی سیاسی لەهەر دەوڵەتێکدا دەشێ پایەکانی ئەو دەوڵەتە هەڵتەکێنێتو شیرازەی رژێم لەبەر یەك بترازێنێو گەلی ئەو دەوڵەتەش توشی چەرمەسەری بکاتو خودی دەوڵەتەکەش بەرەو لەبەین چونو نەمانو پارچە پارچە بوون بناژوێ. هەندێ دەوڵەت بۆ چارەسەرکردنی ئەم گیرو گرفتە، واتە: بۆ جێگیرکردنی باری سیاسی دەوڵەتەکە، رژێمی فاشی، رەفتار فاشی یا میلیتارییان دامەزراندووە بەبیانووی جێگیرکردنی باری سیاسی دەوڵەتەکە، وەك:

عێراق، تورکیا کە بەئاگرو ئاسن دەسەڵاتی سیاسی خۆیان پاراستووە، گەلەکانیشیان لەدەریای خوێنو فرمێسکدا نوقم کردووەو نوزەی ئازادیو سەربەستییان لێ بڕیون.

٢ـ دیاردەی دواکەوتنی سیاسی: ئەو دیاردەیە خۆی لەلاوازیو شڕۆڵیو بێهێزیو بێ توانایی داموو دەزگاکانی دەوڵەتدا دەبینێتەوە، کە لەئاستی جێبەجێکردنی ئەرکەکانیاندا نین، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بەپاراستنی ئەمنو رژێمەوە هەیە.

هەروەها نەبوونی دیموکراسیو پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ یەکێکی ترە لەو هۆیانەی یارمەتی یاخیبوونو بەکارهێنانی زەبرو زەنگ دەدات. بەم شێوەیە ئەمنی ناوخۆیی ئەو دەوڵەتە بەرەو هەڵدێری پڕ لەمەترسی دەبات.

هەندێ دەوڵەت بەبیانوی پاراستنی پایەکانی ئەمنی ناوخۆییوجێگیرکردنی، هەموو مافە دیموکراتیو مرۆییەکان، تەنانەت مافەکانی تاکەکەسیش، پێشێل دەکەنو دەست لەهەموو کاروبارێکی تایبەتیو خێزانیو تاکەکەسی وەردەدەنو هەموو سەرەتایەکی مرۆیی پێ خوست دەکەن. جا لەبەر ئەوەی ئەمنی ناوخۆیی، وەك باسکرا، ئەمنی کۆمەڵایەتییە، ئەمنی هاوڵاتییانە، بۆیە سەندنەوەی ئەو مافانە یانی نەهێشتنی ئەمنو ئاسایشو ئۆقرەو ئارامی. بۆیە پێویستە جۆرێك لەهاوسەنگی لەنێوان پێداویستییەکانی ئەمنو مافەکانی مرۆڤدا هەبێ، بیانووی ئەمنی ناوخۆیی نەبێتە هۆی پێخوستکردنی مافەکانی مرۆڤ.

٣ـ دیاردەی دواکەوتنی کۆمەڵایەتی: ئەو دیاردەیە دەشێ لەچەند لایەکەوە سەیر بکرێ:

* ئەو دەوڵەتانەی کە لەچەندین نەتەوەو ئایینو مەزهەبو چین پێکهاتوون، بەشێوەیەکی گشتی، رووبەڕووی چەندین کێشەو گیرو گرفت دەبنەوە.
* ئەو دەوڵەتانەی کە هەژاریو نەداری تێدایە، جەورو ستەمی کۆمەڵایەتی چەوساندنەوەی جۆراوجۆری تێدایە، پایەیەکی لەرزۆکیان هەیە.
* هەروەها دواکەوتنی رۆشنبیریو فەرهەنگی لەلایەك، مانەوەی فەرهەنگی دواکەوتوو و پاشکەوتوی خێلەکەیو دەربەگایەتی، مانەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە پەڕپوتەکان، دواکەوتنی ئافرەتو نەبوونی سەربەستیان، هەموو ئەمانە کۆسپن لەبەردەم جێگیربوونی ئەمنی ناوخۆیی هەر دەوڵەتێكو پتەوبوونیدا.

٤ـ ئەو هێزە ناوخۆییانەی هەڕەشە لەبوونی دەوڵەتەکەو قەوارەکەی دەکەن‌و دەیانەوێ دەوڵەتەکە پارچە پارچە بکەن، یا پارچەیەکی بەدەوڵەتێکی ترەوە بلکێنن یا بیخەنە ژێر دەسەڵات‌و نفوزی دەوڵەتێکی ترەوە. هەموو ئەمانە مەترسی لەسەر پاشەڕۆژو ئەمنی ناوخۆیی دەوڵەتەکە دروست دەکەن.

دیارە ئەمە ئەو پارت‌و جوڵانەوەی نەتەوەیی‌و نیشتمانییانە ناگرێتەوە، کە لەپێناوی رزگاری نیشتمانیدا لەخەباتێکی بێ وچان‌و نەپساوەدان تا نیشتمانەکەیان لەژێر چەکمەی داگیرکردن رزگار بکەن یان وڵاتەکەیان لەو هێزە بەکرێگیراوانە، ئەم تاقم‌و دەستانە، پاك بکەنەوە، کە لەپێناوی بەرژەوەندییەکانی وڵاتە داگیرکەرەکە کار دەکەن‌و سەربەخۆیی وڵاتەکەیان ناوەتە ژێر پێوە، یا ئەو جوڵانەوانەی لەپێناوی یەکخستنی پارچەکانی وڵاتەکەیان، یا دەوڵەتەکانیان‌و یەکگرتنەوەی نەتەوایەتیدا خەبات دەکەن، چونکە خەباتەکەیان رەوایەو چینە شۆڕشگێڕەکانی گەلەکەشیان پشتگیری‌و پشتیوانییان لێدەکەن.

خەباتی نیشتمانی‌و نەتەوەیی، چ سیاسی بێ یا چەکداری، یەکێکە لەو گرێ ئالۆزانەی کە دەشێ ئەمنی قەومی هەر دەوڵەتێك تووشی ببێ، چونکە خواستی گەلان لەیەکگرتنەوەی نەتەوەیی‌و یەکخستنی نیشتمانەکەیاندا لەیاسا دانراوەکان بەهێزترە، چونکە جگەلەڕەوایی خواستەکانیان، هێزێکی مێژوویشی هەیە، لەکاتێکا یاساکانی ئەو دەوڵەتانە "رێژەیی"و کاتین‌و دەشێ لابرێن یا بگۆڕدرێن"[12].

٥ــ پێکهاتنی ناوەکی سوپا: سوپا لەژیانی سیاسی‌و سوپایی هەر دەوڵەتێکدا دەشێ رۆڵی گرنگ‌و بایەخدار بگێڕێ، چونکە سوپا ئامرازێکی سیاسیشە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی هەر دەوڵەتێك. بۆیە یەکێتی‌و یەکگرتوویی سوپا کارێکی باشە بۆ دەوڵەتەکە، لەکاتێکا پارچە پارچە بوون‌و لایەنگیری لەم باڵ‌و یا ئەو باڵی سیاسی بەکارەسات بۆ نەتەوەو گەلەکە دەگەڕێتەوە، چونکە زەمینەی جەنگی ناوخۆیی ساز دەکا. جا بوونی هێزی چەکداری جیا جیاو فرە لەشکری یەکێکە لەو فاکتەرانەی دەبێتە هۆی لاوازبوونی هەر دەوڵەتێك یا نەتەوەیەك، بۆیە دەبێ پێشگیریی روودانی بکرێت.

---

[12] ـ الدباغ، الدكتور ضرغام عبدالله: قضايا الامن القومي والقرار السياسي، مطبعة الانتصار، بغداد، ١٩٨٦، ص٥٨.

هەر دەوڵەتێك بۆ ئەوەی ئاستێکی باڵا لەئەمنی ناوخۆیی بۆ خۆی دابین‌و مسۆگەر بکا، پتەوو قایمی بکا، پێویستە هەندێ ڕێوشوێن بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان بگرێتە بەر لەچوارچێوەی ستراتیجێکی ئەمنیدا، کە بەبێ کردنیان مەحاڵە بتوانرێ ئەمنێکی ناوخۆیی جێگیرو دامەزراو بکرێت، کە ئەویش ئەمانەی خوارەوەن:

١ـ پەرەپێدانێکی هەمەلایەنەی سیاسی، ئابووری، کۆمەلایەتی لەرێگەی:

* بەدیهێنانی دیموکراسی کۆمەلایەتی ئەویش بەنەهێشتن یا کەمکردنەوەی جیاوازی چینایەتی نێوان چین‌و توێژە کۆمەلایەتییە جیاوازەکانی ناو چوارچێوەی دەوڵەتەکەو بەرزکردنەوەی ئاستی ژیان‌و دابینکردنی دەرفەتی کارو ژیان بۆ هەموو دانیشتوان.

* بەدیهێنانی دیموکراسی سیاسی بەجۆرێك ئازادی بیروڕا، رۆژنامەگەری، پێکەوەنانی رێکخراوی سیاسی، سەندیکایی، پیشەیی بۆ نیشتمانپەروەرانی دەوڵەتەکە مسۆگەر بکات، جیاوازی لەنێوان هاوولاتییەکو یەکێکی تردا لەبەرامبەر یاسادا نەهێڵێ، واتە: یەکسانی کۆمەلایەتی‌و دادپەروەری جێبەجێ بکا.

٢ـ دروست کردنی دام‌و دەزگای جێبەجێکردن‌و ئیداری بەشێوەیەکی ئەوتۆ لەئاستی جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانەی سەرشانیاندا بن، یەکێتی‌و تەبایی‌و پێکەو گونجانی کۆمەلایەتی مسۆگەر بکەن، بێ ئەوەی دەست لەکاروباری تایبەتی‌و کەسی هاولاتیان وەربدەن، بەبیانووی دابینکردنی ئەمنی ناوخۆییەوە. بەجۆرە دەتوانن تەرازوییەك لەنێوان پارێزگاری‌و چاودێری رژێمە سیاسی‌و کۆمەلایەتیەکەو دابین کردنی سەربەستییە کەسییەکان رابگرن.

٣ـ هەوڵدان بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی‌و رۆشنبیری گەلەکەی، بەجۆرێ بانگەشەو پرۆپاگەندە بەئاسانی کاری تێ نەکات‌و لەخشتە نەبرێ‌و هەستیش بەئەرکە نیشتمانیەکانی سەرشانی خۆی بکا.

٤ـ مافی چارەی خۆنوسینی نەتەوەکانی سنووری دەوڵەتەکەی خۆی بسەلمێنێ‌و هەموو جۆرە چەوساندنەوەو ستەمێکی نەتەوایەتیان لەسەر لابەرێت. هەر وەك مافی کەمینە نەتەوەیی، ئایینی‌و مەزهەبیەکانیش، لەچوارچێوەی دەوڵەتەکەیدا، دابین‌و مسوگەر بکات‌و ستەم‌و جەورو چەوساندنەوەیان لەسەر نەهێڵێت.

بەبێ جێەجێ کردنی ئەم خاڵانە ئەستەمە، بگرە مەحاڵیشە، بناغەیەکی قایمی ئەمنی ناوخۆیی دابڕێژێت. وێڕای ئەوەی گێرو گرفتو کێشەی هەمیشەیی و باری نا ئارامیو بێ ئۆقرەیی دەبێتە بەشێك لەژیانی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی دەوڵەتەکە.

**ب ـ ئاستی دەرەکی هەر دەوڵەتێك ئەمن یا ئەمنی دەرەکی:**

ئەمنی دەرەکی هەر دەوڵەتێك بریتییە لەپارێزگاریو پاراستنی دەوڵەتەکە دژی هەر هێرشێکی چاوەڕوانکراوی دەرەکیو دابینکردنی ئاتاجە پێویستیەکانی حاڵەتێکی ئاواو خۆئامادەکردن، بەو پەڕی توانـاوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەگەرێکی ئاوهایی. مەترسییە دەرەکییەکان لەهەموو کاتێکدا دەرناکەون، بەڵکو تەنها لەکاتی پەیدابوونی تەنگو چەڵەمەو خۆئامادەکردن بۆ هێرشو پەلامار دەردەکەون.

دەوڵەتانی دنیا، بەشێوەیەکی گشتی، دوو ئەرکی بنچینەییان هەیە کە یەکێکیان ناوخۆییەو ئەوی تریان دەرەکییە، یەکەمیان: لەپەیوەندی نێوان دەوڵەتەکەو هاوڵاتیەکانیدا دەردەکەوێت، لەکاتێکدا دووەمیان لەپەیوەندی نێوان ئەو دەوڵەتەو دەوڵەتانی ترو داموو دەزگا دەولییە ناحکومییەکانو ڕێکخراوە دەولییەکاندا خۆی نیشان دەدا.

هەرچەندە دەوڵەتانی دنیا لەڕووی یاساوە بەرامبەرو وەك یەکن، بەڵام لەڕاستیدا بوونی یەکسانییەکی ئاوا هەرگیز لەئارادا نییە، چونکە هێزو توانای دەوڵەتان دەورو شوێنی لەکۆڕی نێو دەوڵەتاندا دیاری دەکات.

ئەو مەترسییە دەرەکییانەی دەشێ تووشی هەر دەوڵەتێك بن، دەکرێ لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکرێنەوە:

١ـ ڕەنگە دەوڵەتێك یا هێزێکی هاوسێ دەستدرێژی بکاتە سەر ئەو دەوڵەتە بەهۆی هەندێ پاڵنەرەوە، وەك: شوێنی جوگرافی یا سەروەتو سامانی زۆر یا بوونی کانزایەکی ستراتیجی دەگمەنو نایاب کە لەو دەوڵەتەدا هەبێت، وەك یۆرانیۆم. دیارە یەکێك لەهۆکارەکانی کۆلۆنیکردنی وڵاتانو داگیرکردنیان لەلایەن دەوڵەتە کۆلۆنیالیو ئیمپریالیستەکانەوە پاڵنەری ئابووری بووە، جگە لەوەی ویستوشیانە شوێنە ستراتیجیەکانی دنیا بگرن.

٢ـ زیادبوونی توانای ئابووریو سوپایی دەوڵەتێکی دوژمن یا نەیار: دیارە پەرەسەندنی توانای ئابووریو سوپایی دەوڵەتێکی نەیار ئۆخەو ئۆقرەیی ناخاتە دەوڵەتەکەی ترەوە، بەڵکو دەبێتە هۆی پەیدابوونی ترسو دڵەڕاوکێ لەدەوڵەتەکەدا، بەتایبەتی ئەگەر هاتو ئەو دەوڵەتە چەکی نوێی پەیدا کردبێ، کە بووبێتە هۆی گۆڕینی پارسەنگو تەرازووی هێزەکانی ناوچەکە.

٣ـ هاوکاریو پەیمانبەستن لەنێوان دوو دەوڵەت یا زیاتردا: پەیمانبەستنی چەند دەوڵەتێك لەگەڵ یەکتردا، بەتایبەتی ئەگەر دژی دەوڵەتێك بێ، ڕەنگە زەمینەی پەلاماردانی ئەو دەوڵەتە خۆش بکاو زەمینەی پێکاهەڵپرژان ساز بکا، بۆیە دەبێتە مایەی مەترسی بۆ سەر دەوڵەتە دیاریکراوەکە.

٤ـ پەیدابوونی ئایدیۆلۆجیای نوێ لەدەرەوەی سنووری دەوڵەتەکە: دیارە هەر دەوڵەتێك ئایدیۆلۆجیای تایبەتی خۆی هەیەو پارێزگاری لێ دەکا، بۆیە پەیدابوونی ئایدیۆلۆجیایەکی نوێ لەدەوڵەتێکی هاوسێ یان لەناوچەکەیدا، چ ئەو دەوڵەتە دۆست بێ یا نەیار، دوور بێ یا نزیك، کاری تێ دەکا، بەتایبەتی ئەگەر ئەو ئایدیۆلۆجیایە بەپێچەوانە یا دژی هینەکەی خۆی بێ. ئاشکرایە یەکێك لەهۆکانی هەڵگیرساندنی جەنگی عێراق ـ ئێران لەلایەن ڕژێمی بەعسی عێراقەوە مەسەلەی ئایدیۆلۆجی بووە، کە بەعس ئایدیۆلۆژیای شیعە بەدژو پێچەوانەی ئایدیۆلۆژیای نەتەوە پەرستاری خۆی دەزانێو خۆشی لێ نایەو بەمەترسی دادەنێ لەسەر ئەمنی قەومی عەرەب.

٥ـ هەر وەك هاتنە سەر کاری تاقمێکی سیاسی یا سوپایی، بەهۆی کودەتای سەربازییەوە یا هەر شتێکی تر، لەدەوڵەتیکی هاوسێدا دەشێ ببێتە هۆی دروستکردنی بوونی مەترسی لەسەر ئەمنی قەومی ئەو دەوڵەتە یا دەوڵەتانی ناوچەکە.

دەوڵەتان لەجۆری چارەسەرکردنی کێشەو گیرو گرفتە دەرەکییەکان، یا ئەو مەترسییانەی لەدەرەوەی سنووری سیاسییاندا ڕووبەڕوویان دەبنەوە، یەك هەڵوێستو بۆچونیان نییە، هەر وەك یەك شێوەی چارەسەرکردنیشیان نییەو دەشێ بڵێین خاڵی یەکانگیریان کەمە یا نییە:

* هەندێ لەو دەوڵەتانە هەوڵو کۆششی سیاسیو دیپلۆماسی بەبنچینەی چارەسەرکردنی گیرو گرفتەکان دادەنێن، لەگەڵ پێکەوەنانی هێزێکی سوپایی بۆ کاتی پێویست، ئەگەر لەرێگەی ئاشتیەوە چارەسەر نەکرا.

* هەندێکی تر پێکەوەنانی جبەخانەو خۆ چەکدارکردن بەباش دەزانن.
* هەندێکی تر پەیمانی دوو قـولێیو بەکۆمـەڵ دەکەنـە بنچـینەیی سیاسـەتی دەرەکی خۆیان.
* هەندێك سیاسەتی بێ لایەنی هەمیشەیی هەڵدەبژێرن، وەك: سویسرا.
*هەندێکیش سیاسەتی بێ لایەنی هەڵدەبژێرن، وەك: هەندێ لەدەوڵەتانی دنیای سێ.

## ج ـ ئاستە دەولییەکانی ئەمن:

ئاستە دەولییەکانی ئەمن هەر بەسنووری ناوچەییەکانی دەوڵەتـەوە ناوەسـتن، بەڵکو زیاتر درێژ دەبنەوەو لەو سنوورە تێ دەپەڕەن، بـەڵام بەشـێوەیەکی گشـتی هەر بەئەمنی قەومی ئەو دەوڵەتەوە بەستراونەتەوە، چونکە ناشێ ئەمنی قەومی هیچ دەوڵەتێك دوورو دابڕاو لەو ژینگەیەی تیای دەژیو کارلێکی لەگەڵدا دەکا، بێتەدی. ئەو ژینگەیە جاری وا هەیە لەچوارچێوەی دەوڵەتە هاوسێکاندایە، جاری واش هەیە بۆکیشوەرێك یان هەموو جیهان درێژ دەبێتـەوە. ئاسـتە دەولییـەکانی ئەمن بەسـەر ئەمانەی خوارەوەدا دابەش دەکرێن:

١ـ ئەمنی ناوچەیی:

زاراوەی ئەمنی ناوچەیی مێژینەیەکی دووری نییە، بـەڵکو لـەماوەی نێـوان هەردوو جەنگی یەکەمو دووەمی جیهاندا سەری هەڵداوەو هاتۆتە کایەوە.

زۆر جار زاراوەی لەچەشنی ئەمنی کەنداو، ئـەمنی دەریـای سـوور، ئـەمنی دەریـای سـپی، ئـەمنی ئـەورووپا، ئـەمنی ئۆقیانووسـی هنـدو ئـەمنی ئاسـیا بەرگوێمان دەکـەوێ، کـە هەنـدێکیان پەیوەنـدییان بەناوچـەیەکی دیـاریکراوی جوگرافییەوە هەیە، لەکاتێکدا هەنـدێکی تریـان پەیوەنـدییان بەکیشـوەرێکەوە هەیە.

ئـەمنی ناوچـەیی بریتییـە لەسیاسـەتی کۆمەڵـە دەوڵـەتێك، کەسـەر بەناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراون، بۆ دانـانو رێکخسـتنی هاوکـاری سـەربازی لـەنێوان دەوڵەتـەکانی ئـەو ناوچـەیەدا دژی دەسـتدرێژیو دەسـتێوەردانی هـەر هێزێکی بیانی یا دەرەکی بۆ سەر ئەو ناوچەیە. ئەمنی ناوچەیی لەسەر بنچینەی سەرەتای "هەندێك لەپێناوی هەندێکدا: البعض للـبعض" دانـراوە. وێـڕای ئـەوە

جۆرێکە لەپەیمانبەستن لەنێوان دەوڵەتانی ناوچەیەکی دیاریکراو بۆ رێکخستنی بەرگری کردن لەو ناوچەیەو کرۆکی سیاسەتەکە بریتییە لەسازدانی ناوچەیی لەلایەك‌و رووبەڕووبوونەوەی ئەو هێزانەی دەیانەوێ دەست لەکاروباری ئەو ناوچەیە وەربدەن لەلایەکی ترەوە، هەروەها پاراستنی باری جێگیریی ناوچەکەو هێشتنەوەیەتی وەك خۆی لەلایەکی ترەوە. لەجیهاندا کۆمەڵێك پەیمان‌و پەیمانکاری لەنێوان دەوڵەتانی ناوچە جیاجیاکاندا هەبوون‌و هەندێکیشان ئێستاش هەر ماون. بەگوێرەی ئەو پەیمانانە دەستدرێژی بۆ سەر هەر دەوڵەتێك بەدەستدرێژی بۆ سەر باقی دەوڵەتانی تر دەژمێردرێت، وەك: پەیمانی ناتۆ، پەیمانی وارشۆ، پەیمانی رێو، پەیمانی سیاتۆ.

٢ـ ئەمنی بەکۆمەڵ:

ئەمنی بەکۆمەڵ لەو خاڵەدا لەئەمنی ناوچەیی جیا دەکرێتەوە، کە تایبەت نییە بەناوچەیەکی دیاریکراوی جوگرافی، بەڵکو مەوداو سنووری زۆر درێژدەبێتەوە، رەنگە چەند کیشوەرێك یا چەند ناوچەیەکی جیاواز لەرووی جوگرافییەوە بگرێتەوە، واتە ئەڵقەیەکی ناوەندییە لەنێوان ئەمنی ناوچەیی‌و ئەمنی دەولیدا.

ئەمنی بەکۆمەڵ، بەمانا تاکتیکییەکەی، بریتییە لەسیستمێك، کەچەندین دەوڵەت، لەرێگەی مۆرکردنی رێککەوتننامەو پەیمانبەستنەوە، بەیەکەوە دەبەستێتەوە بۆ دابینکردنی دوو مەسەلە:

* بەکارنەهێنانی هێز لەگەڵ یەکتریدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان.
* هەر ئەندامێك ئەو پەیمانە بشکێنێت، ئەوا لەرێگەی بەکارهێنانی هێزەوە دژی دەوستنەوە.

کەواتە ئەمنی بەکۆمەڵ بریتییە لەئیلتیزامی کۆمەڵە دەوڵەتێکی ناوچەیەکی دیاریکراو بەیەکترەوە بەجۆرێك دەستدرێژی بۆ سەر هەر دەوڵەتێك لەو دەوڵەتانە دادەنرێ بەدەستدرێژی بۆ سەر هەموو دەوڵەتەکانی ترو هەموویان دەکەونە جەنگەوە لەگەڵیا، جا لەسەر هەق بێ یان نا، دوور بێ لەو ناوچەوە یا نزیك بێت، جۆری گیۆگرفتەکە هەرجۆرو بابەتێك بێت. ئەمنی بەکۆمەڵ بەپێچەوانەی ئەمنی ناوچەیی لەسەر بنچینەی سەرەتایی "هەموان لەپێناوی هەمواندا: الكل للكل" دانراوە.

واشنتن بۆ ئەوەی پشتێنەیەکی گەمارۆ بەدەوری یەکێتی سۆڤیێتدا بێنێ، هەر لەئەوروپای رۆژئاواوە تا رۆژهەڵاتی ئاسیا چەندین رێککەوتنامەی ناوچەیی پێکەوە گونجاوو گرێدراوی پێکهێنا، بەجۆرێك هەر یەکێ لەو رێکەوتننامانە دەوڵەتێکی تێدایە کە لەیەك کاتدا لایەنێکی نەگۆڕو جێگیرە لەدوو رێککەوتننامەدا. بەو چەشنە دەستدرێژی یا شەڕکردن لەهەر ناوچەیەکدا کە دەوری یەکێتی سۆڤیێی دابوو، دەبوە هۆی هەڵگیرسانی جەنگ لەهەموو ناوچەکانی ترو هەموو دەوڵەتەکانی ناوچەکە دەبونە لایەنێکی راستەوخۆی جەنگەکە. بۆ نموونە: پەیمانی ناتۆ تورکیای تێدایە، بەلام تورکیا لەپەیمانی سانتۆشدایە، کەئەو پەیمانە پاکستانیش لایەنێکی بنچینەییەتی، لەهەمان کاتیشدا پاکستان لەپەیمانی سیاتۆدایە، کە ئەو پەیمانە ژاپۆنیشی تێدایە، ژاپۆنیش لەلایەکی ترەوە لەپەیمانی ئۆقیانوسی باسیفیك (ئارام) دایە. واتە جەنگ لەگەڵ هەر دەوڵەتێك لەو دەوڵەتانە دەبێتە هۆی هەڵگیرسانی جەنگ لەئەوروپای رۆژئاواوە تا ناوچەکانی ئۆقیانوسی باسیفیك لەرۆژهەڵاتی ئاسیا.

٣ـ ئەمنی دەولی:

مەبەست لەئەمنی دەولی ئەمنی تاکە وڵاتێك یا ناوچەیەك نییە، بەڵکو ئەمنی سەرتاپای سیستمی نێو دەوڵەتانە، ئامانجی ئەمنی دەولی نەهێشتنی جەنگو شەڕو شۆڕو جێگیرکردنی ئاسایشو ئارامییە لەسەرانسەری جیهاندا. هەر دەوڵەتێکیش لەپێناوی بەدیهێنانی ئامانجە سیاسییە دەرەکییەکانی خۆیو دابینکردنی هێزو توانا بۆ رووبەڕوو بوونەوەی ئەنجامەکانی زۆرانبازیو ململانێی ستراتیجی نێوان زلهێزەکانو هێزە گەورەکانی دنیاو رەنگدانەوەی لەسەر ئەمنی ئەو دەوڵەتە، ناچارە چوار چێوەیەك بۆ ستراتیجی ئەمنی نێودەوڵەتی خۆی دابرێژێ.

ئەمنی دەولی، وەك چەمکێك، بەرجەستەکردنی سەرجەمی ئەو هەوڵو کۆششانەیە کە لەسەر ئاستی دەولی بۆ دابینکردنی ئەمنی دەرەکی گشت دەوڵەتە هاوچەرخەکان دەدرێن.

ئەمنی دەولی، چ وەك ئایدیاو چ وەك چەمکێك یا سیستمێك لەسەر بناغەیەکی ئایدیالی دامەزراوە، نەك لەسەر بناغەیەکی راستی کردەوەیی، چونکە ئەم چەمکە لەسەر بنچینەی سەرەتای "هەمووان لەپێناوی هەمواندا"

دانراوه، كه لەسیستمی ئەورۆی جیهاندا بەدیهێنانی مەحاڵە. كۆمەڵـەی گـەلان لەساڵی ١٩١٩و نەتەوە یـەكگرتووەكانیش لەسـاڵی ١٩٤٥دا لەسـەر بنچـینەی بەدیهێنانی ئەمنێكی دەولی دانـران، بـەڵام نـە كۆمەڵـەی گـەلانو نـە نەتـەوە یەكگرتووەكانیش نەیتوانیوە لەبەدیهێنانی ئەو ئەركە سەربكەون.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئـەو راسـتییە بكـەین، كـە هـەموو ئاسـتەكانی ئەمنی قەومی بەیەكەوە گرێدراونو كار لەیەك دەكەن. چونكە هـەر هـەموویان لەچوارچێوەی یەك ستراتیجی ئەمنی، بەنسبەت هـەر دەوڵەتێكـەوە، دارێـژراونو یەك سیاسەت بەرێوەیان دەبا. لەلایەكەوە ئەمنی ناوخۆیی پەیوەندییەكی تونـدو تۆڵی بەئەمنی دەرەكی هەر دەوڵەتێكەوە هەیە. ئـەمنی نـاوخۆیی چـەند قـایمو بـەهێزو پتـەو بێـت، بـەو ئەندازەیـە دەوڵەتەكـە باشـتر دەتوانـێ رووبـەرووی دەستدرێژیو پیلانە دەرەكییەكان ببێتەوە، بەپێچەوانەشـەوە شـوێنی دەوڵەتەكـە لەناوچەكەیدا چەند قایم بێتو توانای بەرپەرچدانەوەی پیلانو دەسـتدرێژیەكانی هەبێت، بەو رادەیەش دەتوانێ ئەمنی ناوخۆیی بەهێزترو پتەوتر بكـات، چـونكە تەجروبە نیشانی داوە جاری وا ئەوتۆ هەبووە هێزێك كە لەجەنگدا بووە بەر لەوەی جەنگەكەی لابەلا كردبێ، یا دۆڕا بێ، لەناوەوەدا تـەپیوەو روخـاوەو رژێمەكـەش ئاداری بەسـەر پـادارەوە نـەماوە، لەكاتێـدا ئەگـەر ریزەكـانی نـاوەوەی بـەهێزو یەكگرتوو بووبێت، ئەگەر لەشەڕگەشدا لەچـەندین نەبـەردو پێكادانـدا دۆڕان، بەڵام رژێمەكەی هەر ماوەتەوەو نەڕووخاوە.

هـەروەها لەلایـەكی تریشـەوە ئـەمنی دەرەكـی هـەر دەوڵـەتێك پەیوەنـدی بەئەمنی دەولییەوە هەیەو كاری لێ دەكاو كـاری تـێ دەكـرێ. ئـەو دەوڵەتانـەی لەناوچەكەدا سەنگو قورساییەكی باشیان هەیەو دیواری دەرەوەیـان پـارێزراوەو توانای پاراستنی وڵاتەكەیان هەیە، لەكۆڕی نێو دەوڵـەتانیش شـوێنی لـەباریان هەیەو دەتوانن رۆڵی دیارو بەرچاو بگێـڕن. لەهـەمان كاتیشـا هـەر دەوڵـەتێك لەكۆڕی نێو دەوڵەتاندا چەند رۆڵی گرنگو دیاری هەبێ، زیاتر دەتوانـێ ئـەمنی دەرەكی بەهێز بكاتو پارێزگاری وڵاتەكـەی بكـا لەدەسـتدرێژیو دەسـتێوەردانی دەوڵەتانی هاوسێ. بەجۆرە جۆری پەیوەندییەكان دیالێكتیكیەو هەر یەكێك كـار لەوی تر دەكات.

## ٤.١.١: ئاستە هونەرییەکانی ئەمنی قەومی

ئاستە هونەرییەکانی ئەمنی قەومی بریتین لەتوخمە بنچینەییە پێکهێنەرەکانی، چونکە هەرچەندە ئەمنی قەومی چەمکێکی پێکەوە بەستراوە، بەلاّم رووبەرووی ئەرکی جیاجیا دەبێتەوە، بۆیە هەر یەکێ لەتوخمە پێکهێنەرەکانی پەیوەندی بەیەکێ لەو ئەرکانەوە هەیە، کە گرنگترینیان ئەمانەن: سوپایی، ئابووری، دانیشتوان، ئایدیۆلۆجی، سیاسی...

أ- ئەمنی سوپایی:

ئەمنی سوپایی یەکێکە لەهەرە بنچینەییترین توخمەکانی دابینکردنی ئەمنی قەومی. هەرچەندە ئەمنی سوپایی ئاستێکە لەئاستەکانی‌و لقێکە لەلقەکانی ئەمنی قەومی، بەلاّم رۆلّی سەرەکی لەبەدیهێنانیدا دەگێڕێ. هەر بۆیە بێ هێزی‌و لاوازی هێزی سوپایی دەولّەتیك، دەشێ ئەمنە قەومییەکەی بخاتە مەترسییەوەو دەولّەتانی تریش چاو ببڕنە خاك‌و سامانەکەی.

رەنگە وابێتە بەرچاو کە ئەمنی سوپایی هاوتای ئەمنی قەومییە، بەلاّم لەراستیدا گەلێك جیاوازن، چونکە ئەمنی سوپایی پەیوەندی بەهێزە چەکدارەکانەوە هەیە، لەکاتێکدا ئەمنی قەومی پەیوەندی بەئەمنی دەولّەتەوە هەیە. کەواتە: ئەمنی سوپایی تەنها جۆرێکە لەجۆرەکانی ئەمنی قەومی کە پەیوەندی بەدام‌و دەزگا سوپاییەکانەوە هەیە، بەلاّم ئەمنی قەومی بابەتێکە پەیوەندی بەهەمموو دام‌و دەزگاکانی دەولّەتەوە هەیە. بەجۆرە ئەمنی قەومی بریتیی نییە لەقەبارەو بەتوانایی دەزگا سوپاییەکان، هەر چەندە ئەویشی تێدایە، بریتیش نییە لەهێزی سوپایی هەر چەندە دەشێگرێتەوە، چالاکی کلاسیکی سوپاییش نییە، هەرچەندە ئەویش دەگرێتە خۆی[١٣].

بەم پێیە: "ئەمنی قەومی ئەمنی سوپایی دەگرێتە خۆی، چونکە دووەمیان بەشێکە لێی. ئەگەر مەیدانی ئەمنی سوپایی ستراتیج بێ، ئەوا مەیدانی ئەمنی قەومی ستراتیجی بەرزی دەولّەتە، کە بەکارهێنانی هەموو داهاتەکان دەگرێتەوە بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی، بۆیە ئەگەر ئامرازی ئەمنی سوپایی جەنگی

[١٣] - هویدی/ امین: الامن العربي في مواجهة الامن "الاسرائيلي" سەرچاوەیەکی پێشووتر، ل٤٠.
وەرگیراوە لە: بغدادی، عبدالسلام ابراهیم: سەرچاوەیەکی پێشووتر، ل٤٤.

تەکنەلۆجی بێت، ئەوا ئامرازی ئەمنی قەومی جەنگی تەکنەلۆجیایە. دیارە جیاوازییەکی گەورە لەنێوان هەر دوو دەستەواژەکەدا هەیە"[14]. ئەویش لەو روانگەیەوە کە تەکنەلۆجی بەشێکە لەجەنگی تەکنەلۆجیا، چونکە ئەگەر جەنگی تەکنەلۆجی پشت ئەستوور بێ بەهێز، ئەوا جەنگی تەکنەلۆجیا پشتئەستوورە بەتواناوە[15].

جا لەبەر ئەوەی پێکەوەنانی هێزی سوپایی رۆڵی خۆی لەبەهێزکردنی پایەکانی هەر دەوڵەتێکدا دەگێرێ، بۆیە زۆربەی دەوڵەتانی دنیا هەوڵی پێکەوەنانی هێزی سوپایی دەدەن. هەرچەندە بوونی هێزێکی بەرپەرچی سوپایی مانای بەرپاکردنی جەنگ نییەو خۆئامادەکردنیش بۆ جەنگ ناگەیەنێ، هەروەك هەبوونی هێزێکی سوپایی پێشکەوتوو و بەرهەمهێنانی چەك مانای هەڵگیرساندنی جەنگ نییە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئەوە دەگەیەنێ ئەگەر هێزێك پەلاماری بدا، توانای بەرپەرچدانەوەو بەرگریکردنی هەیە.

بەڵام پێکەوەنانی هێزێکی سوپایی گەورەو میلیتاریزەکردنی دەوڵەت هەروا بەخشکەیی ناکرێ، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی دەوڵەتەکانی تری ناوچەکەش بێ هەستو خوستو دەستەوەستان رانەوەستن، ئەوانیش هەڵپەی خۆچەکدارکردنو میلیتاریزە کردنی دەوڵەتەکانیان دەدەن، بۆ ئەوەی تەرازووی پارسەنگی هێزەکانی ناوچەکە رابگرن، بەتایبەتی ئەگەر ئەو دەوڵەتە بیەوێ لەناوچەکەدا، یا لەسەر ئاستی جیهان، رۆڵی تایبەتی هەبێت. پێکەوەنانی هێزێکی سوپایی نابێ دابڕاو بێت لەهەڵسەنگاندنی پایەکانی تری سیاسیو ئابووری، چونکە هەموویان تێکچرژاونو کار لەیەکتری دەکەن. هەروەها قەبارەی هێزە چەکدارەکان دەبێ ژمارەی دانیشتوانی دەوڵەتەکەو دابەشبوونی وزەی مرۆیی لەبوارەکانی تری بەرهەمهێناندا، لەبەرچاو بگرێ، بەجۆرێ کە پەرەپێدانی هێزی سوپایی لەسەر حیسابی بوارەکانی تری ژیانی ئەو دەوڵەتە نەبێ.

هەر دەوڵەتێك بۆ ئەوەی بتوانێ ئەمنی سوپایی خۆی دابین بکات، پێویستە:

---

[14] ـ هویدی امین: البحر الاحمر والامن العربي، ص١٠٨.

[15] ـ الباز، عفاف محمد: الترابط بين مفهوم الامن العربي والمصالح الاوروبية، ص٢١٨-٢١٩ لەهەمان سەرچاوەی پێشووتر، ل٤٤.

١- هێزێکی سوپایی مۆدێرن پێکەوە بنێ کە توانای جەنگینی بالاّ بێ، لەهەمان کاتیشا توانایەکی بەهێزی بەرپەرچی هەبێ.
٢- توانی بەرپاکردنی جەنگێکی درێژخایەنی هەبێت.
٣- سیستمێکی بەتوانای فەرمانـدەیی و پشـکنینی هـەبێ، بـۆ ئاگـاداربوون لەچۆنێتی جێبەجێ کردنی فەرمانەکان.
٤- هەوڵ بدا پیشەسازی سوپایی لەوڵاتەکەیدا دابمەزرێنێ، یا بتوانێ هەر نـەبێ ئامرازە پێویستییەکان و ئامرازی یەدەکی و تەقەمەنی لەوڵاتەکەیـدا بەرهـەم بهێنێ.
٥- پشت بەتاکە سەرچاوەیەکی خۆچەکدارکردن نەبەستێ، بـەڵکو لەچـەندین سەرچاوەوە چەکی جۆراو جۆر پەیدا بکا.
٦- پشت بەتەکنیکی نوێ و چەکی تازە ببەستێت.
٧- کـادری فەرمانـدەیی، سـەرکردەی لێوەشـاوەو بـەتوانای هـەبێ کـە بتوانـێ پێشـکەوتنی تەکنـەلۆجی و نەخشـە سـەربازی و سـتراتیجییەکان پێکـەوە ببەسـتێتەوە، چـونکە فەرمانـدە دەورێکـی بنچـینەیی هەیـە لـەناو هێـزە چەکدارەکاندا، چ لەکاتی جەنگ و چ لەکاتی ئاشتیدا.

ب - ئەمنی ئابووری:

گومان لەوەدا نییە کە باری ئابووری هـەر دەوڵـەتێك چ رۆڵێکـی کاریگـەر لەهێزو توانای جوڵان و مانۆڕی ئەو دەوڵەتەدا وازی دەکـا، چـونکە بـەبێ بـوونی بنکەیەکی ئابووری بەهێزو پتەو، ناتوانرێ توانای سـوپایی ئـەو دەوڵەتـە بـەرز بکرێتەوە، هەر وەك بۆ ئەوەی توانای ئابووری دەوڵـەتێك بزانـرێ، پێویسـتە بـڕو جۆری ئەو کەرەسانەی کـە هەیـەتی و چـۆنێتی کـارپێکردن و بەکارهێنانیشـیان بزانرێ.

بۆ ئەوەی باشتر لەرۆڵی ئـەمنی ئـابووری لەبـەدیهێنانی ئـەمنی قەومیـدا بگەین، پێویستە توخمە پێکهێنەرەکانی شی بکەینەوە، کە ئەمانەن:

١ـ پەرەپێدان:

مەکنەمارا دەڵێ: "ئەمن بریتییە لەپەرەپێدان، بێ پەرەپێدان ناشێ ئەمن بوونی هەبێ"، هەر بۆیە پەرەپێدان کلیلی ئەمنی قەومیو پایەیەکی گرنگیەتی.

مەبەست لەپەرەپێدان پێشخستنی باری ئابووریو کۆمەڵایەتیو سیاسییە، واتە بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانو گوزەرانی دانیشتوانو بۆ پێشەوە بردنیان لەهەموو بوارێکەوە، واتە پەرەپێدانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، تەندروستییە کە تەوەرو ناوکەکەی پەرەپێدانێکی ئابوورییە.

پەرەپێدانی ئابووری هەر دەوڵەتێك روو لەم بوارانەیە:

* پەرەپێدانی پیشەسازی: واتە دامەزراندنی پیشەسازی جۆراوجۆر کە پێداویستیەکانی ئەو دەوڵەتە دابین بکا بەجۆرێکی وا کە هاوسەنگی لەنێوان پیشەسازی قورسو ناوەنجیو سووکدا رابگرێت، بەپیشەسازی سوپایشەوە، بەجۆرێکی وا هەم ئامرازەکانو هۆکارەکانی بەرهەمهێنان، هەم پێداویستیەکانی بەرخواردن بێنێتە بەرهەم.
* پەرەپێدانی کشتوکاڵی: لەرێگەی پەرەپێدانی گشت لایەنەی کشتوکاڵەوە، بەشێوەیەکی ئەستوونیو ئاسۆیی، لەپێناوی زیادکردنی بەروبومو دابینکردنی پێداویستییەکانی دەوڵەتو دامەزراندنی پیشەسازی کشتوکاڵو میکانیزەکردنیدا. هەروەها پەرەپێدانی سامانی ئاژەڵداری، بەجۆرێکی وا بتوانێ داخوازییەکانی بازاڕی ناوخۆ دابین بکا.
* پەرەپێدانی بازرگانی: ئەمیش لەرێگەی گەشەپێدانی بازرگانی ناوەوەو دەرەوە، بە جۆرێکی وا پارسەنگی ناردە لەهاوردە زیاتر بێتو دەوری هەبێ لە گەشەپێدانی ژیانی ئابووری دەوڵەتەکەدا.

نەخشەی پەرەپێدان، لەم بوارانەدا، دەبێ لەچوارچێوەی نەخشەیەکی ستراتیجی بۆ پەرەپێدانی دەوڵەت بێو نەخشەی درێژخایەن، مامناوەنجی، کورت خایەن بۆ ئەم مەبەستە دابنرێت.

٢- ئەمنی بژێوی

ئەمنی بژێوی بەنسبەت هەر دەوڵەتێکەوە، بریتیە لەو بەشە بنچینەییو پێویستیەی بەروبومی کشتوکاڵیو بەرهەمی ئاژەڵداری، کە بۆ ژیانی مرۆڤ

پێویستەو نەبوونیان بۆشاییەك لەژیانی هاوڵاتیاندا دروست دەكاو كار لەباری تەندروستی گشتیان دەكا.

ئاشكرایە كە بژێوی (یا خواردەمەنی) چ كارێكی گرنگ دەكاتە سەر ژیانی هاووڵاتیان، بە تایبەتی دانەوێڵە، وەكو گەنم‌و برنج، كە نەك هەر نەبوون یا كەمبوونەوەیان، بگرە بەرزبوونەوەی نرخیشیان كارێكی خراپ دەكاتە سەر دانیشتوان. تەجروبەو تاقیكردنەوەكانی گەلان ئەوە دەردەخەن كە قات‌و قڕی‌و گرانی، سەرچاوەی گەلێ شۆڕش‌و جوڵانەوەی كۆمەڵایەتی بوون، هەروەك زۆربەی ئەو جەنگە ناوخۆییانەی روویانداوە، لە وڵاتە هەژارەكاندا بوون‌و هۆو فاكتەری بنچینەییش مەسەلەی دابینكردنی بژێوی بووە، بۆیە ئەمنی بژێوی بە نسبەت بەدیهێنانی ئەمنی قەومی هەر دەوڵەتێكەوە پێویستیەكی بنچینەییە.

هەر دەوڵەتێك نەتوانێ لانی كەمی ئەمنی بژێوی خۆی دابین بكا، دەكەوێتە بەر پاڵەپەستۆو گوشاری دەوڵەتانی تر، چ لەكاتی ئاشتی‌و چ لەكاتی جەنگدا كە گەمارۆی ئابووری لەسەر دەوڵەتەكە دەبێت‌و بازرگانی دەرەوەی دەوەستێ. كەمبوونی بژێوی لەدوو سەرەوە كار دەكاتە سەر دەوڵەت، لەلایەكەوە: شوێنەواری ئابووری بەسەرەوە جێ دەهێڵێ، لەلایەكی تریشەوە شوێنەواری سیاسی ـ سایكۆلۆجی، چونكە لەو كاتانەدا بژێوی وەكو چەكێكی سیاسی كاریگەر بەكار دەهێنرێت. مەترسی ئەمنی بژێوی ئەو كاتە رووبەرووی دەوڵەتێك دەبێتەوە، كە وەرزێك یا چەند وەرزێك وشكە ساڵی دەبێت، كە دەبێتە هۆی نەبوون یا كەمبوونی بژێوی ئەو دەوڵەتە، دەوڵەتەكەش دراوی قورسی نیە تا بتوانێ لەبازاری دەرەوە پێداویستیەكانی بكڕێ، ئەوسا رووبەرووی ترسناكترین تەنگ‌و چەڵەمەی ئابووری‌و سیاسی دەبێتەوە لەناوەوەی وڵاتدا.

بەكورتی ئەمنی بژێوی بە نسبەت هەر دەوڵەتێكەوە بریتیە لە بەرهەمهێنانی پێداویستیەكانی ژیانی كۆمەڵ لەبەروبومی كشت‌وكاڵی‌و بەرهەمی ئاژەڵداریی، یا بوونی دراوی پێویست بۆ كڕینیان لەبازاردا.

٣- ئەمنی وزە:

بەرەو پێشەوە بردنی وڵات‌و پەرەپێدانی بەبێ دابین كردنی وزە كارێكی سەختە، بگرە مەحاڵیشە، چونكە لەجیهانی ئەمڕۆدا، گەشەكردنی هەر وڵاتێك بەندە بە پەرەپێدانی ئەو وڵاتە لەرووی پیشەسازیەوە، كە ئەویش بەبێ بوونی وزە

• ئەنجام نادرێ، چونکە ڕەوڕەوەی پیشەسازی بەووزە دەجولێ. هەرچەندە ئێستا پەترۆڵ بوتە سەرچاوەی یەکەمی وزە، بەڵام پەترۆڵ هەتا هەتایە نامێنێ، بەڵکو ئەو پاشەکەوتەی ئێستا لەجیهاندا هەیە، ڕەنگە بەشی سەدەیەکی تر بکا، لەبەر ئەوە یەکێك لەو کێشانەی ڕووبەڕووی دەوڵەتان دەبێتەوە، مەسەلەی چۆتێتی دابین کردنی وزەیە.

وزە، جگە لە پەترۆڵ، دەشێ لەچەندین سەرچاوەی تر پەیدا بکرێ[16] بەڵام پێویستی بە تەکنیکی پێشکەوتو هەیەو ڕەنگە تێچونیشی زیاتر بێ. سەرچاوەکانی تری وزە بریتین لە:

وزەی هەتاو، جۆرەکانی وزەی ئەتۆمی، خەڵوزی بەردین، وزەی کارەبایی (کارۆگەرمایی‌و کارۆئاوی)، وزەی جیوترماڵ ( ئەو ئاوە گەرمانەی لەقوڵایی زەویدا بەڕادەیەکی زۆر هەن)، شەپۆلی دەریا، گازو لمی نەوتین. هەروەها دەشێ لەداهاتودا چەندین سەرچاوەی تریش بدۆزرێتەوە.

## ٢- ئەمنی ئاو

کورد دەمێکە وتویەتی: "ئاوو ئاوەدانی" کە ئەویش بەرەنجامی ئەو پەیوەندیە دیالێکتیکیەی نێوان ئاوو بوونی ژیانە، چونکە ئاو لەجیهاندا ڕوڵی گەلێ گرنگ وازی دەکا کە بریتین لە:

* ئاو وەك سەرچاوەیەکی خواردنەوە: ئاشکرایە کە هەر شوێنێك ئاوی لێ نەبێ، ژیانیشی لێ ناکرێ، واتە ئاوەدانیشی لێ نابێ، ئەو دەوڵەتانەی کە سەرچاوەی ئاویان کەمەو ناچار دەبن ئاوی سوێری دەریاکان شیرین بکەنەوە دەبێ پارەیەکی زۆر لەو بوارەدا خەرج بکەن‌و دامەزراوەی وا دابنێن کە تێچویەکی زۆری دەوێ، هەر بۆ نمونە: شیرینکردنەوەی ئاوی دەریاکان بەنسبەت ئیسرائیلەوە، هەر مەتر سێ جایەك ١ تا ٢،٥ دۆلاری تێدەچێ، بەو پێیە تێچووی پاککردنەوەو شیرین کردنەوەی ٧٠٠ ملیۆن مەتری سێ جا لەساڵێکدا، لەنێوان ١،٢- ١،٨ بلیۆن دۆلاری تێدەچێ[17].

---

[16] — بۆ زیاتر شارەزایی بڕوانە: سیامەند: تەنگوچەڵەمەی وزەو شڵەژانی بازاڕی پەترۆڵ، گۆڤاری " کۆمەڵە "، ژمارە١٢، خولی٣، مارتی ١٩٨٦، ل ٤١ — ٥٦.

[17] — عبدالفضيل، د. محمود: العلاقة الجدلية بين النفط والمياه والإنماء في الوطن العربي، مجلة الباحث العربي، مركز الدراسات العربية، العدد السابع، نيسان — حزيران ١٩٨٦، ص ٥١.

* پێویستی ئاو بۆ کشتوکاڵ: ئەو وڵاتانەی وشكو برینگنو ئاویان نیە، ناتوانن کشتوکاڵ بکەن، هەر بۆیە یەکێك لەو گیروگرفتانەی تووشیان دەبێ، ئەمنی بژێوەیە، بۆیە ئەمنی قەومی ئەو دەوڵەتانە لەمەترسیدا دەبێو هەمیشەش لەلایەن دەوڵەتانی ترەوە گوشاریان دەخرێتە سەر.

* ئاو وەك سەرچاوەیەکی وزە: دەشێ ئاو بۆ پەیداکردنی وزەی کاروئاوی بەکار بهێنرێ، کە بەمەش سەرچاوەیەکی وزە بۆ دەوڵەتەکە پەیدا دەبێتو دەشێ لەبواری پەرەپێدانی پیشەسازیو ئاوەدانی دەوڵەتەکەدا سوودی لێ ببینێ.

هەر بۆیە لەجیهاندا گەلێ جەنگو شەڕو پێکدادان لەنێوان دەوڵەتاندا، لەپێناوی دەست گرتن بەسەر سەرچاوەکانی ئاوو رووبارو چۆمەکانو دامەزراندنی بەست لەسەر ئەو رووبارو چۆمانە بوە، چونکە ئاو یەکێکە لەتوخمە جیۆپۆلەتیکیەکانو لەململانێی جیۆپۆلەتیکی نێوان دەوڵەتاندا رۆڵی خۆی وازی دەکا.

بەکورتی ئەمنی ئابووری بریتیە لەتوانای رژێمی سیاسی هەر دەوڵەتێكو دامو دەزگا ئابووریەکانی لەرزگارکردنی داهاتە ماددیو سامانە سروشتیەکانیو وەبەرهێنانیان لەبەر رۆشنایی ستراتیجێکی ئابووریدا، کە بەگوێرەیان پرنسیپو بنچینەکانی پرۆسەی وەبەرهێنان دیاری بکرێ، بەجۆرێ ئەو دەوڵەتە بتوانێ سەربەخۆیی خۆی لەبواری کار پێکردنی ئەو توانا خۆیانەدا بپارێزێ.

بۆ ئەوەی هەر دەوڵەتێك ئاستێکی گونجاو لەئەمنی ئابووری خۆی دابین بکات، پێویستە:

١- نەخشەی پەرەپێدانێکی ئابووری هەمەلایەنە لەبوارەکانی پیشەسازی، کشتوکاڵیو بازرگانیدا دابرێژێت، بەگوێرەی نەخشەی درێژخایەن، مامناوەنجیو کورت خایەن، تەرازوویەك لەنێوان پیشەسازی قورس، مامناوەنجیو سوك لەلایەكو لەلایەکی تریشەوە لەنێوان پیشەسازیو کشتوکاڵو بازرگانیدا رابگرێت.

٢- پشت بەیەك جۆری ئابووری نەبەستێت، بەڵکو ئابووریەکەی لەسەر بنچینەی ئابووری فرەجۆر دابمەزرێنێت.

٣- بتوانێ لانی کەمی، ئەمنی بژێوی خۆی دابین بکا، چ لەرێگەی کشتوکاڵی فرەجۆرەوە، چ لەرێگەی دابینکردنی دراوی قورسەوە.

٤- هەوڵبدا سەرچاوەی نوێی وزە پەیدا بکا.

٥- ئاستی بەرهەمداری دەزگا ئابووریەکانی بەرز بکاتەوە.
٦- سەروەت و سامانی ولاتەکەی بە باشترین شێوە وەبەر بهێنێت.
٧- بتوانێ تەکنەلۆجیا بەشێوەیەکی بەرفراوان لەبواری ئابووریدا بەکاربهێنێت.
٨- ڕێ و شوێنی بەرخواردن لەبەر ڕۆشنایی سیاسەتێکی ئابووری زانستیدا دیاری بکا.

ج- ئەمنی دانیشتوان:

ئەمنی دانیشتوان پەیوەندی بەجۆرو شێوەی دانیشتوانەوە هەیە، کەسامانی مرۆیی هەر دەوڵەتێکن و لەسەر دووپایەش دەوەستێ: ئەمنی ئیتنۆگرافی و ئەمنی دیمۆگرافی.

١- ئەمنی ئیتنۆگرافی:

بێگومان تەبایی و پێکەوە گونجانی دانیشتوانی هەر دەوڵەتێك بە یەکێك لەتوخمە بنچینەییەکانی بەهێزیی ئەو دەوڵەتە دەژمێردرێت، هەروەك ناتەبایی و پێکەوە نەگونجانی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیش یەکێکە لەتوخمە لاوازەکانی. ئەمنی ئیتنۆگرافی لەهۆکانی یەکخستن یا هەڵوەشانەوە، تەبایی یا ناتەبایی دانیشتوان دەکۆڵێتەوە هەروەك ئەو هۆیانەش لێکدەداتەوە کە کۆمەڵێك کۆدەکاتەوە یا لێکیان دەکاتەوەو لەبەریەکیان دەترازێنێت.

یەکێك لەو گیروگرفتە ئاڵۆزانەی ڕووبەڕووی گەلێ لەدەوڵەتانی دنیا بوتەوە، کێشەی کەمینەکانە، چونکە کەم دەوڵەتی وا هەیە کەمینەی تێدا نەبێ. کەمینەکان لەڕووی جۆرەوە دەکرێنە چەند جۆرێ:

* کەمینەی نەتەوەیی: ئەوانەن کەسەر بە نەتەوەیەکی جیاوازن و لەزۆربەی دانیشتوانی دەوڵەتەکە جیا دەکرێنەوە، ئامانجی ئەو نەتەوە یا کەمە نەتەوانە دەشێ:
- جیابوونەوەو پێکەوەنانی دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆ بێ، واتە مافی چارەی خۆنووسین بێ.
- داواکردنی مافی ئۆتۆنۆمی یا فیدراڵ بێ لەچوارچێوەی دەوڵەتەکەدا.

- گۆڕین‌و دەسکاریکردنی سنووری دەوڵەتەکە بێت، بەجۆرێ لەگەڵ بەشەکەی تری نەتەوەکەیدا، کە لەدەوڵەتێکی تردایە، یا دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەیە، یەکبگرێتەوە.

* کەمینە ئایینی‌و مەزهەبیەکان: ئەوانەی کە لەئایین یا مەزهەبی زۆربەی دانیشتوانی دەوڵەتەکە جیان.

* کەمینەی رەگەزی: ئەو کەمینانەن کە رەگەزیان لەرەگەزی زۆربەی دانیشتوانی دەوڵەتەکە جیایە، وەك: رەش پێست، سپی پێست، سوور پێست، زەرد پێست...

* کەمینە زمانیەکان: ئەوانەی کە زمانیان لەزمانی زۆربەی دانیشتوانی دەوڵەتەکە جیایە.

چارەنووسی ئەو دەوڵەتانەی کە لەرووی ئیتنۆگرافیەوە ناتەبان، واتە: فرە نەتەوە، فرە ئایین، فرە مەزهەب، فرە رەگەز، فرە زمانن (یا موزەخانەی ئەجناسی جیاجیان) لەدوو حاڵ بەدەر نیە: یەکەمیان پێکەوە ژیانی ئارەزوومەندانەی هەموو ئەو نەتەوەو دین‌و مەزهەبە جیاوازانەی لەسنووری یەك دەوڵەتدا کۆبوونەتەوە لەسەر بنچینەی سەلماندنی مافی یەکتری‌و رێزگرتنی یەکتری‌و یەکسانی‌و بەشداربوون لەبەرێوەبردنی وڵات‌و پاشەڕۆژو چارەنووسیدا هەر یەکەیان بەگوێرەی قورسایی خۆی‌و جیاوازی نەتەوەیی‌و رەگەزی‌و دینی‌و مەزهەبی سەردەستەو ژێردەستە نەبێ، ئەوسا گەلێکی گونجاوو تەباو یەکگرتوو پێکدێ، کە ناحەزانی ئەو دەوڵەتە بەهیچ جۆرێك لەرێگەی بەکارهێنانی گێروگرفتەکانی ناوەوە ناتوانن زەفەری پێ ببەن، بەمەش بنچینەیەکی گرنگی ئەمنی ستراتیجی دائەمەزرێت.

لەناو دەوڵەتێکی وادا جێگەی خۆبەزلزانینی نەتەوایەتی‌و شۆڤێنیستی‌و رەگەزبازی‌و تایفەگەری‌و جیاوازی دینی‌و مەزهەبی نابێتەوە، بۆیە هیچ کام لەو نەتەوەو دین‌و مەزهەبانەش هەست بەچەوسانەوە ناکەن‌و پێکەوە هەوڵی بنیاتنانی وڵاتێکی ئاوەدان‌و گەشەکردووو پێشکەوتوو ئەدەن.

دووەمیان، نەتەوەیەك دەبێتە حوکمڕان‌و دەسەڵاتدارو ئەوانی تر ئەبنە ژێر دەستەو هاووڵاتی پلەی دووەم‌و سێیەم‌و خوارووتر... ئەوسا بۆ پاریزگاری دەسەڵاتەکەی خۆی، ئەمنی ستراتیجی لەسەر بنچینەی خۆبەزلزانینی نەتەوایەتی‌و جیاوازی رەگەزایەتی‌و دینی‌و مەزهەبی دائەمەزرێنی‌و بەرێگەی

زەبرو زەنگ‌و کوشتن‌و لەناوبردن‌و ڕاگوێزان‌و تواندنەوە، هەوڵ ئەدا حوکمەکەی خۆی بپارێزێ‌و سەر بە نەتەوەو دین‌و مەزهەبەکانی تر دابنەوێنێ، هەڵبەتە لەژێر سایەی حوکمێکی وەهادا ناکۆکیەکان ئەتەقنەوە، شەڕ هەڵئەگیسێ، شۆڕش‌و بەرەنگاری دەست پێ ئەکاو هەست بە چەوساندنەوەو زوڵم‌و زۆرلێکران قوڵ ئەبنەوە لەناخی دەرونی کۆمەڵانی خەڵکاو گیانی جیابوونەوەخوازی‌و خۆدابڕین بەهێز ئەبێ‌و مەسەلەی ئەمنی ستراتیجیش نەك هەر دابین نابێ، بەڵکو پاشەرۆژی دەوڵەتەکە ئەکەوێتە ژێر هەرەشەی ڕووخان‌و هەڵوەشان‌و پارچە پارچە بوونەوە"[18].

### ٣- ئەمنی دیمۆگرافی:

ئەمنی دیمۆگرافی هەر دەوڵەتێك پەیوەندی بەم فاکتەرانەی خوارەوە هەیە:

* دابەشبوونی دانیشتوان: یەکێکە لەو فاکتەرانەی کار لەئەمنی دیمۆگرافی هەر دەوڵەتێك دەکا، چونکە خراپ دابەشبوونی دانیشتوانی دەوڵەتەکە بەسەر ناوچە جیاجیاکاندا، چ لەکاتی ئاشتی‌و چ لەکاتی جەنگدا کارێکی سەلبی تێدەکا. چڕبوونەوەی دانیشتوان لەچەند شوێنێکی دیاریکراوی دەوڵەتەکەدا، دەشێ لەکاتی جەنگدا زەرەرو زیانی گەورەی بەر بکەوێ، بەتایبەتی لەسەردەمی ئێستادا کە چەکی ئەتۆمی لەئارادایە، جگە لەرۆکێت، فرۆکەی جەنگی نوێ کە دەشێ لەماوەیەکی کەمدا زۆربەی نیشانەکان بپێکێ‌و دانیشتوانی دەوڵەتەکە قەڵاچۆ بکا. هەروەها ئەو ناوچانەی چۆڵ‌و هۆڵن، یا چڕی دانیشتوانیان زۆر کەمە، بەئاسانی لەلایەن هێزی دەوڵەتانی ترەوە داگیر دەکرێ، بەڵام ئەو ناوچانەی چڕی دانیشتوانیان زۆرە، دەبنە لەمپەرێکی مرۆیی‌و بەزەحمەت داگیر دەکرێن.

* دابەشبوونی جۆر: واتە دابەشبوون بە پێی نێرو مێ، کە ئەمیش فاکتەرێکی ترە لەو فاکتەرانەی کار دەکەنە سەر ئەمنی دیمۆگرافی هەر دەوڵەتێك. شتێکی ئاشکرایە تا ئێستا، تەنانەت لەوڵاتە پێشکەوەکانیشدا، ڕۆڵی پیاو لە بەرهەمهێناندا بەتایبەتی لەبواری پیشەسازی قورس‌و سەنگیندا لەهی ئافرەت زیاترە، چونکە ئافرەت لەبەر هەندێ هۆی فسیۆلۆجی ناتوانێ

---

[18]- یەکێتی نیشتمانی کوردستان، دەزگای ڕاگەیاندن، عێراق‌و مەسەلەی کورد، چاپخانەی شەهید ابراهیم عەزۆ، ١٩٨٤، ل١٠-١١.

گەڵێ کار بکات، بێجگە لەوەی چەندین نەخۆشیو بیماری ژنانە هەیە، کە پیاو تووشیان نابێت، بەجۆرە بڕی کاری ساڵانەی پیاو لەهی ئافرەت زیاتر دەبێ. وێڕای ئەوەی لەپێکهێنانی سوپاشدا پیاو دەوری سەرەکیو بنچینەیی دەبینێو ڕۆڵی ئافرەت لەم بوارەدا زۆر کەمە. هەر بۆیە زیادبوونی ڕێژەی هەر کامێك لەنێرو مێ کار دەکاتە سەر ئەمنی دیمۆگرافی دەوڵەتەکە.

* دابەشبوونی کۆمەڵایەتی - پیشەیی: پەیوەندی بەجۆری دابەشبوونی پیشە جۆراوجۆرەکانی دانیشتوانەوە هەیە، کە لەڕێگەی چڕی پیشەییەوە دیاری دەکرێ، وەك کشتوکاڵ، ئاژەڵداری، پیشەسازی (بەجۆرە جیاوازەکانیەوە)، بازرگانی. ئەم جۆرە دابەشبوونە جۆری ژیانی ئابووری - کۆمەڵایەتی دانیشتوانی دەوڵەتەکەو ئاستی پێشکەوتن یا دواکەوتنی نیشان دەدا.
* دابەشبوون بە پێی تەمەن: ئەمەش پەیوەندی بەجۆری دابەشبوونی تەومەنەکانەوە هەیە لەچاو ژمارەی دانیشتواندا، دیارە ئەو دەوڵەتانەی ڕێژەو هێزی کارکردنیان (ئەو تەمەنانەی لەنێوان ١٥ - ٦٠ ساڵدان) زیاترە لەچاو ڕێژەی منداڵو پیر لەدەوڵەتەکەدا، دەشێ ببێتە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی ژیانو زیاتر پێشخستنی دەوڵەتەکەو پێکەوەنانی هێزی سوپایی گەورەتر لەو دەوڵەتانەی ڕێژەی منداڵ ( لە خوار تەمەنی ١٥ ساڵیەوە)و پیر (لەسەروو تەمەنی ٦٠ ساڵیەوە) یان لەڕێژەی گەنجەکان زیاترە، چونکە ئەو دەوڵەتانەی ڕێژەی منداڵیان زۆرە، بەخێوکردنی ئەو ڕێژە زۆرە کار لەئاستی گوزەرانی گشت دانیشتوان دەکا، هەروەك ئەو دەوڵەتانەی ڕێژەی پیریان بەرزە، هەرچەندە، دەلالەت لەبەرز بوونەوەی ڕادەی ناوەنجی تەمەنەکان دەکا، بەلام لەدەوڵەتەکە دەبێتە هۆی بارگرانی بەسەر دەوڵەتەکەوە، جگە لەوەی ناتوانێ لەو ڕێژەیە هێزی سوپاییو هێزی کار پێکەوە بنێ.
* کۆچکردنی دانیشتوانی وڵاتانی تر بۆ ئەو دەوڵەتە، ئەویش فاکتەرێکی ترە کە کار لەئەمنی دیمۆگرافی دەکا، بەتایبەتی ئەگەر بە ئەندازەیەکی زۆر بێ، چونکە لەلایەکەوە شوێنەواری فیکریو ئایدیۆلۆجی دەوڵەتو نەتەوەکانی خۆیان بەسەر خەڵکی ئەو دەوڵەتەدا بەجێ دێڵن، لەلایەکی تریشەوە دەشێ بۆ کاری خراپکاریو جاسوسی، سودیان لێ ببینرێ بەتایبەتی ئەوانەی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن یا هەمیشەیی لەو دەوڵەتەدا دەمێننەوە.

* کۆچکردنی دانیشتوانی ئەو دەوڵەتە، بەتایبەتی زاناو پسپۆڕو خوێندەوارو خاوەن بڕوانامەکان، کارێکی زۆر سەلبی دەکاتە سەر دەوڵەتەکە، چونکە ئەمانە لەجەردی ستراتیجی هەر دەوڵەتێکدا بەفاکتەرێکی بەهێزی ئەو دەوڵەتە حساب دەکرێن.
* جۆری دانیشتوانی لەرووی ئاستی زانستیو رۆشنبیریو هۆشیاری چینایەتیو نیشتمانیەوە، چونکە ئاشکرایە ئەو گەلەی خوێندەواری زیاتر هەیە، دەتوانێ لەبواری پیشەسازیو پەرەپێداندا لەگەڵ نوێترین جۆری تەکنەلۆجیدا هەڵسوکەوت بکاو بەکاری بێنێو پێویستی بە پسپۆڕو شارەزای بیانی نابێ.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم کەلەبەرانە دەشێ دەوڵەتێك چەند رێو شوێنێك بگرێتە بەر:

١- سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی دانیشتوانی دەوڵەتەکە بەسەر ناوچە جیا جیاکاندا، بەجۆرێ کەمتر زەرەرو زیانی بەربکەوێ.
٢- گەشەپێدانی ئابووریو بەرزکردنەوەی ئاستی زانستیو تەکنەلۆجی دانیشتوان.
٣- دانانی رێوشوێنی گونجاو بۆ دیاریکردنی رێژەیەکی، وا کە هەمیشە نەتەوەکە بە گەنجی بمێنێتەوە.
٤- رێگەگرتن لەکۆچی نەتەوەی تر، بەتایبەتی کە بەئەندازەیەکی زۆر بێت.
٥- باشترکردنی ژیانی زاناو پسپۆڕو شارەزایان تا رێگای چوونەدەرەوە هەڵنەبژێرن.

د – ئەمنی ئایدیۆلۆجی:

ئەمنی ئایدیۆلۆجی بریتییە لەو چالاکیو رۆڵانەی دەوڵەتو داموو دەزگا ئیعلامیو فیکریەکانی کە دەوڵەتو دامەزراوە پیشەییو گەلیەکان لەپێناوی پاراستنی ئایدیۆلۆجی دەوڵەتو پێویستی پاراستنی بەها فیکریو ئایدیۆلوجیەکانی رژێمەکە دەیگێڕن، بۆ بەهێزکردنی توانای ئەو داموو دەزگایانە لەبواری رووبەڕووبونەوەی مەترسیە فیکریو سیاسیەکانو لەباربردنی کۆششو شوێنەوارەکانی کە مەبەستێتی تەبایی کۆمەڵایەتی لەق بکا، جێگیربوونی سیاسی بشڵەقێنێو تەلاری ئایدیۆلۆجی دەوڵەتەکەش هەڵبتەکێنێ.

گومان لەوەدا نیە کە ئایدیۆلۆجیا دەورێکی کاریگەر لەژیانی گەلانو دەوڵەتاندا دەگێڕێو فاکتەرێکی بەهێزیشە لەپێکەوەنانو دروست کردنی دەوڵەتی نەتەوەییدا، چونکە ئەو بیروباوەڕو ئایدیۆلۆجیایەی دەربڕی بەرژەوەندیە، بنچینەیەکی پتەوو هۆیەکی کاریگەر بۆ کۆکردنەوەی گەلەکەو دروستکردنی یەکێتیەکی پتەوو قایم، کە بناغەیەکی بەهێزی دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی دەبێ.

هەر دەوڵەتێکی دنیا هەوڵی پاراستنی ئایدیۆلۆجیای خۆی دەدا، بەرگری لێ دەکاو بگرە هەوڵی بڵاوکردنەوەشی دەدا لە وڵاتانی دەوروبەردا، جا بەهەر شێوەیەك کەشیاوو لەبارو لواو بێ، چونکە بڵاوبوونەوەو بڵاوکردنەوەی بیروباوەرەکەی لە جیهاندا، یا لەناوچەکەدا، دەبێتە هۆیەك بۆ زیاتر جێگیرکردنو بەهێزکردنی بەرژەوەندیەکانی لەناوچەکەو جیهاندا.

هـ- ئەمنی سیاسی:

ئەمنی سیاسی بریتیە لە بەرئەنجامو رەنگدانەوەی پرۆسەی کارلێککردنێکی بەردەوامی ئاستەکانی: سوپایی، ئابووری، ئایدیولۆجی ئەمنی قەومیو پایەیەکی بنچینەیی ستراتیجی ئەمنی قەومیشە. واتە: ئەمنی سیاسی بریتیە لە ئەمنی رژێمە سیاسیەکەو بەهێزکردنیو بەدیهێنانی یەکێتی نیشتمانیو جێگیرکردنی سیاسیو دابینکردنی ئامانجەکانی ئەمنی قەومی لەبواری سیاسیدا. بەو پێیە ئەمنی سیاسی بریتیە لەو رێو شوێنانەی دامو دەزگاکانی دەوڵەتو دەزگا ئەمنیەکانی پێی هەڵدەستێ لەپێناوی لەباربردنی مەترسیە ناوەکیەکانو سڕینەوەی شوێنەوارە زیانبەخشەکانی، لەپێناوی زیاتر جێگیرکردنو دامەزراندنی باری ناوخۆ بۆ ئەوەی دەوڵەت دەرفەتێکی لەباری بۆ بڕەخسێو بتوانێ لەبواری سیاسەتی دەرەکیدا رۆڵی خۆی وازی بکا.

روونو ئاشکرایە نەبوونی ئارامی سیاسیو ناتەبایی کۆمەڵایەتی لەهەر دەوڵەتێکدا، بڕواو متمانەی دەوڵەتانی تر بەو دەوڵەتە شلۆق دەکا، هەر بۆیە ئەرکی سەرەکی ئەمنی سیاسی پاراستنی باری جێگیربوونی سیاسیە لەدەوڵەتەکەدا، دیارە تێڕوانین بۆ مەسەلەی ئەمنی سیاسی هەر دەوڵەتێك، جا جۆری رژێمەکەی هەرچیەك بێ، پەیوەندی بە سروشتی چینایەتی رژێمەکەو فەلسەفەی تایبەتی حوکمڕانی ئەو رژێمەوە هەیەو هەر لەو روانگەیەشەوە

سەيری جۆری كێشەو گیروگرفتەكان دەكا، هەر بەو پێیەش، جۆرو شێوەی چارەسەركردنیان بۆ دەدۆزێتەوە.

هەندێ دەوڵەت لەڕێگەی سەركوتكردنی پارتو ڕێكخراوە سیاسیەكان، جولاتەوە كۆمەڵایەتیەكان، قەدەغەكردنی ئازادی سیاسیو سەربەستیو جێگیركردنی ڕژێمی تاكە حیزب دەیەوێ ئەمنی سیاسی خۆی جێگیر بكاو قایمو پتەوی بكا، لەكاتێكا هەندێ دەوڵەتی تر لەڕێگەی بەدیهێنانی دیموكراسی سیاسیو دادپەروەری كۆمەڵایەتیەوە پایەكانی ئەمنی سیاسی خۆی بەهێزو جێگیرو پتەو دەكا.

## فەسڵی دووەم

# ئەمنی قەومی عەرەب لەباری سەرنجی بەعسەوە

### ١-٢-١: پێناسە کردنی بەعسیانەی چەمکی ئەمنی قەومی

بەر لەوەی باری سەرنجی بەعس لەمەڕ چەمکی ئـەمنی قـەومی بخەینـەڕوو، باشتر وایە کورتە مێژوویەکی پەیدابوونو سەرهەڵدانی بەعس، زەمینە ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتیو ئایدیۆلۆجیەکانی لێك بدەینەوە، هەروەك نۆڕینی بـەعس بـۆ مەسـەلەی نەتـەوەو کەمـە نەتـەوەکان، مەسـەلەی دیموکراسـیو کێشـە کۆمەڵایەتیەکان یەکالا بکەینەوە، تا باشتر، بەشـێوەیەکی روونـترو دیـارتر پـەی بەبنەما فیکریو ئایدیۆلۆجیو ستراتیجیەکانی بەعس ببەن.

### ١- چەردەیەك لە مێژووی بەعس

لە ناوەڕاستی چلەکانی ئەم سـەدەیەدا، لەسـوریا، لـەبارودۆخێکی ئـابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی دواکەوتودا جوڵانەوەیـەکی نەتەوەپەرسـت بـە نـاوی "جوڵانـەوەی بەعسـی عـەرەب" واتـە: جوڵانـەوەی ژیاندنـەوەی عـەرەب، بەقۆستنەوەی ئـەو بۆشـاییە سیاسـیو ئایدیۆلۆجیـەی ئەوسـا سـەری هەڵـداو لەدەروازەیەکی نەتەوە پەرەستانەی قاڵبوو لـەناو بوتـەی نازیزمـدا هاتـە کـۆڕی ژیانی سیاسی نەتەوەیی عەرەبەوە. جوڵانەوەی بەعسـی عـەرەب هێشـتا لـەتافی خۆڕێکخستندا بوو، نەیتوانی بوو بنکەیەکی رێکخراوەیی، سیاسی، کۆمەڵایەتی لەناو جەماوەری عەرەبدا پێکەوە بنێ، کە یەکەمین کۆنگرەی دامەزرێنەری خـۆی لە٧ی نیسانی ١٩٤٧دا بەست کە تیایـدا هێڵـە گشـتیەکانی سـتراتیجی خـۆی

داڕشتو بەبەرنامەیەکی هەمەلایی نازیانەوە، بۆ گۆڕینی باری ژیانی عەرەبو یەکگرتنەوەی نەتەوەیی عەرەب، هاتە کۆڕی ململانێی سیاسیو فیکریەوە. لەو کۆنگرەیەدا ناوی جولآنەوەکە کرا بەپارتی بەعسی عەرەبی، کە ئەویش لەساڵی ١٩٥٣دا لەگەڵ پارتی سۆسیالیستی سوریا یەکیان گرتو بەجۆرە حزبی بەعسی سوسیالیستی عەرەبیان پێکهێنا.

"بەعس وەکو جولآنەوەیەکی نەتەوە پەرەست خۆی بەخاوەنی بیروباوەرێکی گشت لایەنە (شمولی) دائەنێ، ئاواتو ئارەزوەکانی باڵی نەتەوە پەرەستی بەرچاو تەنگو توندڕەوی بورجوازی عەرەب دەرئەبڕێ.

بەعس بۆ سازدانو کۆکردنەوەی خەڵك لەدەوری خۆی، کەڵك لەدواکەوتنی عەرەبو شکستو ژێر کەوتنەکانی وەرئەگرێ بۆ ختوکەدانی هەستی نەتەوایەتیو گرژکردنی دەماری ڕەگەزبازی تێیدا".

"بەعس لای وایە کەپەیامێکی نەمری (رسالة خالدة)ی هەیە بۆ مرۆڤایەتی، چونکە لەرووی بیرو هۆشەوە عەرەب لەمیللەتانی تر ژیرترە، لەشارستانێتیدا کۆنترە، هەر (٣) دینە ئاسمانیەکە لەخاکی ئەوانەوە داکەوتووەو لەدنیادا بلآوبوتەوە، زانستەکانی دنیا هەر لەفیزیاو کیمیاو پزیشکیەوە تا سەر فڕۆکەو مانگی دەستکردو کۆمپیوتەر لەپێشدا ئەوان دۆزیویانەتەوەو ئەوروپاو ئەمریکا لێیان دزیون، توانایەکی ئابووری زۆرو توانایەکی مرۆیی گەورەو سەرزەمینێکی جوگرافی پانو بەرینیان هەیە... بەو پێیە ئەتوانن ئیمپراتۆریەتێکی بەهێزی گەورە لەدنیادا پێك بهێنن".

"بەعس هەموو بیروبۆچونەکانی خۆی لەسەرچاوەی ڕەگەزپەرەستیەوە هەڵئەهێنجێ، وە هەوڵئەدا گیانی خۆبەزلزانینو بەسوك سەیرکردنی میللەتانی تر، گیانی داگیرکەرانە، پەلاماردەرانەو دەستدرێژکەرانە، گیانی ترساندنو تۆقاندن، کوشتنو برینو بەزۆر سەرپێدانەواندن...لەناو گەلی عەرەبدا بچەسپێنێ، لەمەشدا تا ئەندازەیەکی زۆر لاسایی کارو کردەوەکانی هیتلەرو نازیەکانی ئەڵمانیاو سەهیونیەکانی ئیسرائیل ئەکەنەوە".

بەلآم "بیروباوەڕی فاشیزم، ئەگەر لەدنیای سەرمایەداریدا لەناو زەمینەیەکی مادی(پیشەسازی، زانستی، سیاسی، کۆمەلآیەتی، فەرهەنگی....) پێشکەوتوی دامەزراو لەسەر بنچینەی شارستانێتیەکی دێرینە، لەباوەشی کۆمەڵێکا هاتە دنیاوە، کە بەڕواڵەتیش بێ، هەندێ نەریتی دیموکراتیو ڕێزلێنانی ئازادیو مافی

مرۆڤی تێدا چەسپیبوو، بەڵام لەوڵاتانی دنیای سێیەمدا بیروباوەڕی هاوچەشنی فاشیزم (وەکو بیروباوەڕی بەعس لەدنیای عەرەبدا، تۆرانیزم لەتورکیا، پان - ئێرانیزم لەئێران...) کە لەناو زەمینەیەکی ماددی (دەرەبەگی، خورافی، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگی...) دواکەوتوی دامەزراو لەسەر بنچینەی (استبدادی شرقی) دێرینە کە مرۆڤ هیچ نرخێکی تیا نیە چاوی هەڵهێناوە، لەبەر ئەوە هێڵە تیۆری‌و فیکریە ستراتیجیەکانیان گەلێك دواکەوتوترو بۆش ترن لەوانی ئەوروپا، هەروەك لەسیاسەت‌و تاکتیك‌و ئوسلوبی کارکردن‌و جێ بەجێ کردنیشیان گەلێك دواکەوتوترو بۆشترن لەوانی ئەوروپا، هەروەك لەسیاسەت‌و تاکتیك‌و ئوسلوبی کارکردن‌و جێبەجێکردنیشیان گەلێك دڕندەترو سادەترە لەوان، چونکە جگە لەوەی هەموو میراتی دڕندانەو خوێناوی‌و دزێوی ئستبدادی شەرقیان بە کەلەپور هەڵگرتوتەوە، لەهەمان کاتدا هەموو تەجروبەکانی بزووتنەوەو حیزب‌و دەوڵەتە فاشی‌و نازی‌و فالانگی‌و سەهیوتیەکان‌و هەموو تەجروبەکانی بزوتنەوەو حیزب‌و دەوڵەتە رەگەز پەرەستەکانی رۆدیسیاو جنوبی ئەفریقاو ئەمریکاشیان کردوتەسەر مەشقی کارکردنی خۆیان"[19].

حیزبی بەعس لە١٩٦٣/٢/٨دا بۆیەکەمین جار لەعێراقدا دەسەڵاتی سیاسی گرتە دەست، بەڵام چەند مانگێکی نەخایاند روخاو رکێفی دەسەڵاتی سیاسی لەدەست دەرهێنرا.

هەروەها حیزبی بەعس بۆ جاری دووەم لە١٩٦٨/٧/١٧، بەپێ پیلانێکی ئیمپریالیستانە، دەسەڵاتی سیاسی لەعێراقدا گرتەوە دەست‌و تا ئێستا رکێفی ئەو دەسەڵاتەی هەر بەدەستەوەیە.

"حیزبی بەعس لەسەرەتادا ئاوات‌و ئارەزووەکانی باڵی رەگەزپەرەستانەی وردە بورجوازی‌و بورجوازی ناوەنجی عەرەبی ئەنواند لەپێناوی یەکخستنی هەموو نەتەوەو نیشتمانی عەرەبدا لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی عەرەبی نەتەوەپەرستی گەورەو فراواندا کە سەروەریەکانی رابردووی ئیمپراتۆریەتە عەرەبیەکان زیندو بکاتەوەو لەدنیای سەردەمدا شوێنێکی زل بگرێ. بەڵام حیزبی بەعس کە خۆی نەك هەر بە(ئالتێرناتیف/ بدیل)ی حیزبە شیوعیەکانی وڵاتانی عەرەب‌و ئایدیۆلۆجی بەعسی بە(بدیل)ی ئایدیۆلۆجی مارکسیزم - لینینیزم دائەنا، هەر

---

[19]- ناوەند، پەیامی کۆمەڵە: لەنێوان خاچی چەماوەی نازی‌و داڵی باڵشکاوی بەعسدا، گۆڤاری کۆمەڵە، ژمارە (٢)، خولی٣، شوباتی ١٩٨٥، ل٤-٥.

زۆر زوو لەمەیـــدانی دوژمنایـــەتی کۆمـــۆنیزمو مارکســـیزمدا لەئـــەنجامی متوربەکردنی بە بیروباوەری نازیو فاشی هەم لـەرووی پێکهـاتنی چـینایەتیەوە گۆڕاو، هەم لەرووی دارشتنی ئایدیۆلۆجیەوە لـەقاڵبی تایبـەتی خۆیـدا مـەیی. لەوەی کەئاواتو ئارەزووەکانی وردە بورجوازیو بورجوازی ناوەنجی رەگەزپەرەستی عەرەب دەربرێ، ئامانجو قازانجە چینایەتیەکانی باڵی رەگەزپەرستو چاوچـنۆکو فراوانخوازی بورجوازی ناوەنجیو گەورەی عەرەبی ئەنواندەوە، لەرێگـەی ئوسـلوبو تاکتیکە تایبەتیەکانی خۆیەوە (وەکو کنـەکردن لەجەیشـدا، هاوکـاری لەگـەڵ کۆنەپەرستو رەگەزپەرەستەکانی عـەرەبو نۆکـەرانی ئیمپریـالیزمو کودەتـاو پیلانگێرانو دەسبڕینو پاشـقولگرتن، بڵاوکردنـەوەی تـرسو تـیرۆر، هـەڵگرتنی دروشمی بریقەداری بۆشو هەڵخەڵەتێنەر... هتد) توانی دەسەڵاتی سیاسی بگرێتە دەستو دەوڵەت بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، ئیتر سروشـتی چـینایەتی بـەجۆرێکی بنەڕەتی گۆڕاو لەژێر دەستەوە بوو بەدەسەڵاتدارو کاربەدەست.

دەسەڵاتی سیاسی حیزبی بـەعس، دەسـەڵاتی سیاسـی بورجـوازی بیرۆکراتـی مشەخۆرەو پایەی کۆمەڵایەتیشـی لەسـەر هـەمان توێـژی دیـاریکراوی چـینی بۆرجوازی دامەزراوە، کـە لەمەیـدانی ئابووریـدا بەرهەمهێنـەر نیـە، لـەبواری زانستو تەکنۆلۆجیاشدا بێ هونەرو مایە پوچـە. نـە بنچـینەیەکی پیشەسـازی پتەوو نە تەجروبەیەکی تەکنۆکراتیو نە سەرمایەیەکی مالیو نـە رابردوویـەکی درێـــژی تێکۆشـــەرانەی نیـــە، بـــەڵکو بـــەتاکتیکی پیلانگێـــڕانو (انقلابی عسکري) لەئەنجامی زەوتکردنی دامو دەزگاکانی دەوڵـەتو دەرامـەتو سامانی وڵاتو دامەزراندنو بەهێزکردنی بناغەی سەرمایەداری دەوڵەتدا، توانی لەناو هەموو چینو توێژە کۆمەڵایەتیەکانی عێراقدا توێژێکی بیرۆکراتی نوێ پـێ بگەیـەنێ، کـە بەچـەندین (إمتیـازات) پێکـەوەی بەسـتوونو لەبـەری رەنجـی کۆمەڵاتی خەڵکو دەرامەتو سامانی وڵات ئەژینو مانو چارەنووسی گرێداون بە مانو چارەنووسی دەسەڵاتەکەوە"[20].

---

[20]-ماهی: شۆڕشو دەسەڵاتی سیاسی، گۆڤاری کۆمەڵە، ژمارە٣، خولی٢، ئازاری ١٩٨٥، ل١٧ـ ١٩.

**ب- نۆڕینی بەعس بۆ مەسەلەی نەتەوەو کەمە نەتەوەکان:**

بۆچوونی بەعس بۆچارەسەر کردنی کێشەی نەتەوایەتیو مەسەلەی کەمە نەتەوەکان "و ئوسلوبو ڕێوشوێنو تاکتیکەکانیشی، دەبێ هەر لەم چوارچێوەیەدا سەیر بکرێ کە بەشێکە لەهێڵە گشتیەکانی ستراتیجی گشتیانو لەسەرچاوەی بیرو باوەڕەکەیانەوە هەڵقوڵاوە، کە تا ئەندازەیەکی زۆر لەچەندین رووەوە، لەتاکتیكو ڕێوشوێنو ئوسلوبەکانی نازیەکانو فاشیەکانو سەهیوتیەکان دەچێ لەجۆری ڕەفتارکردندا لەگەڵ گەلە ژێر دەستەکانیاندا، بەلاّم لێرەدا بەشێوەیەکی دواکەوتوترو دڕندانەتر"[21].

مادەی (٧)ی بەرنامەی بەعس، کە لەیەکەمین کۆنگرەی دامەزراندنیدا، پەسەند کراوە، بەمجۆرەی خوارەوەو سنووری نیشتمانی عەرەب دەکێشێ: " نیشتمانی عەرەب ئەو پارچە زەمینەیە کە نەتەوەی عەرەبی تیا دادەنیشێ، کە لەنێوان چیاکانی تۆڕوسو چیاکانی پشتکۆو کەنداوی بەسرە، دەریای عەرەبو چیاکانی حەبەشەو بیابانی گەورەو ئوقیانووسی ئەتڵەنتیكو دەریای ناوەراستدا درێژ دەبێتەوە"[22].

بەمجۆرە هەموو کوردستانی باشوور، کە ئێستا کوردستانی عێراقەو باشووری سودان، کە نیشتمانی (زنجیە)کانەو بەشێکی زۆری نیشتمانی گەلانی ئەفریقی بەخاکی عەرەبو نیشتمانی عەرەبو عەرەبستان دادەنێ، لەکاتێکا ئەم خاکانە مولکی لەمێژینەی گەلانو نەتەوەکانی خۆیانن و نە عەرەبی تیا نیشتەجێەو نە نەتەوەیەکی تێدایە لەهیچ روویەکەوە لەعەرەب بچێ.

بەعس لەناوەڕاستی چلەکانەوە، کەهێشتا جوڵانەوەیەکی بچوك بوو لەسوریاو نەبوو بوو بەهێزێکی بەهێزو هێشتا ئومێدی ئەوەشی نەبوو دەسەلاّتی سیاسی بگرێتە دەست، بیروبۆچونی تایبەتی هەبووە لەسەر کەمینەکان کە بەئاشکرا لەنامیلکەی (اهداف وغایات)دا ساڵی (١٩٤٥)دا نووسیویێتی. هەروەك

---

[21]- ناوەند، پەیامی کۆمەڵە: لەنێوان خاچی چەماوەی نازیو داڵی باڵشکاوی بەعسیدا، گۆڤاری کۆمەڵە، ژمارە٢، ژمارە٣، شوباتی ١٩٨٥، ل٦ ـ ٧.

[22]- الحسني، عبدالرزاق: تاريخ الاحزاب السياسية العراقية، بيروت، ط٣، ١٩٨٣، ص٣٠٥ كە لەکتێبی " نضال البعث"، الجزء٤، ط٣، شباط ١٩٧٦ وەریگرتووە.

لەیەکەمین کۆنگرەی دامەزراندنی حیزبی بەعسدا یەکێك لەو مەسەلانەی باسیان لێکردووە، کێشەی کەمینەکانو جۆری رەفتارکردن بووە لەگەڵیان.

لەنامیلکەی (اهدافو غایات)دا نوێرینی بەعس لەمەڕ کێشەی کەمە نەتەوەکان زۆر روونو تاشکرا دەردەکەوێ: " کەمە نەتەوە ناعەرەبەکان کە ناتوانرێ لەکۆمەڵی عەرەبدا بتوێنرێنەوەو بەشێوەیەکی تەواو بە عەرەب بکرێن دەخرێنە ژێر یاسای تایبەتیەوە، کە ئەركو مافەکانیان بەشێوەیەکی وا دیاری دەکا نەتوانن زیان بەبەرژەوەندییەکانی عەرەب بگەیەنن، مافی دەوڵەتی عەرەبیشە کە هەر کاتێ بیەوێ، ئەوانەی زیان بەبەرژەوەندیەکانی دەگەیەنن، دەریان بکاو دروستکردنی قوتابخانەو دامەزراندنی رێکخراوو رۆژنامە بەزمانەکەیانو بانگەوازی نەتەوایەتیشیان لێ قەدەغە بکا"[٢٣].

هەروەها مادەی (١١)ی بەرنامەی بەعس، کە لەیەکەمین کۆنگرەی دامەزراندنیدا پەسەند کراوە، دەڵێ: " هەر کەسێ داوا بکا، یا بچێتە پاڵ دەستەیەکی رەگەزیەوە، یا بە مەبەستی (استعماری) هاتبێتە نیشتمانی عەرەبەوە، ئەوا لەنیشتمانی عەرەب دەردەکرێ"[٢٤].

بەجۆرە بەعس کورد بە بیانیو بە میوانی خاکی عەرەب دادەنێ، هەروەك زنجیش بە بیانیو میوانی خاکی عەرەب دادەنێ، وهەق دەدا بە دەوڵەتەکەی خۆی هەر کاتێ بیەوێ ئەمانە دەربکاو دەربەدەریان بکاو زمانو نەریتو کەلەپووریان لێ قەدەغە بکا، هەر لەبەر ئەوەی لەتوانایاندا نیە لە بوتەی نەتەوەی عەرەبدا بیانتوێننەوەو بە عەرەبیان بکەن، لەکاتێکدا عەرەب هاتوتە سەر خاکی ئەو گەلانەو بە زۆری زۆرداری خاکەکەیانی داگیر کردووە، دیارە بەعس دەردی کورد دەڵێ لەسەر ئەو سەرەتایە دەڕوا کە "ماڵ لەخانە خۆی حەرامە" و "میوان بۆ خۆی خانە خۆیە".

بەعس بە درێژایی تەمەنی خۆی لەنوسینەکانیدا باسی کەمینەکانی کردووە لەوانە کورد، باسی خەتەری کەمینەکانی کردووە بۆ سەر نەتەوەی عەرەبو خاکی عەرەبو ئەندامەکانی خۆی لێ وریا کردۆتەوە کە هەوڵی تواندنەوە یاخود دەرکردن، یا لەناوبردنی بدەن. دوا تریش هەموو نووسینو بۆچونەکانی هەر درێژە کێشانی هەمان بیروبۆچونی پێشویان بووە.

---

[٢٣]- حركة البعث العربي: اهداف و غايات، ١٩٤٥، ص٣، لەبڵاوکراوەیەکی ترەوە وەرگیراوە.

[٢٤]- الحسني، عبدالرزاق: سەرچاوەیەکی پێشووتر، ل٣٠٥ .

بەعس بەر لەوەی خۆی بێتە سەر حوکم، یەکێك لەو ڕەخنانەی لەحکومەتەکانی عێراق‌و سوریای ئەگرت، جۆری ڕەفتارکردنی ئەو حکومەتانە بوو لەگەڵ کەمینەکان کە گوایە حکومەتی "شعوبین"و نەتەوەیی‌و نشتیمانی نین، چونکە وەکو پێویست خۆیان خەریك ناکەن بە سەرکوتکردنی کوردو تواندنەوەیەوە.

بەعس پێش ئەوەی بێتە سەر حوکم، ئەندامەکانی خۆی وا فێر کردبوو لەهەر کوێیەکی کوردستاندا کاربەدەست بوو، چی لەدەست هات بۆ جێبەجێکردنی بۆچونەکانی بەعس دژی کەمینەکان بیکات.

کاربەدەست‌و ئەفسەرە بەعسیەکان لەناوچەکانی جزیرەی کوردستانی سوریاو کاربەدەست‌و ئەفسەری بەعسیەکانی عێراق لەموسڵ‌و بادینان‌و کەرکوك‌و خانەقین......... پێش ئەوەی بێنە سەر حوکم هەرچیەکیان لەدەس هاتبێ بۆ تەنگ پێ هەڵچنین‌و ئازاردانی کوردەکانی ئەو شوێنانەو دەرکردن‌و دوورخستنەوەیان درێغیان نەکردووە. "مستەفا حەمدون کە ئەندامێکی حیزبی بەعس بوو و ئێستا فەرمانبەرە لەعێراق لەساڵەکانی ١٩٥١-١٩٥٢ فەرمانداری حەرەس حدودی کوردستانی سوریا بوو لەگەڵ تورکیا، بە دەیان دێهاتی کوردی چۆڵ کردو بە زۆر عەشایەری عەرەبی لێ نیشتەجێ کرد"[٢٠]

محەمەد تالب هلال کە ئەفسەرێکی بەعسی بوو لە سوریا، کتێبێکی لەسەر جۆری تواندنەوەو لەناو بردن‌و دەرکردنی کورد لەسوریا نوسیبوو، لەدوایی دا بوو بە بنچینەی سیاسەتی حکومەتی سوریا لەمەسەلەی کورددا.

بەو پێیە لەدوای١٩٦٣وە پشتێنەی سەوزیان لەناوچە کوردنشینەکانی سنووری تورکیا – سوریا بە قولایی (١٠) کم دروست کردو زەویوزاری جوتیارو ئاغا کوردەکانی ئەوێیان زەوت کردو عەرەبیان هێنایە شوێنەکانیان‌دواتر سەرژمێرێکیان سازکرد بۆ ئەوەی مافی هاوولاتیبوون لەکوردەکانی سوریا بسێننەوە، لەئەنجامی ئەوەدا مافی هاوولاتیبوونیان لەزیاتر لە(١٢٠) هەزار کورد سەندەوەو مافی خاوەنێتی خانوو ماڵ، مافی خوێندن لەقوتابخانەو زانکۆ، مافی کاسبی‌و کارکردن لەدائیرەو دامەزراوەکانی دەوڵەتیان نەما.

---

[٢٠]—یەکێتی نیشتمانی کوردستان، دەزگای ڕاگەیاندن، کەرکوك‌و سیاسەتی تەعریب، چاپخانەی شەهید ابراهیم عەزۆ، ١٩٨٥، ل٧.

بەعس لەدوای ئەوەی هاتە سەر حوکم، ئیتر هەلی بۆ هەلکەوت بۆچوونە فیکری‌و تیۆریەکانی خۆی بخاتە مەیدانی جێبەجێ کردنەوە، لەوانە جۆری رەفتارکردن لەگەڵ نەتەوە بچوکەکان کە یەکێکیان کورد بوو.
دوای ئەوەی بەعس توانی دەسەڵاتی سیاسی خۆی قایم بکا، پتەوو بەهێزی بکا، زۆر ئاشکراترو بە ڕاشکاوی تر باسی کێشەی کەمە نەتەوەکانی کردووەو ڕاستیە مێژوویی‌و جوگرافی‌و زانستیەکانی بە جۆرێ شێواندووە، کە لەگەڵ هێڵە گشتیەکانی بۆچوونە فیکری‌و ستراتیجیەکانی خۆیدا یەکگرتوو و یەکانگیر بێ. ئەوەتا لەیانزەمین کۆنگرەی قیادەی قەومی دا، زۆر ئاشکراو بێ پەردە، دەڵێ: "بە نسبەت ئەو نەتەوانەی کە قورساییەکی ڕێژەییان هەیە لەدانیشتوانداو لەچوارچێوەی نیشتمانی عەرەبدا دەژین‌و زمان‌و خاسیەتی ئەوتۆیان هەیە کە هەندێ جیاوازی تێدایە لەگەڵ زمان‌و خاسیەتی نەتەوەی عەرەبدا، وەکو نەتەوەی کورد، دەبێ تایبەتێتی نەتەوەیی ناوچەییان قبوڵ بکەین‌و هەر ناکۆکیەکیش کە لەنێوان ئەم تایبەتێیانەو جوڵانەوەی نەتەوایەتی عەرەبدا هەن چارەسەر بکرێن، چونکە ئەو جۆرە نەتەوانە زمان‌و خاسیەتی جیایان لەزمانی عەرەبی هەیە، لەهەمان کاتیشدا، هەڵەیە کە بە نەتەوەی جیاواز لەنەتەوەی عەرەب دابنرێن، بە هەمان ڕادە کە نەتەوەی فارس یا هیندی یا نەتەوەکانی تر جیاوازن، لێ چونکە ئەو نەتەوانەی خاوەن زمان‌و خاسێتی جیان لەزمان‌و خاسیەتی عەرەبی‌و لەدێر زەمانەوە لەنیشتمانی عەرەبدا دەژین، وەکو نەتەوەی کورد، بە چەندین پەیوەندی ڕەگدا کوتراو بە نەتەوەی عەرەبەوە بەستراوەتەوە، کە هەر لەپەیدابوونیانەوەو بە درێژایی ئەو ماوەیە لەو خاکەدا ژیاون کە لەرووی مێژوویەوە بە نیشتمانی عەرەب ناسراوە، وێرای ئەو جیاوازیانەی کە هەن لەنێوان پارچەکانی‌و ناوی ئەو دەوڵەتانەی لەسەری دامەزراوە، ئەمەش مەسەلەیەکی گرنگە، چونکە ئەو خاکەی ئەو نەتەوانەی لەسەر دەژین بەشێك بووە لەو دەوڵەتە عەرەبیانەی لەهەزاران ساڵەوە عەرەب لەسەری دروست بووە، کە دواییینیان دەوڵەتی گەورەی عەبباسی بوو، ئەو خاکە، لەهەمان کاتیشا، ئەو نەتەوانەی لێ نیشتەجێ بووە. بەم پێیە پێناسی عەرەبی بوونی ئەو خاکەی کە ئەو نەتەوانەی لەسەر دەژین لەرێگەی ستەم‌و داگیرکردن‌و لێسەندن نەبووە، بەڵکو لەئەنجامی واقیعێکی

مێژوویی دا بووە کە هەزاران ساڵی خایاندووە، ئەمەش بە درێژایی ئەو ماوە مێژووییە درێژخایەنە هیچ مشتو مڕو کێشەیەکی لەسەر دروست نەبووە"[٢٦].

ئەم بۆچوونەی بەعس لەمەڕ نەبوونی جیاوازی، یا بوونی جیاوازیەکی کەم، لەنێوان نەتەوەی کوردو نەتەوەی عەرەبو حسابکردنی کورد بە عەرەب، نوێڕینێکی شۆڤێنیانەو نازانستیانەیە، چونکە دەیان سەرچاوەی مێژوویی نووسەرانی عەرەبو گەلانی تر جیاوازی گەلی کورد لەنەتەوەی عەرەبو گشت گەلانی جیهانو جیاوازی کوردستان لەعەرەبستانیان ساغ کردۆتەوە، ئەگەر ئەمە بکرێتە پێوادانگ کە کورد لەگەڵ عەرەبدا لەژێر سایەی یەك دەوڵەتی ئیسلامیدا ژیاون، دەبێ بەم گوێرەیە عەرەب بن، ئەوا دەبێ نەتەوەکانی تری وەکو: فارس، ئازەر، بلووچ، تورك ئەمانیش هەر عەرەب بن، یا دەبێ عەرەبیش فارس بن چونکە بەر لەپەیدا بوونی موسڵمانەتی بە درێژایی مێژوو زۆربەی ناوچەکانی عەرەبستان بەشێك بووە لەئیمپراتۆریەتەکانی هاخامەنشیو ئەخمینیو ساسانی فارسی، یا بەلانی کەمەوە دەبێ تورك بن، چونکە بە درێژایی چەندین سەدە لەژێر سایەی دەوڵەتی عوسمانیدا ژیاون کە دەوڵەتێکی توركی بووە.

ئەمە جگە لەوەی " واقیعی دیموگرافی دانیشتوانی ئێستای عێراقو لێکۆڵینەوەی ئارکیۆلۆجی شوێنەوارە کۆنەکانی سەرزەمینی عێراقو مێژووی ڕووداوەکانی ناوچەکەو سەرژمێری ڕاستو دروستی دانیشتوان ئەو ئیدیعایە نەك جارێك، بەڵکو هەزار جار بە درۆ دەخاتەوە، چونکە کورد لەعێراقدا سەرەڕای ساڵە های ساڵە هەوڵی تواندنەوەو دەربەدەرکردن لەخاکی بابو باپیرانی خۆی، هێشتا لەلایەنی کەمەوە سێ-یەکی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنێت، وەلەڕووی زەمانیشەوە، چەند هەزار ساڵ بەر لە هاتنی عەرەب لەگەڵ مەوجاتی سامی لەجزیرەی عەرەبییەوە بەرەو عێراقی ئێستا گەلی کورد لەنیشتمانی خۆیدا نیشتەجێ بووە"[٢٧].

---

[٢٦]– حزب البعث العربي الاشتراكي، القيادة القومية: مسالة الاقليات القومية في الوطن العربي، ج٢، مطابع دار الثورة، بغداد، ١٩٨٠ ص٦-٧.

[٢٧]– یەکێتی نیشتمانی کوردستان، دەزگای ڕاگەیاندن، عێراقو مەسەلەی کورد، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، ١٩٨٤، ل٣.

### ج- بەعس و مەسەلەی دیموکراسی

"ئەگەر بگونجێ کارەساتی سیاسی لەژیانی میللەتاندا بە کارەساتی سروشتی وەکو بومەلەرزەو لافاوو وەیشومەی سەرما بشوبهێنرێ، ئەوا بێگومان دەستگرتنی بەعس بە سەر دەسەلاتی سیاسیو دامو دەزگاکانی دەولەتدا لەعێراق ئەبێ بە گەورەترین کارەساتی سیاسی لەقەلەم بدرێ، کە لەمێژووی دوورو نزیکی خۆیدا هێشتا دەسەلاتدارێتی وا درندەو خوێناوی بە خۆیەوە نەدیوە"[٢٨].

لەوەتەی حیزبی بەعس ڕکێفی دەسەلاتی سیاسی گرتوتە دەست، گەلی عێراق بە گشتیو نەتەوەی کورد بە تایبەتی لەسەختترین ڕۆژانی ژیانی سیاسی-کۆمەلایەتی خۆیاندا دەژین. حیزبی بەعس کە بڕوای بە ڕژێمی تاکە حیزبی سەرکردە هەیە، دامو دەزگاکانی دەولەت، سوپای بۆ خۆی پاوان کردووە، ناهێلێو ئامادەش نیە هیچ حیزبو ڕێکخراوێکی سیاسی بەشداری بکا لەدەسەلاتی سیاسیدا، خۆ ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش ڕێگای هەندێ حیزبو ڕێکخراوی دابێ، بەشداریەکی کەم لەدەسەلاتی سیاسیدابکەنو هەندێ دەزگای کارتۆنی یا وەزارەتی بێ دەسەلاتی پێ سپاردبن، هەر بە مەبەستێکی تاکتیکیو لەپێناوی بە دیهێنانی ئامانجێکی دیاریکراودا ئەمەی کردووە، جگە لەوەی ویستویەتی زەمینەی پاکۆدانو تەفروتوناکردنو لەبەینبردنیان ئاسانتر بکا. بۆ ئەمەش چەندین فرتو فێلو قۆرتو پێچو تەلەکەبازی بە کارهێناوەو چەندین تەجروبەی تفتو تالی لەگەل چەندین حیزبو ڕێکخراوی عێراقیو گەلی کوردیشدا هەیە.

بەعس لەمەڕ مەسەلەی دیموکراسی بیرو بۆچوونەکانی خۆی لەئایدۆلۆجیاو بنەما فکریەکانی خۆی هەلگوزراوە، کە ئەویش لەسەر بنچینەیەکی دیماگۆگیانە بینا کراوە. بەعس بۆ ئەوەی وا نیشان بدا کە ژیانی دیمۆکراسی لە عێراقدا هێناوەتە دی، چەندین دەزگای کارتۆنی داتاشیوە، وەك:"ئەنجومەنی نیشتمانی"و "ئەنجومەنی یاسادانانی ناوچەی کوردستان" کە گوایە ئەم دەزگایانە هەلبژاردەی گەلو دەربڕی ویستو ئارەزوویانن. لەکاتێکا ئەم دەزگایانە جگە لەوەی هیچ دەسەلاتێکی یاسادانانیان نیە، فڕیان بەسەر گەلی عێراقو نەتەوەی کوردیشەوە

---

[٢٨]– ماهی: شوڕشو دەسەلاتی سیاسی، سەرچاوەیەکی پێشووتر، ل٢٦.

نیەو زۆربەی هەرە زۆریان نۆکەرو ئەڵقە لەگوێی بەعس، ئـەمن، ئیسـتخباراتن‌و بە زۆری زۆرداریش خەڵك ڕاکێشی سندوقەکانی دەنگدان دەکەن.

تەنانەت هەڵبژاردنی ڕێکخراوە پیشەییە بە ناو دیموکراتیەکان‌و نەقابەکانیش لەژێر چاودێری دام‌و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی بەعسـدا ئـەنجام دەدرێـن‌و ویسـت‌و ئیرادەی خۆشیان بە سەر بەشـداربواندا فـەرز دەکـەن‌و ئەوانـەش کـە بەشـداری دەنگدان نەکەن، یا بە سپیتیێ کارتی بەشداربوون لەسندوقەکە بهاون، هەڕەشەی برینی سەرچاوەی ژیان‌و دەرفەتی کاریان لێ دەکەن.

بەعس ڕژێمێکـی دیکتـاتوری فاشـی وای دامەزرانـدووە، کـە نـەك ڕێگـەی دیموکراسـی بـۆ گەلەکـەی‌و ئوپۆزسـیون نـادا، بگـرە ئەوانـەش کـە لەگـەڵ حیزبەکەیدان ناوێرن، نە بە ئاشـکراو نـە بـە دزی، هەڵوێسـتی خۆیـان لەمـەڕ ڕووداوەکانی ژیان‌و دەوڵەتەکە دەرببڕن. بـەعس بـە شـێوەیەك چـرای دیموکراسـی خەفە کردووەو نوزەی لەبەر بزووتنەوەی دیموکراسی بڕیووە، کە بچوکترین دەنگـی بێزاری بە توندترین شێوە وەڵام دراوەتەوەو بە سەختترین شێوە بە گژیـدا چـوەتەوە، ژمارەی زیندانەکانی عێراق هەمیشە لەزیاد بوندایەو هەر هەمووشیان سیخناخ کـراون، دەشـێ بـوترێ عێـراق خـۆی بوتـە زینـدانێکی گـەورە. لەسـێدارەدان‌و گوللەباران کردن، کوشتن‌و لەبەینبردنی پەی دەرپەی دانیشـتوان، لەسـەر جـادەو کۆڵانان، لەقوتابخانەو زانکۆکان، لەگوندو شـارەکاندا بوتـە بەشـێك، بەشـێکی سەخت‌و ناهەموار، ڕۆژانەی گەلی عێراق بە گشتی‌و نەتەوەی کورد بە تایبەتی.

هەڵگرتنی هەر جۆرە بیرو بڕوایەك، جگە لەبیرو بـڕوای بـەعس، قەدەغەیـەو قەستی سەری لەسەرە. بەعس بە گوێرەی ئەو سـەرەتایە هـەنگاو هەڵـدێنێ کـە دەڵێ:" ئەوەی لەگەڵما نەبێ دژمە"، هەر بۆیە بە بەعسیکردنی زۆرەملێ خەڵك گەیشتۆتە فراوانترین‌و بەرزترین قوتە. ئەوانەی نەبنـە بەعسـی دەرفـەتی کـارو ژیانیـان نـابێ. خوێنـدکارو قوتـابی لەهەنـدێ کـۆلێج‌و ئامۆژگـای گرنگـدا وەرناگرێن، نانێردرێنە دەرەوەی وڵات بۆ تەواوکردنی خوێندن، کاریان نادرێتێ تـا نەبنە بەعسی، بەعس دەیەوێ هەموو بوارەکانی ژیانی خەڵك هـەر لەسیاسـیەوە تا ئابووری، هـەر لەکۆمەڵایەتیـەوە تـا فەرهـەنگی بـە بەعسـی بکـات‌و هـەر کەسێکیش بیروباوەڕی بەعس وەرنەگرێ، بە توخمی دژی گەل‌و نیشتمان دادەنرێ‌و بە مەترسی بۆ سەر ئەمنی قەومی عەرەبی دەژمێردرێت.

بەعس هەر بەوەوە نەوەستاوە مافە مرۆیی‌و دیموکراتیە گشتیەکانی خەڵك زەوت بکا، لێیان بستێنێتەوەو نەهێڵێ، بەڵکو دەست لەهەموو کاروبارێکی کەسی‌و خێزانیەوە وەردەدا. دەیەوێ تەون‌و تۆڕی جاسوسی لەهەموو خێزان‌و ماڵێکدا رایەڵ بکا، پایەکانی خێزان لەبەر یەك بترازێنێ‌و هەڵی بوەشێنێتەوە.....
منداڵان لە(طلائع)و مێرمنداڵان لە(فتوة)و گەنجان لەریزی لاوان، جەیشی شەعبی، رێکخراوە پیشەییەکان‌و ئافرەتان لەیەکێتی ئافرەتاندا رێکبخاو بەبیروباوەڕی بەعس پەروەردەیان بکاو رایان بهێنێ. رژێمی بەعس بەکردەوە (لائحة)ی مافەکانی مرۆڤی ژێر پێ خستووە، کە زۆربەی دەوڵەتان‌و گەلانی دنیا دانیان پی داناوە، لەوانەش دەوڵەتی عێراق.
بەعس لەرێگەی بڵاوکردنەوەی فەسادی ئەخلاقی‌و فەسادی ئیداریەوە گەلی عێراقی تووشی مەینەتیەکی بێ ئەندازەو چەرمەسەریەکی گەورە کردووە، کە خەباتێکی درێژخایەنی گەرەکە تا ریشەکێش‌و بنەبڕ بکرێ.
ئەمە بەگشتی چەمکی بەعسە بۆ مەسەلەی دیموکراسی، وێرای ئەوەی عێراق خۆی قوڵاییەکی مێژوویی نیەو تا ئێستاش نەریتی دیموکراتیانەی تێدا جێگیر نەبووە.

### د- پێناسەی ئەمنی ستراتیجی

لەبەر ئەوەی تا ئێستا دەوڵەتێکی یەکگرتووی نەتەوەیی لەئارادا نیە، بۆیە یەکێك لەخاسیەتە سەرەکیەکانی ئەمنی قەومی عەرەب دابەشبوونیەتی بەسەر دوو ئاستی نیشتمانی‌و نەتەوایەتیدا:

- ئەمنی نیشتمانی: کەبریتیە لەو رێوشوێنانەی هەر دەوڵەتێکی عەرەبی بەجیا لەدەوڵەتە عەرەبیەکانی تر دەیکات بۆ پاراستنی ئاسایشی دەوڵەتەکەی خۆی‌و جێگیرکردنی پایەکانی ئەمنی قەومی‌و لەبەینبردنی ئەو مەترسیانەی رووبەرووی دەبێتەوە.
- ئەمنی قەومی یا ئەمنی نەتەوەیی: کەبریتیە لەو رێوشوێنانەی گشت دەوڵەتە عەرەبیەکان دەیگرنەبەر لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجەکانی ئەمنی قەومی عەرەبیداو رەواندنەوەی ئەو مەترسیە ناوەکی‌و دەرەکیانەی رووبەرووی دەبنەوە.

جا لەبەر ئەوەی ئەو ڕێوشوێنانەی ڕژێمی بەعس دەیانگرێتە بەر، لەباری سەرنجەی بەعسەوە، هەم لەپێناوی بەدیهێنانو پاراستنی ئەمنی نیشتیمانی عێراقو پاراستنی ئەمنی قەومی عەرەبیدایە، بۆیە ئێمە لەجیاتی بەکارهێنانی ئەو دوو چەمکە زاراوەی ئەمنی ستراتیجی بەکار دێنین کە دەربڕی پەیوەندی نێوان هەر دوو چەمکەکەیە. بەمجۆرە ئەمنی ستراتیجی عێراق بریتیە لەو ڕێوشوێنانەی ڕژێمی بەعس دەگرێتەبەر لەپێناوی پاراستنی عێراقو تەرەکردنی مەترسیە ناوەکیو دەرەکیەکانیو هەروەها ئەو ڕێوشوێنانەش کە بۆ نەهێشتنی مەترسیەکانی سەر نەتەوەی عەرەبو نیشتمانی عەرەب دەگیرێتە بەر.

ئەمنی ستراتیجی ئێستای عێراق، لەسەر بنچینەی جیاوازی ڕەگەزایەتیو جیاوازی حیزبایەتیو جیاوازی مەزهەبی دانراوە، لەسەر زەوتکردنی مافە مرۆییو دیموکراتیەکانی گەل دانراوە، هەروەك لەسەر بنچینەی فراوانخوازیو دەستدرێژیو پەلاماردانی گەلانی ترو نەتەوەی ترو دەوڵەتانی تری ناوچەکە دارێژراوە، واتە: ئەمنی ستراتیجی عێراق لەڕوانگەیەکی شۆڤێنیستیو ڕەگەزپەرەستانەی پەلاماردەرانەوە دامەزراوە، کەقەستی داگیرکردنی خاکی گەلانی ترو هەڵلوشینی نەتەوەو کەمە نەتەوەکانی سنووری دەوڵەتی عێراقو گشت نیشتمانی عەرەبە.

## ١-٢-٢: هەڵسەنگاندنی مەترسیەکانی سەر دەوڵەتی عێراق لەڕوانگەی بیری ستراتیجی بەعسەوە.

بۆ ئەوەی پەی بەجۆرو ئەندازەی ئەو مەترسیانە ببەین کە هەڕەشە لەدەوڵەتی عێراق دەکەن، پایەکانی دەلەقێننو پاشەڕۆژی دەخەنە مەترسیەوە، پێویستە ئاوڕێك لەمێژووی دروستکردنی ئەو دەوڵەتە بدەینەوە، ئەو هۆو فاکتەرانە دیاری بکەین کەڕۆڵی گرنگیان وازی کردوە لەدروستکردنی دەوڵەتی عێراقدا کە بەم شێوەیەی ئێستا هەیە.

### أ-ئاوڕدانەوەیەك لەمێژووی دروستکردنی دەوڵەتی عێراق

١- "ئەگەرچی مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەرگوزەشتەو داستانی چەندین ئیمپراتۆریەتو پاشایەتیو خەلافەتو سەڵتەنەتی وەکو هەخامەنشیو ئەخمینیو ساسانیو ئیسلامیو ئەمەویو عەباسیو عوسمانیو سەفەویو قاجاریمان بۆ

ئەگێڕێتەوە، بەڵام لەتاریخی کۆن و نوێدا هەرگیز مێژووی دەوڵەتیك بەدی نـاکرێ کەناوی دەوڵەتی عێراق بووبێ.

راستە کەپایتەختی دەوڵەتی عەباسی لەشاری بەغـدا بـووە، بـەڵام دەوڵـەتی عەباسی دەوڵەتێکی ئیسلامی پان و بەرین بووە هەر لەشمالی ئەفریقاوە تا سنوری هندستانی گرتوتەوە، بەڵام خەلافەتی عەباسی لەقەوارەو قالب و نـاوی دەوڵـەتی عێراقدا نـەبووە، بـەلکو لـەژێر نـاوی خەلافـەتی عەباسـی و ئـەمیرولموئمنینی موسڵمانانی دنیادا بووە[29].

هۆلاکـۆ لەسـاڵی (١٢٥٨)دا شـاری بەغـدای گـرت و خەلیفـەی عەباسـی موستەعسەمی کوشت و بەسەر دەوڵەتی عەباسیدا زاڵ بووو عێراقی خستە ژێـر رکێفـی قەڵـەمڕەوی ئیمپڕاتۆریـەتی مەغۆلیـەوە، کەزۆریـەی دەوڵـەتانی ئـەم ناوچەیە، ئەو کاتە بووبوونە بەشێك لەو ئیمپڕاتۆریەتە پان و بەرینـە، تـا سـاڵی (١٣٣٧) کە شێخ حەسەنی جەلایری تێیدا جێگیربوو و دەوڵەتی تێدا دامەزراند، کەسەر بەخێڵی جەلایری مەغۆلی بوو.

لەسـاڵی (١٣٨٣)دا تـەیموری لـەنگ بەغـدای گرتـەوەو بەسـەر دەوڵـەتی جەلایریدا زاڵ بوو تا ساڵی (١٥٠٨) کە شا ئیسماعیلی سەفەوی داگـیری کـرد و خستیە ژێر دەسەڵاتی خۆی و بووە بەشێك لەدەوڵـەتی شـیعەی سـەفەوی. سـاڵی (١٥٣٤) سـوڵتان سـلێمانی قـانونی تـوانی بەغـدا بگرێـت و سـەفەویەکانیش دەربکا، بەڵام فارسەکان، لەسەردەمی شاعەباسدا، لەسـاڵی (١٦٢٣)دا دووبـارە بەغدایان گرتەوە، تا ساڵی (١٦٣٨) کە سوڵتان مرادی چـوارەم خسـتیەوە ژێـر قەڵەمڕەوی دەوڵەتەکـەی خـۆی و تـا سـاڵی (١٩١٧) لـەژێر دەسـەڵاتی تورکـە عوسمانیەکاندا مایەوە.

بەمجۆرە لەدوای تێشکان و نەمانی دەوڵەتی عەبباسی عێـراق، بەبـەردەوامی، بەشێك بووە لەئیمپراتۆریەتە گـەورەکانی ناوچـەکە، وەك: مـەغۆلی، سـەفەوی، عوسمانی و هیچ کاتێك دەوڵەتێك بەناوی دەوڵەتی عێراقەوە لەئارادا نەبووە، بگرە عێراق وەکو موستەعمەرەیەکی یەکگرتوو، یا ویلایـەتێکی یـەکگرتوش لـەژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکاندا نەبووە، بەلکو لەچەندین ویلایەت پێکهـاتووە: بەسـرە، بەغدا، موسڵ.

---

[29]- یەکێتی نیشتمانی کوردستان، عێراق و مەسەلەی کورد، سەرچاوەیەکی پێشووتر، ل١.

٢- تێکچوونی هاوسەنگی تەرازوی هێزەکانی نێوان دەوڵەتە سەرمایەدارە ئیمپریالیستەکانی دنیا، لەئەنجامی بەهێزبوونو گەشەکردنی هەندێکیانو لاوازبوونو گەشەنەکردنی هەندێکی تریاندا، بوو بەهۆی ئەوەی سەر لە نوێ بیر لەدابەشکردنەوەی دنیا بکەنەوە بەسەر خۆیانداو لەئەنجامی ئەمەشدا یەکەمین جەنگی جیهان هەڵگیرسا. دەوڵەتی عوسمانی کە ئەو کاتە دەوڵەتێکی شەقو شڕو پانو بەرین بوو، چووە پاڵ ئەڵمانیاو دەوڵەتەکانی میحوەرەوە، دەوڵەتە سوێندخۆرەکانیش کەدەمێك بوو بڕیان لەوە دەکردەوە قەڵەمڕەوی ئەو دەوڵەتە لەنێوان خۆیاندا دابەش بکەن بەشێوەیەك بەرژەوەندیە ئابووری، سیاسیو ستراتیجیەکانی هەموویان بەجۆرێ بپارێزێ کە هەموویان پێی قایل بن، کەوتنە بەستنی رێککەوتننامەو پەیمانی نهێنی لەسەر کەولی "پیاوە نەخۆشەکە"ی عوسمانی. هەر بۆیە لە٢٦/٤/١٩١٦دا پەیمانێکی نهێنی لەنێوان روسیای تزاریو فەرەنسادا بەسترا کەبەپەیمانی سۆزانۆف – بالیۆلۆج ناسراوە، کەبەگوێرەی ئەم پەیمانە بەشی هەر کام لەم دوو دەوڵەتە لەقەڵەمڕەوی عوسمانیەکاندا دیاری کرا. بریتانیەش کە بەم پەیمانەی زانی بەهەڵەداوان پەیمانێکی نهێنی بەئاگاداری روسیا لەگەڵ فەرەنسادا لە٩و ١٦/٥/١٩١٦دا مۆرکرد کە بەپەیمانی سایکس – بیکۆ ناسراوە. بەگوێرەی ئەم پەیمانە:

* روسیا: کە بەکردەوە کوردستانی خۆرهەڵاتی بەدەستەوە بوو، هەندێ لەکوردستانی باکوریشی بەرکەوت.
* فەرەنسا: بەرەزامەندی هەموویان بەشی هەرە زۆری سوریاو بەشێکی فراوانی ئەنادۆڵو ویلایەتی موسڵ (کوردستانی باشوور)ی بەرکەوت، بەمەرجێ بەرژەوەندیەکانی بریتانیا بپارێزێ.
* بریتانیاش: دەست بەسەر ئەو ناوچەیەدا بگرێت کەدەکەوێتە باشووری سوریاوە تا عێراقو ئەو ناوچەیەش کە دەکەوێتە نێوان کەنداوی فارسو ناوچەی عێراق.

لەساڵی ١٩١٧دا شۆڕشی ئۆکتۆبەر بنچینەی رژێمی تزاری لەروسیا هەڵتەکاندو هەلومەرجێکی نوێ لەسەر ئاستی جیهان هاتە کایەوە. دەوڵەتی تازە دامەزراوی سۆڤێت هەموو ئەو رێککەوتننامەو پەیمانە نهێنیانەی ئاشکرا کرد کەپەیوەندییان بەدابەشکردنەوەی دنیاوە هەبوو لەنێوان دەوڵەتە

ئیمپریالیستەکاندا، هەروەك وازیشی لەهەمور مافەکانی خۆی هێنا، کە بەگوێرەی ئەو پەیمانانە دیاری کرابوو دەستیشی لەو شوێنانە هەڵگرت.

یەکەمین جەنگی جیهان بەتێکشکانی ئەڵمانیاو دەوڵەتەکانی میحوەر کۆتایی هات، سەڵتەنەتی عوسمانی پارچە پارچە کرا. بریتانیاو فەرەنساو ئەمریکا وەك سێ دەوڵەتی زلهێزی دنیا لەمەیدانی جەنگەکە دەرچوون و دنیایان بەگوێرەی قازانج و بەرژەوەندیە ئابووری، سیاسی و ستراتیجیەکانی خۆیان سەر لەنوێ دابەشکردەوە. شەڕ وەستانی مەدروس کە لە ۱۹۱۸/۹/۳۰دا مۆرکرا، مافی دا بەدەوڵەتە سوێندخۆرەکان هەر شوێنێکی ستراتیجی، کەئاسایشی سوێندخۆران بخاتە مەترسییەوە، داگیری بکەن، هەر بەم پێیەش هەردوو ویلایەتی بەسرەو بەغدا درا بەبریتانیا.

بەڵام بریتانیا مرخی لەویلایەتی موسڵ (کوردستانی باشوور) خۆش کردبوو، چونکە دەیزانی ناوچەکە بایەخێکی ئابووری زۆری هەیەو خاوەن پەترۆڵێکی زۆرە، بۆیە ئەو دەرفەتەی قۆستەوە کەفەرەنسا لەگێژەنگی هەندێ تەنگ و چەڵەمەدا دەتلایەوە، بۆئەوەی زۆر بۆ فەرەنسا بێنێ و ویلایەتی موسڵی لێ دابڕێ، ئەوەبوو لە ۱۹۱۸/۱۲/۱دا لوید ژۆرژی سەرەك وەزیرانی بریتانیا توانی کلیمانسۆی سەرەك وەزیرانی فەرەنسا لەخشتە بەرێت و کڵاوی لەسەر بکات و پەیمانی سایکس بیکۆی پێ بگۆڕێ بەجۆرێکی وا کوردستانی باشوور بەر بریتانیا بکەوێ. هەر لەساڵی (۱۹۱۹) شدا، دوای ئەوەی تورکە عوسمانیەکان ویلایەتی موسڵیان چۆڵ کرد، بریتانیا توانی دەست بەسەر ئەو ویلایەتەدا بگرێت.

دەوڵەتە سەرمایەدارە ئیمپریالیستەکان کاتێ بۆیان دەرکەوت ناتوانن لەرێگەی داگیرکردنی سوپایی راستەوخۆوە حوکمی ئەو ناوچەیە بکەن، وێڕای ئەوەی، هەرچەندە بڕاوەی جەنگیش بوون، زەرەرو زیانێکی ئابووری و مرۆیی زۆریشیان لێ کەوتبوو، بۆیە لەپێناوی ئەوەی بۆ درێژترین ماوە بەرژەوەندیەکانی خۆیان لەو ناوچانەدا بپارێزن و دانیشتوانی ناوچەکەش قایل بکەن، لە ۱۹۲۰/٤/۲٥دا رێککەتننامەی سان ریمۆیان مۆرکرد کە بەگوێرەی ئەو رێککەوتننامەیە چەندین ماندات و دەوڵەتۆکەی بێ سیادەو موستەعمەرەیان پێکهێنا لەوانە: عێراق و سوریاو لوبنان و فەلەستین و ئوردون و عەرەبستانی سعودی و میرنشینەکانی کەنداو، کە هیچیان نەپاساوی بوونە دەوڵەتیان هەبوو نە پێداویستیەکانی ژیانی دەوڵەتیش. بەجۆرە نەیانهێشت گەلانی ناوچەکە

بەئامانجە نەتەوەییەکانی خۆیان بگەن، بەڵکو لەبەینی دەسەڵاتو نفوزی ئینگلیزو فەرەنسادا دابەشیان کردن. لەوەشدا کورد وەکو یەکێك لەنەتەوەکانی ناوچەکە بەئامانجە نەتەوەییەکانی خۆی نەگەیشت، بەڵکو نەتەوەو نیشتمانەکەیان بەوپەڕی بێ ویژدانیەوە دابەش کرد.

٣- لە١٠/٨/١٩٢٠دا پەیمانی سیڤەر لەنێوان دەوڵەتە سوێندخۆرەکاندا بەسترا بۆ لێکۆڵینەوە لەو کێشەو گیروگرفتانەی هەن، چ لەبەینی سوێندخۆرەکان خۆیانداو چ لەکێشەی نەتەوەو کەمە نەتەوە بێ ماف کراوەکان. بەندەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤)ی ئەم پەیمانە مافەکانی گەلی کوردی سەلماند واشی لەتورکیا کرد، کە ئەگەر کوردەکان بیانەوێ لەماوەی ساڵێکدا جیا ببنەوەو دەوڵەتێك بۆ خۆیان پێکەوە بنێن، بەمەرجێ کۆمەڵی نەتەوەکان قایل بنو بگەنە ئەو بڕوایەی کەکوردەکان دەتوانن دەوڵەت بەڕێوە بەرن، ئەوا تورکیا دەبێ دەستبەری ئەو مافانە بکاتو واز لەهەموو مافو بەرژەوەندیەکانی خۆی بێنێ لەو ناوچەیەدا. هەر بەگوێرەی ئەم پەیمانەیەو بە پێی دەقی مادەی (١٣٢) تورکیا وازی لەهەموو مافو موڵکێکی هێنا کە لەعێراقدا هەیبوو، هەروەها بەگوێرەی لائحەی ئینتدابی بریتانی لەعێراقدا، کە لەپەیمانی سیڤەردا پەسەند کرابوو، سەبارەت بەکورد لەمادەی شانزەهەمدا دەڵێ: "هیچ شتێك لەم ئینتدابە، رێ لەوە ناگرێ، کە مونتەدب حکومەتێکی سەربەخۆی ئیداری لەناوچە کوردیەکاندا دابمەزرێنێ، وەك خۆی دەیەوێ".

بەڵام بریتانیا کە مونتەدبی عێراق بوو، هەر لەو کاتەشەوە کە عێراقی گرتبوو، لەساڵی ١٩١٧دا، تووشی چەندین گیروگرفت ببوو:

* لەلایەکەوە دانیشتوانی ویلایەتی بەسرە قایل نەبوون بەوەی لەگەڵ ویلایەتی بەغداد بکرێنە یەك ماندات، چونکە "مەسەلەی بەیەکەوە بەستنی ئەم دوو ویلایەتە - با عەرەبیش بن - کارێکی زۆر گران بوو، دەمراستو دەسەڵاتدارەکانی هەردوو ویلایەت سەریان بۆ یەك شۆڕ نەدەکرد......لەپڕ، هەرا سەری هەڵداو عەرەبەکانی ویلایەتی بەسرە داوای جیابوونەوەو حکومەتی سەربەخۆیان دەکرد"[٣٠]. هەروەها داوایان دەکرد "ئەنجومەنی یاسادانانی سەربەخۆ بۆ ویلایەتی بەسرە دابنرێ، ئەم ناوچەیە پۆلیسی خۆی

---

[٣٠]- حەمید عەلی خالید: لە دوو توێ یاداشتی شاردا، لەبڵاوکراوەکانی یەکێتی نوسەرانی کوردستان، زنجیرەی کتێبی کوردی(٢)، چاپخانەی دەزگای ناوەندی رۆشنبیری کۆمەڵە، ١٩٨٤، ل٩.

هەبێ، کاروباری ناوخۆی ویلایەتەکە بدرێتە دەست خەڵکی بەسرە هەتا بەوەش رازی نەبوون کە ئەوانەیان بدرێتیێو سەر بەویلایەتی بەغدا بن، بەڵکو داوایان دەکرد لەهیندستانەوە سەرپەرشتی بکرێن"[31].

* نیشتمانپەروەرە عەرەبەکان بەوە قایل نەبوون کە ئینگلیز حوکمیان بکاتو تەنانەت بەرژێمی ماندانیش قایل نەبوونو بەرواڵەتێکی تری داگیرکردنی ئیمپریالیستانەیان دەزانی. بۆیە هەوڵی رووبەڕووبوونەوەو بەگژاچوونیان دەداو دەیانویست هەرچی زووترە، وڵاتەکەیان رزگار بکەنو حکومەتێکی نیشتمانپەروەرو سەربەخۆی تیا دابمەزرێنن.

* دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراق، کە لەهەردوو ویلایەتی بەسرەو بەغدا پێکهاتبوو، پاساوی ژیانی نەبوو، قەوارەیەك بوو ئینگلیز خۆی دایتاشی بوو بۆ ئەوەی بەرژەوەندیە ستراتیجیەکانی خۆی لەناوچەکەدا دابین بکا، هەر بۆیە کەڵکەڵەی ئەوەی کەوتە سەر ویلایەتی موسڵ (کوردستانی باشوور) بخاتە سەر ئەو دەوڵەتە تازە داتاشراوەی خۆی، لەوەشدا چەند مەبەستێکی هەبوو:

ـ کوردستانی باشوور ناوچەیەکی کشتوکاڵی دەوڵەمەندە، سەرچاوەیەکی پەترۆڵی زۆری هەیە، هەر بۆیە لکاندنی ئەم ناوچەیە بە عێراقەوە دەبێتە هۆی دابینکردنی سەرچاوەی ژیان بۆ ئەو دەوڵەتە، بێجگە لەوەی بەرژەوەندیە پەترۆڵیەکانی خۆشی دابین دەکا، هەر بۆیە ئەدمۆندس، کەئەفسەری پەیوەندی بوو لەو کۆمیتەیەدا کۆمەڵەی گەلان بۆ لێکۆڵینەوە لەکێشەی موسڵ لەساڵی (١٩٢٥)دا پێکیان هێنا بوو، دەڵێ: "هیچ کامێکمان گومان داینەگرتین کەئێمە ئێستا لەشەڕی مانو نەماندایین بەنسبەت عێراقەوە، چونکە بەدڵنیایەوە، لەبەر هەندی هۆی ئابووریو ستراتیجی، بەسرەو بەغدا ناتوانن بەبێ موسڵ دەوڵەتێکی ماقوڵ پێك بێنن"[32].

ـ بریتانیا مەبەستی بوو قەپاخێکی شاخاوی بۆ ئەو دەوڵەتە دروست بکا بۆ ئەوەی لەهێرشو پەلاماری هێزەکانی رۆژهەڵاتو باکوور بیپارێزێ، واتە لەئێرانو تورکیا، چونکە دەوڵەتی عێراق سنوورەکانی کراوە بوون، هیچ کۆسپو بەربەستێکی سروشتی قایمو بەهێز نەبوو بیپارێزێ، کوردستانی

---

[31]— هەمان سەرچاوە، ل١٠.

[32]— ادموندز، سي. جي: كردو ترك و عرب، ترجمة: جرجيس فتح الله، من منشورات التآخي، مطبعة التايمس، ١٩٧١، ص ٣٥٦.

باشووریش، ویّرای سەرچاوەی نەوت، قەپاخیّکی شاخاوی باش بوو بۆ ئەو دەوڵەتە، چونکە جگە لەوەی ئەم ناوچەیە بەشیّوەیەکی گشتی ناوچەیەکی شاخاوی سەختە، زنجیرە چیاکانیشی تایبەتمەندی خۆی هەیە. زنجیرە چیاکانی تۆرۆس و زاگرۆس لەباکوورو رۆژهەلاّتەوە لەگەلّ سنوورەکانی تورکیاو ئیّراندا هاوریّکن، کە ئەمەش بایەخیّکی گرنگی هەیە لەرووی سوپاییەوەو دەشێ بەباشترین شیّوە بەرگری لیّ بکریّ.

- پیّکەوە لکاندنی عیّراقی عەرەبیی و کوردستانی باشوور نزیکترین ریّگای دەریایی بۆ بریتانیا مسۆگەر دەکا، کە کەنداوی فارسەو نزیکترین شویّنی دەریاییە لەناوچە نەوتییەکانی کەرکوك و خانەقین، کە ئەمەش لەبواری سیاسیی و ئابووریدا قازانجیّکی زۆری هەیە بۆ بریتانیا. بریتانیا بۆ رووبەرووبونەوەی ئەو گیروگرفتانەی تووشی بووبوو تەنگی پیّ هەلّچنی بوو، چەندین ریّ و شویّنی گرتەبەر:

* لەلایەکەوە مژدەی دەدا بەکاربەدەستە کریّگرتەکانی کە هەولّی لکاندنی کوردستانی باشوور دەدا بە عیّراقەوە، ئەمەش لەو نامەیەدا دەردەکەویّ کە نویّنەری پایەبەرز لەعیّراقدا لە ٢٥/١٠/١٩٢٠دا بۆ یەکەم وەزارەتی نەقیبی ناردووە کەتیایدا باسی ئەوە دەکا کە بریتانیا هەولّی ئەوە دەدا کوردەکان بەعیّراقەوە ببەستیّتەوە.

* لەلایەکی تریشەوە هانی دەسەلاّتدارو دەرەبەگە کۆنەپەرستەکان و بازرگانەکانە عەرەبەکانی دەدا کەداوای ویلایەتی موسلّ بکەن و تەماحی نەوت و کشتوکالّ و ئاوو زەوی و زاری دەخەستنە بەر[٣٣]. ئەمەش لەو نامەیەدا نووسراوەو داوایان لیّ دەکا داوای ویلایەتی موسلّ بکەن، بۆ ئەوەی کوردستانی باشور بخریّتە سەر عیّراق و سنووریش بەشیّوەیەك دابنریّ کە عیّراق بپاریّزیّ.

* هەروەك لەلایەکی تریشەوە بۆئەوەی دەنگی نارەزایی خەفەو کپ بکەنەوە، نەخشەیان دانا بەزووترین کات، فەیسەلّی کوری شەریف حسیّن، کەخەلّکی حیجاز بوو و فەرەنسیەکان لەسوریا دەریان کردبوو، بهیّننە عیّراق و بیکەنە شا، نەك لە دانیشتوانی عیّراق شایەك هەلّبژیّرن.

[٣٣]– بۆ زیاتر شارەزایی بروانە: حەمید، عەلی خالد: سەرچاوەیەکی پیّشوتر، ل٩.

فەیسەڵ لە ۱۹۹۲/۷/۲۱دا کرا بەشای عێراق، بەڵام لەهەڵبژاردنیدا دانیشتوانی کوردستانی باشوور بەشداریان نەکرد، هەروەك دانیشتوانی ویلایەتی بەسرەش لالوت بوونو قایل نەبوون پێی، بەهەمان شێوە خەڵکە نیشتمانپەروەرەکانی عێراقی عەرەبیش ئەمەیان بەپیلانێکی تری بریتانیا دەزانی، بۆیە ئەوانیش پێیان ناخۆش بوو.

لە دوای ئەوە بریتانیا بەجددی کەوتە هەوڵی ئەوەی، ئەگەر بەزۆری زۆرداریش بێ، ویلایەتی موسڵ، واتە: کوردستانی باشوور بەعێراقەوە بلکێنێ تا بەرژەوەندیە پەترۆڵیو سیاسیو ستراتیجیەکانی خۆی بەباشترین شێوە مسۆگەر بکا، تەزووی خۆێنیش بخاتە جەستەی مردووە ئەو قەوارە داتاشراوەوە، بۆ ئەم مەبەستە شافەیسەڵ لە۱۹۲۱/۱۰/۹ چووە موسڵو ناردی بەدوای هەندێ دەرەبەگی کورددا و داوای لێکردن پشتی عێراقو بریتانیا بگرن، هەروەك هەندێکیشیانی دەم چەورکرد.

وێڕای ئەوەی بریتانیا بۆ ئەوەی کوردەکان هێور بکاتەوەو بەلای خۆیدا رایانبکێشێ، بۆ ئەوەی لەداهاتوودا ئەگەر دەنگ وەرگرتنی گشتی هەبێ، بەو لایەدا بشکێنەوە کەقازانجەکانی بریتانیا بپارێزێ، هەر بۆیە شێخ مەحمودی نەمریان لەهندستانەوە گەڕاندەوە عێراقو بردیانە کوتو پێشوازی رەسمیشیان لێکردو لە ۱۹۲۲/۹/۳۰دا بۆ جاری دووەم حکومڕانێتی کوردستانی باشوور لە سلێمانی دامەزرایەوەو شێخ کرایە پاشای کوردستان، ئەم حکومڕانێتیە ماوەی(۱۵۵) رۆژی خایاند. شایانی باسە کەشێخ لەساڵی ۱۹۱۸دا حوکمدارێتی یەکەمی کوردستانی دامەزراند کە تا ۱۹۱۹/۵/۱۹ی خایاند، کەتیایدا لەنەبەردەکەی بەردە قارەماندا دەستگیر کراو نەفی کرا بۆ هیندستان. واتە بەر لەوەی لەعێراقدا لەساڵی ۱۹۲۱دا بۆ یەکەمجار حکومەتی عەرەبی دروست بێ لەساڵی ۱۹۱۸دا لەکوردستانی باشووردا حکومەتی کوردستان هەبووەو سەربەخۆش بووە.

لەلایەکی ترەوە لە۱۹۲۳/۷/۲٤دا پەیمانی لۆزان بەسترا کە بەئاشکرا مافەکانی کوردی لەمەڕ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی سەربەخۆ تیا پێشێل کراو هەموو بەندەکانی پەیمانی سیڤەریش کە پەیوەندیان بەو مەسەلەیەوە هەبوو، هەڵوەشێنرایەوە. ئەو پەیمانە، لەبەندەکانیدا، هەر ئەوەندە دان بەمافی کوردا

دەنێ کە وەك تورکێك ئەویش مافی بەکارهێنانی زمانو کەلەپوری خۆی هەبێ، بتوانێ رۆژنامەو گۆڤار بەزمانی کوردی دەربکا.

بریتانیا بەجۆرێ کارەکانی خۆی ریکخستبوو، کە هەرچوتێك بێ کوردستانی باشوور بخاتە سەر عێراق، هەر بۆیە کۆمەڵەی گەلان بریاریدا وەفدێك بنێرێ تا لەکێشەکە بکۆڵێتەوە کەهەم تورکیا داوای ئەم ناوچەیەی دەکردو هەم عێراقو بریتانیاش داوایان دەکرد. "لەساڵی ١٩٢٤دا لەکۆبونەوەکانی ئەنجومەنی دامەزرێنەری عێراقدا یەکێ لەئەندامەکانی ئەنجومەن داوای لەبریتانیا کرد کە لەپشتگیریکردنی عێراق کەمتەرخەمی نەکاتو دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکا بۆ ئەوەی کوردستانی باشوور بخرێتە سەر دەوڵەتی تازە داتاشراوی عێراق"[٣٤].

هەروەها " شا فەیسەڵ لەوتارێکدا کە لەموسڵ خوێندرایەوە، وتی: حکومەتی بەغدا بەبێ کوردستانی باشوورو موسڵ، رۆژێك ناژی"[٣٥].

هەروەها شا فەیسەڵ لەیاداشتێکدا کە بۆ کۆمیتەی کۆمەڵەی گەلانی نوسیوەو ڤێرسن لەراپۆرتەکەی خۆیدا بەرزی کردوتەوە، دەنوسێ: "بۆیە، موسڵ بەنسبەت عێراقەوە لەجێگەی سەر دادەنێم بۆ هەموو لەش، بروای پتەویشم ئەوەیە، هەرچەند بابەتەکە دیاریکردنی سنووری نێوان عێراقو تورکیایە، بەڵام لەراستیدا، وەکو گشت بابەتی قەوارەی عێراقە، بۆیە بەختیاریو کوێرەوەری چوار ملیۆن مرۆڤ ئێستا لەبەر دەستی کۆمیتە بەرزەکەتاندایە"[٣٦].

ئەو کۆمیتەیەی لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە دانرا بۆ لێکۆڵینەوە لەمەسەلەی ویلایەتی موسڵ لەساڵی ١٩٢٥دا، دوای ئەوەی چەندین سەرچاوەی مێژوویی‌و جوگرافی عەرەبی‌و فارسی‌و تورکی‌و ئەوروپایی خوێندەوە:" کۆمیتەکە گەیشتە ئەو سەرەنجامەی کە سێ ناوچەی دیار هەیە: عێراقی عەرەبی، جەزیرەو کوردستان. عێراق لەباکوورەوە لەهیت ـ تکریت یا ناوچەی حەمرین تێپەر ناکات، نەشتوانرا ئەوە دڵنیا بکرێتەوە کە بەشێك لەو زەویانەی کێشەی لەسەرە، رۆژێك لەرۆژان لەناو عێراقی عەجەمیدا نەبووبێ، ئەوەشی دوپات کردەوە کە لەهەموو ئەدەبیاتی جوگرافیدا هەر لەسەردەمی داگیرکردنی عەرەبییەوە تا مێژووی لێکۆڵینەوەی کۆمیتەکە (١٩٢٥) ئەو زەویانەی کێشەیان

---

[٣٤]– رێبازی نوێ، ژمارە ١٠و ١١، تشرینی یەکەمو دووەمی ١٩٨٦، ل٩.

[٣٥]– هەمان سەرچاوە، ل٩.

[٣٦]– ادموندز، سی.جی: سەرچاوەیەکی پێشووتر، ل٣٥٧.

لەسەرە واتە ویلایەتی موسڵ ـ ڕۆژێك لەڕۆژان نە وا دانراوە، نە وا وەسف کراوەو نەواش دەرکەوتووە بەشێك بووبێ لەخاکی عێراق، لەرابردووشدا ناوی عێراق لای دانیشتوانی ویلایەتی موسڵ، وەك ناوێکی وڵاتەکەیان، ئاشنا نەبووە، بەڵام هەرچۆنێك بێ بەلای عەرەبەکانەوە لەوشەی میزۆپۆتامیای ئەوروپی، کەم بیستراو پەسەندترە، میزۆپۆتامیاش تەنها نیوەی ڕۆژئاوای ئەو زەویانە دەگرێتەوە، کە کێشەیان لەسەرە. بەڵام گوتەی حکومەتی تورکی کە گوایە ویلایەتی موسڵ بەشێك بووە لەئەنادۆڵ، کۆمیتەکە لەو بڕوایەدایە کە ئەمە ڕاست نیە، چونکە هەردوو ناوچەکە سوریاو کوردستانی ڕۆژئاوایان لەنێوان دایە"[٣٧].

کەچی بەفیتی بریتانیا کۆمەڵەی گەلان لەڕۆژی ١٦/١٢/١٩٢٥دا بڕیاریدا کوردستانی باشوور بخرێتە سەر عێراق‌و لەو کاتەوە تا ئێستا ئەو مەسەلەیە بۆتە یەکێك لەمەسەلە گرنگ‌و ئاڵۆزەکانی ئەو دەوڵەتە. "... بەجۆرە سیاسەتی بریتانیا لەمەڕ کوردستانی باشوورو لکاندنی بەعێراقەوەو ڕێگەنەدان بەهیچ جۆرە مافێکی ئۆتۆنۆمی بەکورد، جێگیر بوو. ئەو لکاندنە لەچەندین بەیاننامەو وتارو دانراوەکانی نووسەرە سەرمایەدارەکاندا وا لێکدراوەتەوە کە لەپێداویستیە جوگرافی‌و بازرگانیەکانەوە هەڵێنجراوە. گومان لەوەدا نیە کە لەنێوان کوردستانی باشوورو ناوەڕاستی عێراقدا چەندین پەیوەندی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی هەیە، بەڵام ئەو پەیوەندیانە پێویستیان بەپێوەلکاندنێکی ئیمپریالیستانە نیە. هەروەك مەبەستەکانی ئەم لکاندنە مەبەستێکی ئیمپریالیستی ریسوایە، ستراتیجی‌و چەوسێنەرانەیە، نوێنەرەکانی ئیمپراتۆریەتی بریتانیا خۆشیان نەیانتوانیوە ئەم ڕاستیە بشارنەوە"[٣٨].

هەر بۆیە سەیر نیە کاتێ جۆرج ئەنتۆنیۆس لەکتێبەکەیدا "ڕاپەڕینی عەرەب" کە بەزمانی ئینگلیزی نووسیوێتی، لەلاپەڕە ٣٦٣ – ٣٦٧دا دەڵێ: "بەشداریکردنی بریتانیەکان لەبینای قەوارەی عێراقدا مەزنترین ڕووداوی بیناکردنەوەی دوای جەنگە.... بێ زێدەڕۆیی دەتوانین بڵێین، بەلانی زۆرەوە، دەوڵەتی تازەی عێراق لەبوونیدا قەرزداری کۆششی فەرمانبەرە بریتانیەکانە....

---

[٣٧]- حسین، د. فاضل: مشکلة الموصل، بغداد ١٩٧٧، ص٧٨.

[٣٨]- شریف، عزیز: المسألة الکردیة فی العراق، الطبة السرة، عام ١٩٥٠.

وەرگیراوە لە: یەکێتی نیشتمانی کوردستان، گفتوگۆی شۆڕش لەگەڵ میری، چاپخانەی شەهید جەعفەر، ١٩٨٥، ل ١٠٨.

ڕێکەوت دەرفەتی بەنرخو بەختی باشی بۆ عێراق ڕەخساند، کە فەرمانبەری بریتانی زۆر لێوەشاوەو خاوەن ویژدانی زیندووی هەبێ..."[39]. نووسەر زیاتر لەسەری دەڕواو دەڵێ: "عێراق بەختیشی لەوەدا بوو کە بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی بریتانیا، زۆربەی کات، لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیدا شان بەشانی یەکتر ڕۆیشتون.... ویستی بریتانیا بۆ دەستگرتن بەسەر سەرچاوەکانی نەوت لەویلایەتی موسڵدا بوو بەهۆی ئەوەی هەموو ویلایەتەکە بەو دەوڵەتە عەرەبیە تازەوە بلکێنرێو ببێتە ناوچەیەك لەناوچەکانی. فەزڵەکەش لەوەدا دەگەڕێتەوە بۆ دیبلۆماسیێتی بریتانیا. ئەمە وێڕای ئەوەی بووە هۆی هاوکاریەکی کاریگەرو پتەوی ئەنگلۆ ـ عێراقی لەمەڕ ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەی کوردا"[40].

کەواتە "عێراق بەم سنوورەی ئێستایو بەم پێکهاتنە نەتەوەییو دینیو مەزهەبیەوە کە هەیە، دەوڵەتێکی تازەیە، قوڵایەکی مێژوویی نیە، چونکە عێراق نە وەکو دەوڵەتو نەوەکو موستەعمەرەیەکی یەکگرتوو بەم سنوورەی ئێستایو تەنانەت وەکو وڵاتێکی یەکگرتووش لەچوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا وجودی نەبووە.."[41] بەڵکو عێراق دەوڵەتێکە، بەپێ ئەو هەلو مەرجانەی لەسەرەوە باسکرا، بەگوێرەی ویستو ئارەزووی ئینگلیز پێکهاتووەو بەو جۆرەی کە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی سنووری بۆ دیاری کردووە، کە لەقاڵبدانی بەشێکی نیشتمانی عەرەبو بەشێکی نیشتمانی کورد، بەشێك لەنەتەوەی عەرەبو بەشێك لەنەتەوەی کوردە لەچوارچێوەی ئەو دەوڵەتە دەستکردەدا، بەو جۆرەش کە خۆشی شێوەی ڕژێمو حوکمرانی تیا داناوە.

ئەم ڕاستیانەی سەرەوە ئیدیعای ناسیۆنالیستە عەرەبەکان، بەتایبەتی بەعسیە ڕەگەزپەرەستەکان، بەدرۆ دەخاتەوە، کە دەڵێن عێراق هەر لەمێژەوە دەوڵەت بووەو بەم شێوەیەی ئێستاش بووە، لەکاتێکدا بەڵگە مێژوویيو جوگرافیەکان ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە بەدرێژایی مێژوو عێراق دەوڵەت نەبووە، هەروەك لەهیچ کاتێکیشدا بەشێك نەبووە لەعێراقو تەنانەت خەڵکەکەشی ناوی عێراقیان لا نامۆ بووەو پێی ئاشنا نەبوون. هەروەها ئەو تۆمەتانەش ڕەت

[39]— ادموندز، سي، جي: سەرچاوەیەکی پێشووتر، ل ٣٥٨، پەراوێز.

[40]— هەمان سەرچاوە، ل ٣٨٥.

[41]— یەکێتی نیشتمانی کوردستان، دەزگای ڕاگەیان: عێراقو مەسەلەی کورد، سەرچاوەیەکی پێشووتر، ل١.

دەکاتەوە کە ناسیۆنالیستە بەرچاو تەنگەکانی عەرەب دەیدەنـە پـاڵ جوڵانـەوەی رزگاریخوازی کوردستان، چونکە لەکاتێکدا جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانی عەرەب، کەشەریف حسێن سەرکردایەتی دەکرد، بـۆ یەکخسـتنەوەی مەشـرقی عـەرەب، ئینگلیز راستەوخۆ یارمەتی دەداو پشتگیری دەکرد، لەهەمان کاتـدا جوڵانـەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان کە لەهەمان سەردەمدا هەبوو، ئینگلیز بەهـەموو توانایەکیەوە دژایەتی دەکرد، دیارە لکاندنی کوردستانی باشووریش بە عێراقـەوە باشترین بەڵگەی ئەم قسانەیە.

ب ـ هەڵسەنگاندنی بەعسیانەی مەترسییەکانی سەر دەوڵەتی عێراق.

بەرگری ستراتیجی لەسیاسـەتی بەعسـدا، روو لەمەسـەلەیەکی جەوهەریـە بەلای خۆیانەوە، کە دوولایەنەیە:

١ـ پاراستنی حوکمی بەعس لەسەر دەوڵەتی عێراق.

٢ـ پاراستنی (یەکێتیی خاکی عێراق) واتە رێگەگرتن لەئێستاوە لەهـەموو ئەو هۆیانەی زەمینەی پارچە پارچەبوونی عێراق سازدەکەن.

کەواتە هەر فاکتەرێ، چ ناوەکی بێ یا دەرەکی، مەترسی بخاتە سـەر یـەکێك لەم دوو پایانە، یا هەردووکیان، یـا بیـان لـەقێنێ، بـەلای بەعسـەوە مەترسـی دەخاتە سەر ئەمنی ستراتیجیی عێراق. کەواتە ئەمنی ستراتیجیی عێراق روو لەو مەترسیانەیە، واتە: بریتییە لە دانانی رێوشوێنی سیاسـی، سـوپایی، ئـابووری، دیمۆگرافی، ئایدیۆلۆجی لەرووی ئـەو مەترسـیانەدا کـە لەسـەر رژێـمو لەسـەر یەکێتی خاکی عێراقن.

لەبەر پێویستی زانستیانە، مەترسییەکانی سـەر ئـەمنی سـتراتیجی عێـراق بەگوێرەی سەرچاوەی مەترسییەکان: ناوەکیو دەرەکی، پۆلێن دەکەین:

## یەکەم مەترسییە ناوەکییەکان.

دەوڵەتی عێراق بەگوێرەی ویسـتی ئیمپریـالیزمی بریتانیـاو کۆنەپەرسـتی داتاشـراوە، (لەدروسـتکردنی دەوڵەتەکـەدا ئەوەنـدە بایـەخی بـەئیرادەو ویسـتی دانیشتوانی ناوچەکەو بەلێکدانەوەی (اعتبارات)ی نەتەوەییو دینیو مەزهـەبی نەداوە، ئەوەندەی بایەخی داوە بە مسۆگەرکردنی دەسکەوتو قازانجـەکانی خـۆی

لەمەسەلەی پەترۆڵ و ئابووری و سیاسی و ستراتیجدا...[٤٢]). هەربۆیە دەوڵەتی عێراق وەکو (مەتحەفی ئەجناس) وایە، چونکە لەکاتی دروستکردنیدا:

لەنەتەوەدا ـ عەرەب، کورد، فارس، تورکمان، ئاسوری، کلدانی، ئەرمەنی تێدا بووە...

لەئایندا ـ موسڵمان، مەسیحی، یەزیدی، جولەکە، سوبی تێدا بووە...لەمەزهەبدا ـ سوننیی، جۆراوجۆر (شافعی، حەنەفی، حەنبەلی، ئەحمەدی)، شیعەی جۆراوجۆر (جەعفەری و عەلەوی...) و کڵێسەی جۆراوجۆری تێدابووە... .

هەربۆیە دەوڵەتێکی لەم جۆرە بابەتە، هەمیشە مەترسی کێشەو گیروگرفتی جۆراوجۆر، ئاژاوە، شۆڕش، جەنگی ناوخۆیی و پارچەپارچەبوونی لەسەرە. کەواتە: مەترسییە ناوەکییەکان ئەو مەترسیانەن کە لەئەنجامی پێکهاتنی خۆیی کۆمەڵی عێراقەوە پەیدا بوون و پەیدا دەبن، کەپەیوەندیان بەباری سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، سایکۆلۆجیی کۆمەڵی عێراقەوە هەیە. ئەو مەترسیانەی، لەڕوانگەی بەعسەوە، هەڕەشە لەئەمنی ستراتیجی عێراق دەکەن و دەبخەنە مەترسییەوە، فرەجۆرن، کەهەندێکیان مەترسی سیاسی ـ ئایدۆلۆژییە، هەندێکی تریان کۆمەڵایەتی، ئابوورییە کە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن.

## أ ـ کێشەی نەتەوایەتی

ئەو کێشەو گیروگرفتانەن کە لەئەنجامی پێکهاتنی فرەنەتەوەیی کۆمەڵی عێراقەوە پەیدابوون و پەیدا دەبن، کە ئەمانەی خوارەوەن:

### ١ـ مەسەلەی کورد

مەسەلەی کورد یەکێکە لەو کێشە هەرە سەرەکییە ناوەکییانەی رووبەرووی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی دەوڵەتی عێراق بۆتەوە. چونکە لەوەتەی دەوڵەتی عێراق دامەزراوە، گەلی کورد لەخەباتێکی بێوچان و بێ پسانەوەدا بووە لەپێناوی سەلماندنی مافە نەتەوەیی و دیموکراتییەکانیدا، حکومەتەکانی عێراقیش لەهەوڵدانێکی بێ پسانەوەدا بوون بۆ سەرکوتکردنی جوڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد. جوڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان کە دژی

---

[٤٢] ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢.

چەوساندنەوەو ستەمی نەتەوایەتییەو ئامانجەکەی بە دەستهێنانی مافە زەوتکراوەکانی گەلی کوردە، کە هەر لەرێگەی مافی چارەی خۆنوسینەوە چارەسەر دەکرێ، رژێمیش خۆی تێدەگا کە کردنەوەی گرێ کوێرەکانی ئەم کێشەیە هەر لەو رێگەیەوە چارەسەر دەکرێو مافی ئۆتۆنۆمی دەستەبەری بەدیهێنانی ئەو مافانە نییە، هەربۆیە رژێم نەخشەو پلانەکانی خۆی بۆ دژایەتی کردنی جولاّنەوەکە لەسەر ئەو بنچینەیە دادەرێژرێت، کە جولاّنەوەکە مەبەستێتی خاکی عێراق پارچە پارچە بکاو قەوارەی ئێستای عێراق هەڵبتەکێنێ.

کورد بۆ مافی چارەی خۆنوسین خەبات دەکا، کە ئەمەش ستراتیجی بەرزی جولاّنەوەی رزگاریی نیشتمانیی کوردستانە، چونکە لەچوارچێوەی دەولّەتێکی ئیمپریالیست کردووی داتاشراودا، جگە لەمەینەتیو ستەمو چەوساندنەوە، چەرمەسەری و کوێرەوەری، زیاتر هیچی نەدیوەو بەشوێن مافی سروشتی خۆیدا خەبات دەکا. جا هەرچەندە گەلی کورد بۆ چەند مانگێك یاخود چەند سالّێك، لەئەنجامی شکستێکی سوپایی یا لەئەنجامی شکستێکی سیاسی دا، جولاّنەوە شۆرشگێرانەکەی خامۆشو خەفە بوبێت، بەلاّم هیچ کات کۆلّی نەداوە لەخەباتو بەگژداچوونەوەی دەولّەتی عێراقو دامو دەزگاکانی دا، بەهەرجۆرو شێوەیەك بووبێ، توندوتیژو بە زەبروزەنگ یان هێمنانەو بەشێوەی ئاشتی بووبێ، داواکانی لەئاستی ستراتیجی جولاّنەوەکەدا، بووبێ یا کەمتر بووبێ.

عێراق کە لەبنچینەوە دەستکردی ئیمپریالیزمی بەریتانیایە، وەختی خۆی ئینگلیز هەموو هەولّی ئەوەبوو کە ئەو قەوارەیە جێگیر بکات لەسەرحسابی کورد، بە لەقالّبدانی کورد لەچوارچێوەی ئەو دەولّەتەدا، حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقیش میراتگری ئەو سیاسەتەی ئینگلیزن، واتە حکومەتەکانی عێراق پارێزەری سیاسەتی ئیمپریالیستانەی بریتانیا بوونو بە هەموو شێوەیەك هەولّی جێبەجێکردنیان داوە.

راستە بریتانیا بەرژەوەندی پەترۆلّی ستراتیجی لەناوچەکەدا هەبوو، بەلاّم بۆ جێگیرکردنی ئەو بەرژەوەندیانە پێویستی بەجێگیرکردنی ئەو دەولّەتەو داتاشینی نەبوو، چونکە لەدوای ئەوەی بەریتانیا فەرەنسای لەخشتە برد، کوردستانی باشوور کەوتە ژێر نفوزی دەسەلاّتی بەریتانیاوە، بەلّکو بریتانیا، کە دوژمنی سەرسەختی جولاّنەوەی رزگاریی نیشتمانیی کوردستان بوو، پێویستی بەوەبوو کورد پارچە پارچە بکاتو لەو قەوارەدا لەقالّبی بدات. حکومەتە یەك لەدوای

یەکەکانی عێراقیش، لەسەر بنچینەیی بەرژەوەندییە چینایەتییە کانی خۆیان، کە دەستکردو کرێگرتەی ئیمپریالیزم بوون، درێژەیان بەهەمان سیاسەت داوە.

رژێمی بەعس لەهەموو رژێمەکانی تر باشتر، بە جددی تر بەنەخشە ئەم سیاسەتە جێبەجێ دەکا کە خۆی لەسێکوچکەی بەعسیان: تەرحیل، تەعریب، تەبعیسدا دەنوێنێت.

لەبەرئەوە کاربەدەستەکانی عێراق هیچ کات نەیان ویستووە لەهۆی راستەقینەی هەلگیرسانی شۆڕش و بێزاریی و ناڕەزای خەلکی کوردستان بگەن، بۆیە هەرگیز نەیان ویستووە بەڕاستی و دروستی گیرو گرفتە سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابووری، فەرهەنگییەکانی گەلی کورد بزانن و رێو شوێنی بابەتیانەی چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد بدۆزنەوە، بەلکو هەمیشە تۆمەتیان هەلبەستووە کە گوایا جولانەوەیەکی کۆنەپەرستانە، یان گرێدراوی بێگانە یا دژی رەوتی شۆڕشگێڕانەی دەولەتە، بۆیە بە توندترین شێوە بە گژدا چوونەتەوە.

رژێمە یەك لەدوایەکەکانی عێراق، هەمیشە بەچاوی گومان و دڕدۆنگیەوە سەیری گەلی کوردیان کردووەو بڕواو متمانەیان پێی نەبووە، بە بیانیان لەقەلەم داوەو خاکەکەشیان بەهی عەرەب داناوە، هەر داوایەکیشی هەبووبێ، بە ناماقول و سەرکێشی و یاخیبوون حسابیان بۆ کردووە. حیزبی بەعس گەلی کوردی بە خەتەرترین فاکتەر داناوە لەسەر ئەمنی ستراتیجیی عێراق و بگرە زیاد لەوەش بە گەورەترین خەتەری داناوە لەسەر ئەمنی قەومیی عەرەبی، کە ئەمەش ڕادەی شۆڤێنی و ڕەگەزپەرستانەی بەعس دەردەخا. چونکە:

* ئەگەر کورد لەعێراقیش جیابێتەوە، کە مافی سروشتی رەوای خۆشیەتی، لەڕووی خاکەوە هیچ مەترسییەك ناخاتە سەر نەتەوەی عەرەب، عەرەب کە خاوەنی خاکێکی زیاد لە١٢ملیۆن کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، جیابوونەوەی کوردستان کە خاکی گەلی کوردستانە ئەو رووبەرە بەرفراوانە تەنك ناکاتەوە.
* لەڕووی ئابوورییەوە: نەتەوەی عەرەب خاوەنی سامانێکی سروشتیی زۆرە، هەر لەپەترۆلەوە بگرە تا چەندین کانزای سروشتی تر، هەربۆیە جیابوونەوەی کورد لەڕووی ئابوورییەوە هیچ مەترسییەکی ستراتیجیی بۆ سەر نەتەوەی عەرەب نییە.

* لەرووی دیمۆگرافییەوە: جیابوونەوەی (٤ ـ ٥) ملیۆن کورد، مەترسیی دیمۆگرافی ناخاتە سەر نەتەوەی عەرەب، چونکە عەرەب نەتەوەیەکی گەورەیەو ئێستا نزیکەی (١٧٥) ملیۆن کەس دەبێ.

جگە لەوە حزبی بەعس بوونی کورد لەئێران، تورکیا، سوریا بەمەترسی دەزانێ لەسەر خۆی، چ لەرووی جولاَنەوەی رزگاری نیشتیمانیی کوردستان لەو پارچانەدا گەشە بکاتو سەرکەوتن بەدەس بێنێ، چ لەرووی ئەو دەوڵەتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە، لەرووی تاکتیکیەوە، یارمەتی گەلی کورد بدەن لەکوردستانی عێراقدا بۆ وەدیهێنانی هەندێ ئامانجی نەتەوەیی. واتە (مەترسی کورد) کە مەترسییەکی ناوەکییە بەلای بەعسەوە، پەلوپۆی دەرەکیشی هەیە.

## ٢ـ مەترسی تورکمانو ئاسوری

* مەترسی تورکمانەکان لەعێراقدا، لەروانگەی بەعسەوە، لەوەدایە کە ئێستا زیاد لە٤٪ی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنن، ئەوانیش داوای مافە نەتەوەییو دیموکراتییەکانی خۆیان دەکەن، جگە لەوەی، بەعس پێیوایە تورکیا دەتوانێ وەکو گوشار بۆسەر دەوڵەتی عێراق بەکاریان بێنێ تا بتوانێ ئامانجەکانی خۆی لەناوچەکەدا زیاتر مسۆگەر بکاتو چۆك بە عێراق داداو هەندێ مەرجی تایبەتی خۆی بەسەردا بسەپێنێ.
* مەترسی ئاسورییەکانیش لەوەدایە کە مەسیحینو دەشێ هەندێ دەوڵەتی ئەوروپی دنەیان بدەنو بۆ ژیاندنەوەی (ارض الميعاد).

ب ـ شیعە

یەکێکی تر لەو کێشە سەرەکییانەی رووبەرووی رژێمی عێراق بۆتەوە، مەسەلەی شیعەیە، هەروەك باسکرا، داتاشینی دەوڵەتی عێراق لەسەر بنچینەی ویستو ئیرادەی گەلانی ناوچەکە نەبووە، بۆیە سەیرنییە دەوڵەتێکی ئاوا چەندین ئایینو مەزهەبی جیاجیاشی تێدابێ. بوونی ئەو پێکهاتە فرە ئایینیو فرە مەزهەبییە لەگەڵ نەبوونی قوڵاییەکی مێژوویی دەوڵەتەکەو نەبوونی دابو نەریتی دیموکراتیانە لە وڵاتەکەدا، هەمیشە زەمینەکی سازبووە بۆ تەقینەوەی گیروگرفتەکان، بۆ ئاڵۆزبوونی بارەکان بۆ جەنگی ناوخۆیی.

شیعەکان لەعێراقدا ئەگەر کوردی لێدەرکەین، زۆربەی دانیشتوانی عـەرەبی عێراق پێکدەهێنن، کەچی وێڕای ئەوە تا ئێستا لە عێراقدا هەر ڕژێمی عـەرەبی سوننی[٤٣] کە دەسەڵاتی سیاسی بە دەستەوە بووە، لەم دواییانەش بووە بـە ڕژێمـە عەرەبی سونی بەعسی. بەم پێیە مافو سەربەستی زۆربەی ئاینو مەزهەبەکانی تری عێراق پێشێل کراوە، مافیان زەوت کراوە، چەوسێنراونەتەوە...

ڕژێمی بەعس لای وایە هەرکەسێ باسی جیاوازی ئـاینی ـ مەزهـەبی بکـا، باسـی چەوسـانەوەی شـیعە بکـا، نۆکـەری ئێرانـەو شـعوبییەو بـەو بـاوەڕی تایەفەگەریو دواکەوتوانەی هەیە، کە مەترسی دەخاتە سەر ئەمنی سـتراتیجیی عێراقو هەروەها ئەمنی قەومی عەرەبیش، هەر بۆیـە بەگژداچـوونەوەی ئەمانـە کـارێکی (نیشـتیمانی)و (نەتـەوەیی)و هـەڵگۆزراوی پێداویسـتییە مێـژووییو بابەتییەکانی جولاّنەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی عەرەبە.

بۆیە ڕژێمی بەعس تا ئێستا بە توندترین شێوە بەگژ جولاّنـەوەی شـیعەکانی عێراقدا چۆتەوە، بەهەزارانی لەسێدارە داوەو گوللەبارانی کردون، دەیان هـەزاری لێخزاندونەتە کونجـە تاریـکو تنۆکـەکانی زیندانەکانـەوە، بـەدەیان هەزاریشـی دەربەدەرو ڕەوانەی ئێرانو هەندەران کردووە، لەدامو دەزگاکانی دەوڵـەت، سـوپاو بەڕێوەبردنی ئیداریی دەوڵەتدا بێبەشی کردون، هەروەك ڕێگەی لـە بـەجێهێنانی دابو نەریتەکانیان گرتووە، هەرلەبەرئەوەی بەعس لایوایە شیعە هەم مەترسییە بۆ سەر ڕژێم، هـەم مەترسـیی ئایدۆلۆجیشـە بـۆ سـەر ئایـدیۆلۆجیی نەتـەوەی عەرەب.

ج ـ جولاّنەوە کۆمەڵایەتییەکان

دەوڵەتی عێراق جگە لەوەی دەوڵەتێکی فرەنەتـەوە، فرەئـاینو فرەمەزهەبـە، لەهەمان کاتدا فرەچینیشە. هەتا ئێستا ڕژێمەکانی عێراق نـەیانتوانیوە کێشـە چینایەتییەکانی کۆمەڵی عێراق چارەسەر بکـەن، لـەرەگو ڕیشـەی بکۆڵنـەوە، توێژینەوەی لەسەر بکەنو ڕێوشوێنی گونجاو بۆ چارەسەرکردنیان دابنێن. هەربۆیە وەك چۆن زەمینـەی خـەباتی نەتەوایـەتی هەیـە، وەك چـۆن زەمینـەیی بێـزاری ئایینیو مەزهەبی هەیە، بەهەمان شـێوە زەمینـەی خـەباتی چینایەتیش هـەر

---

[٤٣] ـ بە درێژایی ڕژێمی پاشایەتی، یەك شیعە کرایە سەرۆك وەزیران کە ئەویش سالّح جەبر بوو.

لەئارادایە. هەرچەندە جولآنەوە کۆمەلآیەتییەکان هەندێ جار، جا لەبەر هۆی ناوەکی بووبێ یان هەر هۆیەکی تر، سەربوونو نەیانتوانیوە وەکو پێویست مەترسی بخەنە سەر رژێمەکانی عێراق، بەتایبەتی رژێمی بەعس، نەشیانتوانیوە پارتو رێکخراوەی پێویست دابمەزرێننو بیننەکایەوە کە، بتوانن ئامانجە ستراتیجیەکانی جولآنەوەکە مسۆگەر بکەنو بەدەست بهێنن، بەلآم لەگەلّ ئەوەشدا هەمیشە مەترسییەکی شاراوە بوون، وەك ئاگری بن ژێلەمۆ بوون، چونکە زەمینەی ئەو جولآنەوانە هەمیشە سازو لەئارادا بوون، هەندێ لەو جولآنەوانە پەیوەندیان بە چینێکی کۆمەلآیەتییەوە هەیە وەك: پرۆلیتاریا... هەروەك هەندێکیشیان پەیوەندیان بە کەرتێك یان توێژێکی کۆمەلآیەتییەوە هەیە، وەك خوێندکاران، لەکاتێکا هەندێکیان پەیوەندیان بەچەندین چینو توێژی کۆمەلآیەتییەوە هەیە، وەکو: جولآنەوەی دیموکراتی ....

دەشێ ئەم جولآنەوانە لەحیزبو رێکخراوو نوێنەرەکانیان ببینینەوە، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١ ـ حیزبی شیوعیی عێراق

رژێمی بەعس حیزبی شیوعیی عێراق بە یەکێ لەمەترسییەکانی سەر دەولّەتی عێراق، ئەمنی ستراتیجیی عێراقو تەنانەت ئەمنی قەومیی عەرەبیش دادەنێ، سەرچاوەی هەلّێنجانی ئەم بۆچوونەش دەگەرێتەوە بۆ چەند هۆو فاکتەرێك کە گرنگترینیان ئەمانەن:

* مەسەلەی کورد: رژێمی بەعس هەمیشە تۆمەتی ئەوەی داوەتەپالّ حیزبی شیوعی عێراق کە دنەی جولآنەوەی شۆرشگێرانەی کوردی داوە، دەماری رەگەزبازی تیا گرژکردوونو بەگژ (شۆرشی بەعس)یدا کردوونو دەکا، هەر بۆیە شعووبینو دەبنە مەترسی بۆسەر قەوارەی دەولّەتی عێراق، لەکاتێکا راستیە مێژووییەکان ئەو تۆمەتانەی بەعس پوچەلّ دەکەنەوە، کە دەیکاتە بیانوو بۆ بەگژاچوونەوەی ئەم حیزبە، چونکە:

ــ حیزبی شیوعی عێراق، هەرچەندە لەسالّی ١٩٥٦ەوە لە ئەدەبیاتی سیاسیاندا، هەروەك لەهەندێ کۆنفرانسو کۆنگرەیاندا باسیان لە مافی چارەی خۆنوسین کردووە بۆ کورد، بەلآم باسکردن نەبۆتە بەرنامەی کارکردنی حیزبی شیوعی بەرامبەر مەسەلەی کوردو جەماوەری حیزبەکەیانو هی عەرەبیشیان

بەم گیانە پەروەردە نەکردووە، کە مافی رەوای کورد مافی چارەی خۆنوسینە، ئەمە وێڕای ئەوەی، بەلای حیزبی شیوعییەوە ئەو مافە دەبێ لەشێوەی ئۆتۆنۆمیدا بێتە دی. کەواتە حیزبی شیوعی مەترسی لەسەر یەکێتیی خاکی عێراق نییە وەك بەعسییەکان تۆمەتیان دەدەنە پاڵ، هەڵوێستی دوارۆژێکی نزیك و تەنانەت تا رادەیەك دووریشیان، نیشانەی ئەوەی لێ بەدی ناکرێ لەگەڵ جیابوونەوەی کوردستاندا بن.

- لە ساڵانی ١٩٧٣ - ١٩٧٩حیزبی شیوعی عێراق بەشداری دەسەڵاتی سیاسی رژێمی بەعسی کردووە، هاوبەشی لە سیاسەتەکانیدا کردووە، لەساڵانی ١٩٧٥ - ١٩٧٩دا ئەگەر لەگەڵ سیاسەتی راگواستن و بەعەرەبکردنی کوردستان و کوردیشدا نەبووبێ، لێی بێدەنگ بووە، نارەزای دەرنەبڕیوە، لە رۆژنامەکەیاندا هیچ شتێکی لەمەڕ چەوسانەوەی کورد نەنوسیوە، بگرە ئەم نەخشانە بە شێوەیەکی چڕوپڕ ئەوکاتە کراون کە حیزبی شیوعی هاوبەشی دەسەڵاتی سیاسی بەعس بووە[٤٤].

کەواتە ئەم تۆمەتانەی حیزبی بەعس لەم رووەوە تەنها پەلپ و بیانوگرتنە بۆ دژایەتیکردنی حیزبی شیوعی و لێدانی.

* مەترسی بۆ سەر دەسەڵاتی سیاسی: هەر چەند مەسەلەی بنچینەیی لەهەر شۆڕش و جولانەوەیەکدا، بەنیسبەت هەر حیزب و رێکخراوێکەوە بەدەستهێنانی دەسەڵاتی سیاسییە، بەڵام ئەم مەسەلەیە، کەم تا زۆر، لەستراتیجیی حیزبی شیوعیدا بەدی ناکرێ، چونکە حیزبی شیوعی بەدرێژایی مێژووی، چەندین دەرفەتی زێڕینی بۆ هەڵکەوتووە کە دەسەڵاتی سیاسی لەعێراقدا بگرێتە دەست وەك (وەك لەساڵەکانی ١٩٥٨ - ١٩٦٣وساڵەکانی ١٩٦٤- ١٩٦٨)بەڵام لەبەر هەرهۆیەك بووبێ، نەیتوانیوە هەلەکە بقۆزێتەوە و دەسەڵاتی سیاسی

---

[٤٤] - بۆ زیاتر شارەزابوون سەیری بەڵگەنامەکانی ئەم دواییەی حیزبی شیوعی عێراق بکە، بەتایبەتی:

- حزبی شیوعی عێراق، چوارەمین کۆنگرەی نیشتمانی: هەڵسانگاندنی تاقیکردنەوەی تێکۆشەرانەی حیزبمان لەساڵانی ١٩٦٨ - ١٩٧٩، ١٠ - ١٥ تشرینی دووەمی ١٩٨٥، بەشی راگەیاندنی مەڵبەندی سلێمانی و کەرکوکی حیزبی شیوعی عێراق.

هەروەها

- الحزب الشیوعي العراقي في سنة ١٩٥٨ - ١٩٨٣، الكفاح ضد اليمين الانتهازي من أجل إعادة بناء الحزب على اسس سليمة، وثائق، حزيران ١٩٨٦.

بگرێتە دەست. ستراتیجی حیزبی شیوعی عێراق لەمەڕ دەسەڵاتی سیاسی لەعێراقدا هەمیشە بەشداریکردنو هاوبەشیکردنی دەسەڵاتی سیاسی بووە، نەك بەدەستەوەگرتنی ئەو دەسەڵاتە، کەواتە حیزبی شیوعی مەترسیی لەسەر دەسەڵاتی سیاسی بەعس نەبووە.

* مەسەلەی فەلەستین: حیزبی بەعس هیچ کات هەڵوێستەکانی حیزبی شیوعی لەمەڕ مەسەلەی فەلەستین بەدڵ نەبووەو دژیشی وەستاوەتەوە، چونکە هەریەکەیان لەسوچێکی جیاوازو لەستراتیجێکی جیاوازەوە بۆ ئەو کێشەیە چوون. ئەو تۆمەتانەی بەعس دەیداتە پاڵ حیزبی شیوعیو بە مەترسی دەزانێ لەسەر ئەمنی قەومی عەرەب، هەڵوێستی حیزبی شیوعییە دەربارەی فەلەستین کە خۆی لەم خاڵانەدا دەنوێنێتەوە:

- داننانی حیزبی شیوعی عێراق بە بڕیاری دابەشکردنی فەلەستین کە لە ١٩٤٧/١١/٢٩دا لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەرچوو.
- پەیوەندی گەرمی حیزبی شیوعی عێراق لەگەڵ حیزبی شیوعی ئیسرائیل (راکاح).
- هەڵوێستیان بەرامبەر پرۆژەی رۆجەرزی ساڵی ١٩٦٨و داواکردنیان بۆ چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە هۆی بەستنی کۆنگرەی جنێفەوە.

*مەسەلەی یەکێتیی عەرەب: حیزبی بەعس لایوایە حیزبی شیوعی هیچ کات لەگەڵ مەسەلەی یەکگرتنی عەرەبدا نەبووەو دژی وەستاوەتەوەو ئەو یەکێتیانەش کە دروست بوون، هەر بەیەکێتی کۆنەپەرستانەی لە قەڵەم داون.

*مەترسیی ئایدلۆجی: حیزبی بەعس خۆی بە ئەلتەرناتیڤی بیرو باوەڕی کۆمۆنیزمو مارکسیزم - لینینیزم دادەنێ لە کۆمەڵی عەرەبیدا، هەروەك بیرو باوەڕی مارکسیزم - لینینیزم بە بیروباوەڕێکی نامۆو نەشیاو بۆ کۆمەڵی عەرەب دادەنێ بەو پێیەی ئەم بیروباوەڕە بە (میکرۆبێکی پیسی شێرپەنجە[٤٥]) لەقەڵەم دەداو و بەخەتەری دادەنێ لەسەر ئەمنی ئایدۆلۆجیی عەرەب.

---

[٤٥] - د. فاضل البراك: استراتيجية الامن الداخلي، وزارة الثقافة والاعلام، دائرة الاعلام الداخلي العامة، ١٩٨١، ص١٢٢.

٢ـ حیزبو ڕێکخراوە مارکسی ـ لینینی، پیشەییەکانی تری عێراق ئەو حیزبو ڕێکخراوانەن، کە دەربڕی بەرژەوەندییەکانی توێژێك یا کەرتێکی کۆمەڵایەتی، یاچەند چینو توێژێکی کۆمەڵایەتین، یا ڕێکخراوی مارکسی ـ لینینیی سەربەخۆنو جیان لەحیزبی شیوعی عێراق. ئەم حیزبو ڕێکخراوانە هەریەکەیان بەگوێرەی قورسایی سیاسی، سوپایی، ئابووریی خۆی کار لەئەمنی ستراتیجیی عێراق دەکات[٤٦].

د ـ سوپا

مەترسییەکە دەکەوێتە سەر جۆری ڕژێمەکە، ئەویش لەڕێگەی کودەتای سوپاییەوە لەلایەن ئەفسەرە نیشتمانپەروەرەکانەوە، ئەوانەی بەو ڕژێمەو جۆری بیرکردنەوەو ئایدلۆجیاکەی قایل نین، هەروەك ئەو کودەتایانەش کە بەفیتی دەوڵەتەکانی ناوچەکە دەکرێن، چونکە (جەیش یەکێکە لە دامەزراوە هەرە گرنگەکانی عێراق، لەژیانی سیاسی عێراقدا دەورێکی کاریگەری گێڕاوە، لەزۆر ژیانی سیاسی دەوڵەتی عێراقدا یەکێك بووە لەو دەزگا گرنگانەی بەشدار بووە لەبڕیاردانی جۆری چارەسەرکردنی کێشەکانی ناو عێراقداو لەکوژانەوەی ڕاپەڕینەکانو یاخیبوونی عەشیەتەکانی ناوەڕاستو جنوبی عێراقو نەستوریەکانو یەزیدییەکانو لەسەرکوتکردنی خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلی عێراقو لەبەگژاچوونو پەلاماردانی ڕاپەڕینوشۆڕشەکانی کوردا، هەر لەڕێگەی جەیشەوە چەندین (انقلابي عسكري) ساز کراوەو ئاڵوگۆڕیشی لەحکومەتەکانی عێراقدا کردووە، هەر بەڕێگەی (انقلابي عسكري)ی جەیش بوو کەحیزبی بەعس

[٤٦]ـ بەڕێوەبەرێتی ئەمنی گشتیی عێراق کە بەدناوترین دەزگای داپڵۆسینی دنیایە مەکتەبەکانی خۆی لەسەر بنچینەی مەترسییە ناوەکییەکان، بەم شێوەیەی خوارەوە. دابەشکردووە :
مەکتەبی یەکەم : بەرپرسیارە لەحیزبی شیوعی عێراق.
مەکتەبی دووەم: بەرپرسیارە، لەحاڵەتی (انشقاق)ی ناو حیزبی بەعس خۆی.
مەکتەبی سێیەم: بەرپرسیارە لە حیزبو ڕێکخراوە کوردییەکان.
مەکتەبی چوارەم: بەرپرسیارە لەو حیزبو ڕێکخراوانەی لەناو خوێندکاران دروست دەبن.
مەکتەبی پێنجەم: بەرپرسیارە لەجوڵانەوەو حیزبە ئایینیەکان.
هەریەکێ لەو مەکتەبانە لەئاستی بەڕێوەبەرایەتی دانو لەبەڕلایوەبەرێتی ئەمنی هەر پارێزگایەکیشدا بەشێکیان هەیە. ـ

دووجار هاتە سەر کار، جاری یەکەمیان ۱۹٦۳ بۆماوەی چەند مانگێك‌و جاری دووەمیان لەساڵی ۱۹٦۸ەوە تا ئێستا.

هاتنی حیزبی بەعس بۆ سەر کار، گۆڕینێکی گەورەی بەسەر جەیشدا هێنا، هەوڵیدا بەتەواوی جەیش دووربخاتەوە لەبەشداریکردنی بڕیاردانی سیاسی کاروباری ناوەوەو دەرەوەی عێراق‌و بیکا بە دەزگایەکی داخراوی خۆی کە دەردەستی تایبەتی حیزبی بەعس بێت بۆ پارێزگاریکردنی رژێمەکەی‌و سەرکوتکردنی هەموو دوژمنەکانی، لەوانە گەلی کورد[47]).

هـ ـ جۆرەکانی تری مەترسی

ئەو مەترسیانەن کە لەئەنجامی دواکەوتوییی‌و پاشەکەوتویی کۆمەڵی عێراق، نەخوێندەواری، دواکەوتنی زانست‌و تەکنەلۆجیا، نەبوونی سەربەستی ئافرەت، پاشماوەکانی دەرەبەگایەتی‌و خێڵەکی، سابوتاژو تێکدان‌و لەلایەن کۆمپانیا بیانیەکانەوە، جاسوسییەت، ئەم مەترسیانە لەچاو مەترسییەکانی سەرەوەدا ئەو کاریگەریان نییە، هەرچەند وەك هۆیەکی یارمەتیدەر دەوری دەبێ بۆ فاکتەرەکانی تر.

## دووەم: مەترسییە دەرەکییەکان

ئەو کێشەو گیروگرفتە سنووری‌و چارەنوسسازانەن کە دەوڵەتی عێراق بە میرات لەدەوڵەتی عوسمانیەوە بۆی ماوەتەوە، چونکە دەوڵەتی تازە دروستکراوی عێراق لەسەر کەلاوەی بەشێك لەئیمپراتۆرییەتی عوسمانی‌و بەدەسکێشی بەریتانیا دامەزراوە، هەروەك ئەو مەترسیانەش دەگرێتەوە، کە لەئەنجامی گۆڕانکارییە جیهانیەکانی دوای یەکەمین‌و دووەمین جەنگی جیهانی بەسەر جیهان‌و ناوچەکەدا هاتووە. گرنگترین ئەو مەترسیانە بەلای بەعسەوە ئەمانەن:

---

[47] ـ ماهی، لەتاکتیکەکانی بەعس بۆ بەگژاچوونی شۆڕشی کوردستان، گۆڤاری کۆمەڵە، ژمارە٤، خولی٣، نیسانی ۱۹۸۵، ل٢٥.

ا- ئێران

ناكۆكی نێوان عێراق‌و ئێران یه‌كێكه‌ له‌ناكۆكییه‌ كلێپه‌ سه‌ندووه‌كانی ناوچه‌كه‌و عێراق، ئه‌م ناكۆكییه‌ به‌گه‌وره‌ترین مه‌ترسی داده‌نێ له‌سه‌ر ئه‌منی ستراتیجیی خۆی‌و ئه‌منی قه‌ومی عه‌ره‌بی، بۆئه‌وه‌ی باشتر له‌ناكۆكی نێوان عێراق‌و ئێران بگه‌ین، ڕیشه‌كانی بدۆزینه‌وه‌و فاكته‌ره‌كانی په‌یدابوونی ئه‌و ناكۆكییه‌ لێك بده‌ینه‌وه‌، پێویسته‌ ئاوڕێك له‌شوێنه‌واری ده‌وڵه‌تی عوسمانی - سه‌فه‌وی بده‌ینه‌وه‌، كه‌به‌شێ له‌كێشه‌كانی نێوان عێراق‌و ئێران پاشماوه‌و درێژكراوه‌ی ئه‌و كێشانه‌ن كه‌ ئه‌و كاته‌ له‌ئارادابوون:

١- شوێنه‌واری ده‌وڵه‌تی عوسمانی - سه‌فه‌وی

له‌نیوه‌ی دووه‌می سه‌ده‌ی سێزده‌هه‌م، له‌ساڵی ١٢٥٨، له‌ئاسیای بچوكدا ده‌وڵه‌تی عوسمانی به‌سه‌ركردایه‌تی ئه‌رتغله‌ر دامه‌زرا. له‌دواییدا ئه‌و میرنشینه‌ توركانه‌ی كه‌ له‌ده‌وڵه‌تی سه‌لجوقی جیاببونه‌وه‌، له‌گه‌ڵ ئه‌و ده‌وڵه‌ته‌ تازه‌ دامه‌زراوه‌دا یه‌كیان گرت. به‌مه‌ ده‌وڵه‌تی عوسمانی په‌ره‌ی سه‌ندو به‌هێز بوو. ئینجا ده‌وڵه‌تی عوسمانی كه‌وته‌ په‌ل‌وپۆ هاویشتن به‌هه‌ر چوارده‌وری خۆیدا بۆ داگیركردنی ناوچه‌كانی ده‌ورووپشتی. به‌جۆره‌ هه‌ر له‌ته‌وریزه‌وه‌ تا ڤیه‌ننا كه‌وته‌ ژێر قه‌ڵه‌مڕه‌وی ئه‌و ده‌وڵه‌ته‌وه‌، تا وایلێهات له‌سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی شانزه‌هه‌مدا بووبه‌ ئیمپراتۆریه‌تێكی پان‌و به‌رینی ناوچه‌كه‌. ئیمپراتۆریه‌تی عوسمانی كه‌ ده‌وڵه‌تێكی ئیسلامی بوو، به‌ مه‌زهه‌ب سوننی بوو.

هاوزه‌مان له‌گه‌ڵ په‌ره‌سه‌ندن‌و فراوانبوونی قه‌ڵه‌مڕه‌وی ده‌وڵه‌تی سوننی مه‌زهه‌بی عوسمانیدا هه‌ر له‌سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی شانزه‌هه‌م، له‌ساڵی ١٥٠١، له‌ئێرانیشدا ئیمپراتۆریه‌تێكی ئیسلامی فارسی شیعه‌ مه‌زهه‌ب له‌سه‌ر ده‌ستی شا ئیسماعیلی سه‌فه‌وی دامه‌زرا، كه‌ به‌ئیمپراتۆریه‌تی سه‌فه‌وی ناسراوه‌. ئیتر له‌وساوه‌ مێژووی ناوچه‌كه‌ به‌ درێژای چوارسه‌ده‌ بریتی بووه‌ له‌ململانێیه‌كی سه‌ختی خوێناوی‌و جارجاریش سیاسی - دیبلۆماسی، له‌نێوان ده‌وڵه‌تی سوننی مه‌زهه‌بی عوسمانی‌و ده‌وڵه‌ته‌ شیعه‌ مه‌زهه‌به‌كانی ئێران: سه‌فه‌وی، زه‌ندو قاجاری له‌پێناوی ده‌ستگرتن به‌سه‌ر خاكی گه‌لانی ناوچه‌كه‌داو فراوانكردنی قه‌ڵه‌مڕه‌وی ده‌سه‌ڵاتیان له‌سه‌ر كه‌وڵی ئه‌و گه‌ل‌و نه‌ته‌وانه‌، ئه‌و ململانێیه‌، ململانێیه‌كی ستراتیجیی‌و ئایدیۆلۆجیی بووه‌ له‌نێوان هه‌ردوو ده‌وڵه‌ته‌كه‌داو له‌ئه‌نجامی

رووبەڕووبونەوەی هەردوو ستراتیجییەکەو تێکڕژانـی بەرژەوەندییەکانیانـدا خـۆی لەجەنگ‌و شەڕوشۆڕدا نواندۆتەوە، کە لەنێوانیاندا هەڵگیرساوەو بەرپابووەو هـەر لەژێر سـێبەری تـەرازووی هێزەکانیشـیاندا چارەنووسـی ململانـێ کـە لـەدوای تەواوبوون‌و کۆتایی هاتنی جەنگەکە بەقازانجی لایەك‌و زەرەرو زیانی لایەکەی تـر دیاریکراوە، یاخود نەتوانراوە بەقازانج‌و زیانی هـیچ لایـەکیان بەلایەکـدا بخـرێ‌و بەجۆرە جەنگ‌و پێکادان، بەشێوەیەکی بـەردەوام‌و یـەك لـەدوای یـەك، درێـژەی کێشاوە.

لەساڵی(١٥٠٨)دا شا ئیسماعیلی سەفەوی توانی بەغـدا بگرێـت‌و بیخاتـە ژێر قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆیەوەو بیکاتە بەشێك لەدەوڵـەتی شـیعە مـەزهـەبی سـەفەوی. بـەڵام عوسمانییـەکان لەسـاڵی (١٥١٤)دا توانیـان سـەفەویان لـە (چاڵدێران) بشکێنن‌و کوردستانیش بۆ یەکەمین جـار لـەنێوان خۆیـادا دابـەش بکەن، بـەجۆرێ بەشـی خۆرهـەڵاتی بەردەوڵـەتی عوسمـانی بکـەوێت. هـەروەها سـولتان سـلێمانی قـانونی لەسـاڵی (١٥٣٤)دا تـوانی بەغـدا بگرێـت‌و سەفەوییەکانیش دەربکات‌و لەساڵی (١٥٣٥)یشدا پـەیمانێکیان بەسـت، بـەڵام جـەنگ لەنێوانیانـدا هـەر درێـژەی کێشـا تاسـاڵی (١٥٥٤)کـە پـەیمانی (ئەماسییە)یان بەست، کە یەکەمین پەیمانە ئاماژەی بۆ سنووری نێوان هـەردوو دەوڵـەت کردبـێ، پاشـان لەسـاڵەکانی (١٥٦٨) و (١٥٩٠)یشـدا دەربـارەی چارەسەرکردنی کێشەکانی خۆیان چەند پەیمانێکیان بەست.

دەوڵەتی سەفەوی لەسەردەمی شاعەبباسدا، سەردەمی خورتی‌و بەهێزی بوو، هەر بۆیە پەرەیان بەچالاکییە جەنگییەکانی خۆیانـداو هـەر لەسـاڵی(١٦٠٢ - ١٦٣٧) چـوار جـار لەگـەڵ دەوڵـەتی عوسمانیـدا کەوتنـە جەنگـەوەو لەسـاڵی (١٦٢٣)یشدا توانیان شـاری بەغـدا بـۆ جـاری دووەم بگرنـەوە، لـەدوای هـەر جەنگێکیش پەیمانێك لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا مۆرکرا، کە دواترینیان پـەیمانی (زەهاو) بوو، کە سـاڵی (١٦٣٩)دا بەسـتراو دەشـێ بـوترێ یەکـەمین پـەیمانی سنوورییە لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا، ئەو پەیمانانەی لەنێوان ئـەو دوو دەوڵەتـەدا دەبەستران هەمیشە کـاتی بـوون، چـونکە هـەرکامێکیان بـەهێز بووبـێ، تـای تەرازووی هێزەکان بەلای خۆیدا شکابێتەوە، ئەوا جەنگی بەرپا کردووە تا لەسـەر حسابی دەوڵەتەکەی تر قەڵەمڕەوی خـۆی فـراوان بکـات‌و مەرجـەکانی خۆشـی بەسەردا بسەپێنێ. هەر بۆیە لەسەردەمی نادر شـادا لـەنێوان سـاڵانی(١٧٣١ -

١٧٤٣) سێ جەنگی تر لەنێوان ئـەم دوو دەوڵەتـەدا هەڵایسـاوەو لـەدوای هـەر جەنگێکیش پەیمانێك بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتـەکانو دیـاریکردنی سـنووری نێوانیان بەستراوە، کە دواهەمینیان پەیمانی (کردن)ی سـاڵی (١٧٤٦)، کـە بـە پەیمانی نادرشا ناسراوە، ئەم پەیمانە تەئکیدی لەسەر پەیمانی (زەهاو) کردۆتـەوە. بەڵام نادرشا لەساڵی (١٧٤٧)دا کوژرا.

لەساڵی ١٧٥١دا کەریم خـانی زەنـد کـرا بەشـای ئێـرانو دەوڵـەتی زەنـدی دامەزراند،

لەهەمان ساڵدا ئێران توانی شاری بەسرە بگرێت. بەڵام تەمەنی دەوڵەتی زەند زۆر کورت بوو، لەساڵی (١٧٩٠)دا دەوڵەتی قاجاری لەسەر شوێنەواری دەوڵەتی زەند هاتەکایەوە، ئاغا محمد خان کە سەرۆکی خێڵەکانی قاجار بوو، کـرا بەشـای ئێران. ئەم دەوڵەتە تا چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەم حکومڕانی ئێرانی کرد تا پەیـدابوونی ئیمپراتۆریـەتی پەهلـەوی. نـاکۆکیو ململانێـی نێـوان دەوڵـەتی عوسمانیو قاجاری لەسەر بناغەی ناکۆکییەکانی پێشەوە پەرەی سـەند. لـەنێوان ساڵانی (١٨٠٥ ـ ١٨٢١)دا هەشت جەنگی گـەورە لـەنێوان هـەردوو دەوڵەتـدا بەرپا بووە، هەروەك لەساڵی ١٨٢٢دا ئێران توانی چەندین شاری ئەنەدۆڵ بگرێو عوسمانییەکان ناچار بکا لەگەڵیدا رێك بکەون. هەربۆیـە لەسـاڵی ١٨٢٣دا بـۆ یەکەمین جار لەئەرزەڕۆم رێکەوتنێکیان مۆرکرد کە بەرێکەوتننامەی ئەرزەڕۆمی یەکەم ناسراوە بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەو گیروگرفتـەکانیانو تەئکیدکردنـەوە لەسەر پەیمانەکانی پێشوو. بەڵام ئەم پەیمانەش هەر بەتەواوی جێگیر نەبوو تا لـە ١٨٤٧/٥/٣١دا دەوڵەتی عوسمانی چۆکی داداو بەئاگاداری نوێنەرانی روسـیای تزاریو بریتانیا پەیمانـە ئـەرزەڕۆمی دووەمـی لەگـەڵ ئێرانـدا مـۆر کـرد، کـە بەگوێرەی ئەو پەیمانی دەوڵەتی عوسمانی وازی لەناوچەی عەرەبستان (خۆزسـتانی ئێستا) هێنا بۆ ئێران لەبەرامبـەر وازهێنـانی ئێـران لەناوچـەی سـلێمانی بـۆ دەوڵەتی عوسمانی، بەم جۆرە ئێران توانی دەست بگرێت بەسەر کەناری رۆژهەڵاتی (شط العرب)دا. هـەروەها ناوچـەی زەهـاویش بـەجۆرێ دابەشـکرا کـە ناوچـە شاخاوییەکانی بەر ئێرانو دەشتاییەکانی بەر دەوڵەتی عوسمانی بکەوێت.

هەروەها لە ١٩١١/١١/٢١دا پرۆتۆکۆڵی تاران لەنێوان هـەردوو دەوڵـەتی عوسمانیو ئێرانیدا کە بەهەمان مەبەستو بۆ دڵنیاکردنەوەی پەیمانی ئەرزڕۆمی دووەم بوو، مۆرکرا. هەروەك لە٤ ـ١٧/١١/١٩١٣یش پرۆتۆکـۆڵی ئەسـتانەیان

مۆرکرد کە بەگوێرەی ئەم پرۆتۆکۆڵە ئێران دەسکەوتی تری لە (شط العرب) بەدەسهێنا بەدرێژای ٧,٢٥کم. لەساڵی ١٩١٤یش لیژنەی چەسپاندنی سنوور لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا پێکهاتو کە کۆبونەوەکانی ئەم لیژنەیە لەسەر بنچینەی پرۆتۆکۆڵەکانی پێشەوە، بەتایبەتی پرۆتۆکۆڵی ئەستانە بوو.

دەوڵەتی عێراق کە لە ٢١/تەموز/١٩٢١دا لەلایەن بریتانیاوە دروستکراوە لەسەر بەشێك لە کەلاوەی داتەپیوو روخاوی دەوڵەتی عوسمانی هەموو ئەو کێشەو گیروگرفتانەی بەمیرات بۆمایەوەو مەسەلەی سنووری رۆژهەڵاتی عێراق لەگەڵ ئێراندا بوو بەیەکێك لەگیروگرفتە چارەسەر نەکراوەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتو بەدرێژای تەمەنی ٦٠ ساڵەی دەوڵەتی عێراق هەمیشە مایەی دروست بوونی تەنگەو چەڵەمەو تەقینەوەی کێشەکان بووە.

لە٤/٧/١٩٣٧دا دیسان پەیمانی سنور لەنێوان دەوڵەتی تازە دروستکراوی عێراقو دەوڵەتی ئێراندا مۆرکرایەوە، لەسەر بناغەی پرۆتۆکۆڵی ئەستانەو کۆبوونەوەکانی لیژنەی سنور لەساڵی ١٩١٤دا، بەگوێرەی ئەم پەیمانە ئێران دانینا بە دەوڵەتی عێراقدا، بەلاّم دانی بە رەوایی سنووردا نەنا، هەر لەو پەیمانەشدا ئێران دەسکەوتی تری لە (شط العرب) بەدەستهێنا بە درێژایی ٧,٧٥کم.

لەساڵی ١٩٦٩دا ئێران پەیمانی ١٩٣٧ی لەلایەن خۆیەوە هەڵوەشاندەوە بەناوی ئەوەی کە پەیمانێکی نارەوایەو داخوازییەکانی ئێرانی نەهێناوەتە دی، ئەم کێشەیە بە چارەسەرنەکراوی مایەوە تا ٦/٣/١٩٧٥ کە رێکەوتنی جەزائیر لەنێوان شاـ صدام لەسەر کەوڵی کوردو شۆڕشی کوردستان، مۆرکراو بە گوێرەی ئەم رێکەوتننامەیە بەشێوەیەکی هەمیشەیی لەگۆڕان نەهاتوو سنووری وشکایی‌و ئاویی نێوان عێراقو ئێران دیاریکراو سنووری ئاوی نێوانیان بەگوێرەی هێڵی تایلۆگ دیاریکرا، کە بەم پێیە ئێران دەسکەوتێکی گەورەی لە (شط العرب) بەدەستهێناو بە درێژایی ٨٩ ـ٩٠کم ی لە (شط العرب)ی بەرکەوت.

## ٢. مەترسی ئێران بۆ سەر ئەمنی ستراتیجیی عێراق

مەترسی ئێران بۆ سەر ئەمنی ستراتیجی عێراق، لە دیدی رژێمی بەعسەوە دەکرێت لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

* مەترسی ئێران بۆ سەر سنوری رۆژهەڵاتی عێراق: هەروەك لە خاڵی (١)دا روونکراوەتەوە سنووری نێوان ئێرانو دەوڵەتی عوسمانی هەمیشە لە ئاڵوگۆڕدا بووە، ویستی ئێران بۆ سەندنەوەی ئەو شوێنانەی بە موڵکی مێژووی خۆی دەزانێ، بەلای رژێمی بەعسەوە مەترسییەکی گەورەیە، بەتایبەت سنووری ئاویو دەسگرتن بەسەر (شط العرب)دا، کە تاکە دەروازەی ئاوی ـ دەریایی عێراقە.

* ئێران وەك دەوڵەتێکی شیعە هەمیشە پێی خۆش بووە شوێنە پیرۆزەکانی شیعە کە لەعێراقدان (کەربەلا، نەجەف، سامەڕاو کازمیە) بکەونە ژێر دەسەڵاتی شیعەکان خۆیانەوە، بۆیە هەوڵی ئەوەیانداوە یارمەتی شیعەکانی عێراق بدەن، بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی سیاسی لەعێراقدا.

ئێران بەشێك لەخاکی ئێستای دەوڵەتی عێراق بە موڵکی خۆی دەزانێ، چونکە بەر لە پەیدابوونی ئیسلام سنووری دەوڵەتی ساسانیو دەوڵەتەکانی پێش ئەویش لە فورات گەڕاوەتەوەو تەنانەت پایتەختی دەوڵەتەکەش لە(مدائن)بووە، کە دەکەوێتە خوار رۆژهەڵاتی بەغداوە.

هەربۆیە عێراق یا باشتر رژێمی بەعسی عێراق، لە دوو سەرەوە ئێران بە مەترسی دادەنێ لەسەر ئەمنی ستراتیجیی عێراقو ئەمنی قەومیی عەرەبی:

ـ لەلایەکەوە ئێران مەترسی دەخاتە سەر (یەکێتیی خاکی عێراق) چ بەنیسبەت داواکردنی هەندێ ناوچەی سنووری، یا ئەو شوێنانەی بە موڵکی مێژوویی خۆی دادەنێ، جگە لە داواکردنی هەندێ دوورگەو بەشێکی رۆژئاوای کەنداو. لەلایەکی تریشەوە ئێران مەترسی لەسەر جۆری رژێمی عێراق پەیدادەکا بەهێنانەسەر کاری رژێمێکی ئیسلامیی شیعە لە عێراقدا، هەروەك بەعس بیروباوەڕی شیعەگەری بە مەترسییەکی ئایدۆلۆجیش دادەنێ، کە کار دەکاتە سەر ئەمنی ئایدۆلۆجی عەرەبیو دژی دەوەستێتەوە، چونکە بەلای ئەوانەوە بیروباوەڕی شیعە بیروباوەڕێکی تایەفەگەریەو دەبێتە هۆی لاوازکردنی (انتما)ی نەتەوەییو ملکەچکردنی بۆ (انتما)ی تایفەیی.

- وێڕای ئەوە ئێران دەتوانێ یارمەتی کوردەکان بدا چ بۆ بەدەسهێنانی هەندێ مافی نەتەوەیی یا بۆ جیاکردنەوەو دروستکردنی دەوڵەت یا یەکگرتن لەگەڵ دەوڵەتی ئێراندا.

ئەمە لەڕوانگەی سەرنجی بەعسەوە ڕادەی ئەو مەترسییە دەردەخا، کە ئێران خستویەتیە سەر عێراق، بەڵام رژێمی بەعس خۆیشی مەترسی لەسەر ئەمنی قەومی ئێران دروست کردووە، چونکە چاوی بڕیوەتە ناوچەی عەرەبستان کە ئێستا بەشێکە لەخاکی دەوڵەتی ئێرانو عێراق ئەم ناوچەیە بە درێژبوونەوەیەکی سروشتیی ڕەشە خاك دادەنێ، لەلایەکی تریشەوە هەوڵی ئەوە دەدا کە سنوری نێوان هەردوو دەوڵەت لەبەشی ناوەڕاستدا بەجۆرێك ئاڵوگۆڕی تێدا بکرێ کە بەشێك لەناوچە شاخاویەکانیش بکەوێتە عێراقەوە، چونکە عێراق ئەم ناوچەیە کە ناوچەیەکی کوردستانەو لوڕی بچوکی تیا نیشتەجێیە، لەڕوانگەی شۆڤێنیانەی خۆی، بە خاکی عەرەب دادەنێ. لەڕاستیدا بەشێکی ململانێی نێوان دەوڵەتی عوسمانیو دەوڵەتی ئێران لەسەر خاکی کوردستان بووە، کە ئێستاش ئەم ململانێیە هەر درێژەی هەیە لەپێناوی دۆزینەوەو دەستگرتن بەسەر مەیدانی ژیانی نوێدا.

ب - تورکیا

هەرچەندە، لەبەر هەندێ هۆی سیاسی، لەبڵاوکراوە ئاشکراکانی دەوڵەتی عێراقدا ئاماژە بۆ مەترسیی تورکیا ناکرێ بۆسەر خاکی عێراق، بەڵام لەڕاستیدا بەعس تورکیاش بەیەکێ لەمەترسییە دەرەکییەکانی سەر ئەمنی ستراتیجیی عێراق دادەنێو لەلێکۆڵینەوە نهێنییەکانی دامودەزگا ئەمنییەکانو ستراتیجییەکانی خۆیاندا بە مەترسییەکی چاوەڕوانکراوی دادەنێن. بۆئەوەی ڕادەی ئەو مەترسییەو ئەندازەی گەورەیی بزانین، پێویستە چاوێك بە پێشینەی مێژوویی ئەو مەترسییەدا بخشێنینەوە:

١- پێشینەی مێژوویی

پەیمانی سایکس - بیکۆ قەڵەمڕەوی دەوڵەتی پانو بەرینی لەبەریەك هەڵوەشاوەی عوسمانی لەنێوان بەریتانیاو فەڕەنسادا دابەشکرد. هەردوو ویلایەتی بەغداو بەسرە بەر بەریتانیا کەوتنو لەساڵی ١٩٢١دا دەوڵەتێکی عەرەبی تیا

دامەزراند لەژێر انتدابی خۆیدا. ویلایەتی موسڵ (کوردستانی باشوور)کە بە گوێرەی ئەو پەیمانە بەر فەرەنسا کەوت، لەئەنجامی پێکگەیشتنی ژورژ کلیمانسۆ خرایە ژێر نفوزو دەسەڵاتی بەریتانیاو لەساڵی ۱۹۱۹دا لەلایەن بەریتانیاوە داگیرکرا. دەوڵەتی عوسمانی کە بەهەموو لایەکەوە کەوتبوونە ویزەی و بەچەپو راست لێیان دەداو بەش بەشیان دەکرد، بەم حاڵە قایل نەبوو. بریتانیا لەنەخشەی دابوو ئەم ویلایەتە بخاتە سەر عێراق، بەڵام دەوڵەتی عوسمانی هەر بە موڵکی خۆی دەزانیو دانی بە کێشەی موسڵدا نەدەنا، نەیدەویست لەبەرژەوەندی بەریتانیاو عێراق بێ، نەشیویست ببێتە دەوڵەتی کوردستانی باشوور. دەوڵەتی نوێی تورکیا کە لەسەر کەلاوەی دەوڵەتی عوسمانی دروست بوو، ئەو کێشەیەی بۆ مایەوە، کەمال ئەتاتورک لە۱۹۲۳/۷/۱٤دا خەلافەتی عوسمانی هەڵوەشاندەوەو لەشوێنیدا دەوڵەتی تازەی تورکیای راگەیاند، کۆمەڵێك گۆڕانکاری کردو توانی ئەزمیریش بگرێتەوە، کەبوو بەهۆی شەڕ وەستانی (مودانیا) لەنێوان بریتانیاو فەرەنساو ئیتالیاو تورکیا. ئەم بارودۆخە نوێیە هەڵوێستی تورکیای تا رادەیەك بەهێزکرد، پەیمانی (لۆزان)کە لە۱۹۲۳/۸/۱۰دا بەسترا، دانی بە دەوڵەتی تازەی تورکیادا نا. تورکیا بە پەیمانی سیڤەر رازی نەبوو، کێشەیەکی توندوتیژ لەنێوان تورکیا لەلایەكو بریتانیاو عێراقیش لەلایەکی تر لەسەر مەسەلەی کوردستانی باشوور پەیدابوو. لەئەنجامدا بڕیاردرا کە هەردوولا، واتە تورکیاو بریتانیا، لەنێوان خۆیاندا کێشەکە چارەسەر بکەن، ئەگەر لەماوەی ۹ مانگداچارەی بۆ دانەنرا، ئەوا حەواڵەی کۆمەڵەی گەلان بکرێت، لەساڵی ۱۹۲٤دا تورکیا ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ دەسهەڵگرتن لەکوردستانی باشوور بەمەرجێك ۱۰٪ی بەشی کۆمپانیای نەوتی تورکیای بدرێتێ، کە سنوری چالاکییەکەی کوردستانی باشوور بوو.

لەبەرئەوەی بریتانیا لەرێگەی گفتوگۆو لیژنەوە نەیتوانی هیچ لەگەڵ تورکیادا بکات، بۆیە بۆ لابەلاکردنەوەی کێشەکە کۆمەڵەی گەلان کۆمیتەیەکیان پێکهێنا بۆ توێژینەوە لێیو بەلایەکداخستنی، لەئەنجامدا، بەفیتی بریتانیا، لە۲٦/ ۱۲/ ۱۹۲۵دا، کوردستانی باشوور خرایە سەر عێراقو سنوریش بە گوێرەی هێڵی (برۆکسل)لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا کێشرا، پەرلەمانی تورکیاش لە۱۲/۲۵ی هەمان ساڵدا بڕیاریدا کە کوردستانی باشوور

بەزۆر لەعێراق نەسەنێتەوە. هەر لەئەنجامی ئەوەدا لە١٩٢٦/٥/١١دا ڕێککەوتننامەی عێراق ـ بریتانیا ـ تورکیا مۆرکراو عێراق هاتە سەر ئەو بڕوایەی کە ١٠٪ی فرۆشتنی نەوتی کەرکوك، بۆ ماوەی ٢٥ساڵ بدا بە تورکیاو تاکە گۆڕانێکی بچوکیش لە هێڵی بڕۆکسلدا بکرێت.

## ٢ـ مەترسی تورکیا بۆسەر ئەمنی ستراتیجی عێراق

مەترسی تورکیا بۆ سەر ئەمنی ستراتیجی عێراق لە دیدی ڕژێمی بەعسەوە دەشێ لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

*هەرچەندە کێشەی موسڵ لەساڵی ١٩٢٥دا لایەلا کراوەتەوە، بەڵام تورکیا بەتەواوەتی دانی پیانەناوەو تا ئەو ساڵانەی دوایش ویلایەتی موسڵ لەدەستووری دەوڵەتی تورکیادا بەبەشێك لەخاکی تورکیا دراوەتە قەڵەم. هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت کە تورکیا داوای بکاتەوەو خۆیشی مات کردووە کە عێراق لاواز بێت ئەوسا پەلاماری بداتو هەقی کۆنینەی خۆی بسەنێتەوە. ئەم کێشەیە وایکردووە عێراق هەمیشە لەژێر گوشاری تورکیا بێتو چەندین ڕێککەوتننامەی دوو قۆڵی لەگەڵدا مۆر بکاتو هەرکاتێ ملی نەدابێ بۆ مەرجەکانی، هەڕەشەی ئەوەی لێکردووە کە ویلایەتی موسڵ داوا دەکاتەوە.

*تورکمانەکانی عێراق: سەرەتای هاتنی تورك بۆ ئەم ناوچەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی دەیەمی زایینی کە لەگەڵ شەپۆلی مەغۆڵو تەتەرەکانو دوای ئەوانیش لەو ناوچەیەدا جێگیر بوون. تورکیا بوونی تورکمانەکان لەو ناوچەیەدا دەکاتە بەڵگەیەکی مێژوویی بۆئەوەی ئەو خاکە بەهی خۆی بزانێ، بەتایبەتی کە عێراق بۆ ماوەیەکی درێژی چەند سەدەیی لەژێر دەسەڵاتی تورکەکاندا بووە، ئەمە وێڕای ئەوەی تورکیا دەتوانێ تورکمانەکانی عێراق وەك گوشارێك بۆ سەر عێراق بەکاربێنێ، هەر بۆیە عێراقیش بە توندترین شێوە بەگژ تورکمانەکانی عێراقدا چوونەوەو بەو نیازەی (مەترسی)یان نەهێڵێتو هیچ پەیوەندییەکیش لەنێوان تورکمانەکانی عێراقو تورکیادا نەهێڵێت.

*عێراق مەترسی ئەوەشی هەیە ڕۆژێك لەڕۆژان گەر تورکیا بیەوێ یارمەتی کوردەکان بدا بۆ جیابوونەوە لەدەوڵەتی عێراق.

تورکیا بەرژەوەندی زۆری لەعێراقدا هەیە، هەرکاتێك ئەو بەرژەوەندییانەی بکەونە مەترسییەوە، گوشار بۆ عێراق دێنێ. لەناوەڕاستی هەشتاکاندا ڕۆژانە یەك ملیۆن نەوتی کەرکوك بەتورکیادا دەڕۆی، کە ١٣٪ی ئەم نەوتە بۆ تورکیا بوو[٤٨]، لەبری ئەوەی تورکیا ڕێگە بەعێراق بدا ئەو نەوتە بەوێدا بنێرێت، جگە لەوەی ١٠٪ی ئەم نەوتەش لە پاڵاوتگەکانی تورکیادا (تکریر) دەکرا بۆ پێداویستییەکانی ناوخۆی عێراق، تورکیا هەر بەرمیلێکی بە ١٤ دۆلار وەردەگرت و بە ١٣٠دۆلاریش پێی دەفرۆشتەوە. سەرباری ئەوەش تورکیا سەدی ئەتاتورکی کردۆتە نیشانەی هەڕەشەکردن لەعێراق و گرتنەوەی ئاوی فورات.

ئەم فاکتەرانە وایان لەعێراق کردووە ملکەچی داواکانی تورکیا بێت. چەندین ڕێکەوتننامەی سەر شۆڕانەی لەگەڵدا مۆر بکات و سەربەخۆیی بڕیاردانی سیاسی لەدەست دەربێنێ لەمەڕ چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشەی کوردەوە، ئەمەش لەو گوشارەی تورکیا دەردەکەوێ کە لەساڵی ١٩٨٤دا خستییە سەر عێراق و یەکێك بوو لەو فاکتەرانەی، بگرە فاکتەرێکی زۆر گرنگ بوو، کە کێشەی کورد لەعێراقدا لەڕێگەی ئاشتیانەوە چارەسەر نەکرێ.

ج ـ ئیسرائیل

دەوڵەتی ئیسرائیل لەساڵی ١٩٤٨دا بەگوێرەی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٩٤٧/١١/٢٩دا لەسەر خاکی فەلەستین دامەزرا، لەوساوە تا ئێستا ٣جەنگ لەساڵانی ١٩٤٨، ١٩٦٧و١٩٧٣ لەنێوان ئیسرائیل و دەوڵەتە عەرەبیەکاندا هەڵگیرساوە.

دەوڵەتی ئیسرائیل ستراتیجیی ئەمنی قەومیی خۆی لەسەر بنچینەی (الحدود الأمنة) داڕشتووە، بەم شێوەیە سیاسەتێکی فراوانخوازیی هەیە کە گەرەکێتی خاکی دەوڵەتە عەرەبییەکانی تریش داگیربکات و هەڵیان لوشێ، تاوەکو قەڵاییەکی جوگرافی و ستراتیجیی بۆ دەوڵەتەکەی خۆی دروست بکا، بەم پێیە بوونی ئیسرائیل لەوناوچەیەدا مەترسییەکە لەسەر ئەمنی قەومی عەرەبی. هەرچەندە چەندین دەوڵەتی عەرەبی، چ بەئاشکرا و چ بەنهێنی، هەوڵی ئەوەیان داوە لەگەڵ ئیسرائیلدا ڕێکەون و کۆتایی بە حاڵەتی جەنگ بهێنن و ئارامی و

---

[٤٨] ـ پێش جەنگی عێراق ـ ئێران ئەم ڕێژەیە ١١,٢٥ ٪ بوو.

ئاسایش بگێڕنەوە بۆ ناوچەکەو دەوڵەتەکانی خۆشیان لەمەترسی جەنگ دوور بخەنەوە.

رژێمی بەعس لەعێراقدا، ئیسرائیل بەمەترسییەکی گەورە دادەنێ لەسەر قەوارەی عەرەب، بەتایبەتی بۆسەر ئەمنی ستراتیجیی عێراق، چونکە لایوایە خۆی نوێنەری هەرە شۆڕشگێڕی نەتەوەی عەرەبو پێشکەوتوترینیانە! لەڕاستیدا ئەمە لەچەند روویەکەوە ڕێتێناچێت، چونکە عێراق دەوڵەتێکە سنووری بە سنووری ئسرائیلەوە نییە، تا ئیستاش رۆڵێکی گرنگی نەبووە لە دژایەتیکردنی ئیسرائیلدا، بەقسە نەبێ، دووەمیش هەڵگیرساندنی جەنگ لەکوردستاندا دژی گەلی کوردستان خۆی لەخۆیدا سەرقاڵکردنی سوپای عێراقە بەجەنگێکی درێژخایەنی بێ کۆتایی، کە ئاسۆی برانەوەی جەنگەکە تەنیا بە چارەسەرکردنێکی ئاشتیانە لەڕێگەی سەلماندنی مافی چارەی خۆنوسینەوە دەردەکەوێ، واتە بۆتە هۆی دورخستنەوەی ئەو سوپایەی کە دەبوایە ڕۆڵێکی دیار لەجەنگی ئیسرائیل ـ عەرەبدا بگێڕێ.

سێهەمیان، هەڵگیرساندنی جەنگ دژی کۆماری ئیسلامیی ئێران بەو بیانووەی باری گلاوی خۆی لەڕێککەوتننامەی شاـ سەدامدا راستکاتەوە کە بۆتە هۆی ئەوەی هەم ماکینەی سوپای عێراق تێكو پێك بدرێتو زەرەرو زیانی زۆری بەریکەوێتو سەروەتو سامانی عێراق لەجەنگێکی نارەوادا بەفیڕۆ بداتو رۆڵەکانی بە گەروی ئەو جەنگەدا بکاتو هەم بۆتە هۆی پارچە پارچە بوونی رای عەرەب سەبارەت بەکێشەو بیرچوونەوەی ناکۆکی سەرەکیان لەگەڵ ئیسرائیلو ئەمەریکادا. کە ئەمەش بۆتە هۆی: چوارەم: نزیکبوونەوەی عێراق لە دەوڵەتە هەرە کۆنەپەرستەکانی عەرەب وەك ئوردن، عەرەبستانی سعودی، دەوڵەتەکانی کەنداو، نزیکبوونەوەی لە میسرو رێککەوتننامەی کامپ دیڤید. جگە لەوەی، پێنجەم: هەمیشە هەوڵی داوە بەرەی فەلەستینییەکان پارچە پارچە بکاتو یارمەتی ئەو لایەنەش بدات کە گێرەشێوێنیو پشێوی لەناو ریزەکانیدا دەنێنەوە.

هەر بۆیە ئێستا نەعێراق هیچ مەترسییەکی ئەوتۆی لەسەر ئیسرائیل پەیدا کردووە وەك ئەوەی خۆی دیعایەی بۆدەکا، نەئیسرائیلیش عێراق بە مەترسی دەزانێ لەسەر خۆی، چونکە هەڵوێستە کردەوەییەکانی خزمەتی بەرژەوەندییەکانی ئیسرائیل دەکا.

لەراستیدا ترسی عێراق لـە سـنووری ڕۆژئـاوا لەوەدایـە کـە بەربەسـتێکی سروشتی نییە تا بتوانـێ بـەرگری تێـدا بکـا، چـونکە ناوچـەیەکی بیابانییـەو بیابانیش ئێستا بە سنورێکی جیاکەرەوە حساب نـاکرێ، بـەڵکو بـە سـنورێکی پێکەوەبەستن دادەنرێ، هەربۆیە عێراق، لە ڕووی سوپاییەوە، بەرزاییەکانی گولان (جۆلان)و کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری ئوردن بـە هێڵـی بـەرگریکردن دادەنـێ بـە نیسبەت عێراقەوە.

د ـ کودەتا سوپاییەکانی دەوڵەتە عەرەبییە هاوسێکان

بەعس ئەمنی عەرەبی لەڕوانگەی بۆچوونەکانی خۆیەوە دەبینێ، هـەر بۆیـە لەدەسدانی دەسەڵاتی سیاسی خۆی بە گەورەترین مەترسی دادەنێ لەسەر ئـەمنی قەومیی عەرەبی، عێراق لەگەڵ ئەوەشدا چـەندین گیروگرفتـی سـنووری لەگـەڵ دەوڵەتە عەرەبیەکانی سوریا، ئـوردن، عەرەبسـتانی سـعودیو کوێـت هـەبووەو هەیە، لەهەمان کاتیشدا هەوڵدانی ئەو دەوڵەتانە بۆ هێنانە سەرکاری ڕژێمێکی وا کە لەخۆیانەوە نزیك بێ، هەر لەئارادا بووە، دیـارە ئەمـەش زیـاتر لەڕێگـەی کودەتای سوپاییەوە ئەنجام دەدرێت. بۆیە بەعس ئەو کودەتا سوپاییانەی بـەفیتی ئەو دەوڵەتانە دەکرێ لەپێناوی لادانی ڕژێمی بەعسو هێنانە سەرکاری ڕژێمێکی نزیك لەخۆیان، بە مـەترسییەکی گەورە دادەنێ لەسەر ئەمنی ستراتیجیی عێراق.

## ١ـ٢ـ٣ ئـەو ڕێوشـوێنانەی ڕژێمـی بـەعس گرتویەتیـە بـەر بـۆ نەهێشـتنی (مەترسی کورد) لەسەر پاشە ڕۆژی دەوڵەتی عێراق

ڕژێمی بەعس لـە ڕوانگەیـەکی شۆڤێنیسـتیو ڕەگەزپەرسـتانەوە دەڕوانێتـە مەسـەلەی کـوردو جوڵانـەوە شۆڕشـگێڕانەکەی، بۆیـە بـەگوێرەی سـتراتیجێکی دیاریکراو بەپێی تاکتیكو نەخشەو پلانی وردو حسابکراو دەیەوێ نەتەوەی کـورد لەعێراق لەناو ببات، و خاکی کوردستانی عێراق داگیرو تەعریب بکات، بـەنیازی ئەوەی (مـەترسی کورد) لەسەر پاشەڕۆژی دەوڵەتی عێـراق نـەهێڵێو زەمینـەی جیابوونەوە بۆ جوڵانەوەی ڕزگاریی نیشتمانیی کوردستان لەعێراقدا سـاز نـەبێ، بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستەش گەلێ ئامرازو شێوەی بەکارهێناوە، کە ئەمانەن:

## یەکەم: ئامرازە ناوەکییەکان

ئەو ئامرازو رێو شوێنانەیە کە رژێمی بەعس لەبوارە جیاجیاکانی سیاسی - کۆمەڵایەتی، سوپایی، ئابووری، دیمۆگرافی، ئەعلامی - ئایدیۆلۆجیدا گرتویەتیە بەر بۆ لەناوبردنو تێکشکاندنی جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان لەعێراقداو تەفروتوناکردنی گەلی کورد.

### ١- لەبواری سیاسیدا

لەرووی سیاسیەوە نەخشەکەی بەعس بۆئەوە نییە کورد قایل بکات، بۆئەوە نییە مافەکانی بداتێو لەرێگەی دابینکردنی مافەکانەوە، لەرێگەی دڵخۆشکردنی کوردەوە بەقەوارەی عێراق هەم پتەوی ناوەکی دابین بکاتو هەم هێزێکی زیاتریش بۆ پاراستنی عێراق، ساز بدات، بەڵکە سیاسەتەکە رووی لەقوتدانی نەتەوەی کوردە لەکوردستانی عێراقدا، لەرێگەی:

١- نکوڵیکردن لەبوونی کوردو داننانی سەرزارەکی بەمافەکانیدا لەرێگەی ساختەکردنی مافەکانییەوەو دروستکردنی چەندین داموو دەزگای درۆینەی وەکو: ئەنجومەنی یاسادانان، ئەنجومەنی جێبەجێکردن، پارتە کارتۆنییەکان..تا لەژێر پەردەی داننان بەو مافانەدا بەتوندترین شێوە بچێتەوە بەگژ گەلی کورددا، لەناوی بەرێ، سیاسەتی تەفروتوناکردنی پەیرەو بکات.

٢- سیاسەتی بەعس دەربارەی کورد بریتییە لەتەختکردنی کێشەی کورد لەسەر بنچینەی رەگەزپەرستی شۆڤێنیستی بەعسیانە لەچوارچێوەی عێراقدا، واتە: نەهێشتنی کێشەی کوردو تەختکردنی کۆسپی کورد لەبەردەمی سیاسەتی فراوانخوازی بۆرجوازی ناسیۆنالستی عەرەبدا، کە دەیەوێ عێراق بە وڵاتێکی عەرەبی بکا، بە بەشێکی لەیەکچووی نیشتمانی عەرەبی، بەشێکی ئەوتۆ کە لەرووی نەتەوەیی‌و زمانو فەرهەنگەوە لەباقی وڵاتەکانی عەرەبی بچێ. هیچ کێشەو بەرگریەکیشی تیا نەمێنێ.

ئەم سیاسەتەی بەعس بۆ دەوڵەتو حیزبەکەی هەموو رێوشوێنو تاقیکردنەوەیەك لەچوارچێوەی ئەو تێگەیشتنە ستراتیجییەدا بە حەڵاڵو رەوا دادەنێ.

بۆیە پێویستە ڕۆڵەکانی کورد، سیاسیو تێکۆشەرەکانی، ڕۆشنبیرو زاناو هونەرمەندانی، هەموو چینو توێژەکانی گەلی کورد هەموو شتێکی خراپ دەرهەق بەخۆیان لەحیزبو دەوڵەتی بەعس چاوەڕوان بکەن، هیچ ڕەفتارێکی نامرۆییو بەد بەدوور نەگرن. سێکوچکەی بەعسیان: تەرحیل، تەعریب، تەبعیسو کوشتو برین هەمووی بۆ جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە مەرکەزییەی حیزبو دەوڵەتی بەعسە.

٣ـ بەگژاچوونی جولاّنەوەی ڕزگاریی نیشتمانی کوردستان هەم لەڕێگەی لاوازکردنو پەکخستنی، هەم هەوڵدان بۆ ناوزڕاندنو شێواندنی ناوەڕۆکە دیموکراتییە شۆڕشگێڕەکەی، بەخستنە پاڵی تۆمەتی: بەکرێگیراو، کۆنەپەرست، دەسیسەی زایۆنیزم.

٤ـ تێکدانی یەکێتیی نەتەوەی کوردو پارچە پارچەکردنی جولاّنەوەی ڕزگاری نیشتیمانیی کوردستان بەهۆی دروستکردنی:

* بۆشاییەکی جوگرافی ـ زەمینی لەنێوان کوردستانی عێراقو خەلکەکەیداو لەنێوان پارچەکانی تری کوردستانو خەلکەکەیدا.

* بۆشاییەکی سیاسی ـ ئایدیۆلۆجی لەنێوان هێزە شۆڕشگێڕەکانی کوردستانی عێراقو دامو دەزگاکانی تری کوردستانی گەورەدا.

واتە تێکدانی قوڵایی نەتەوەییو ستراتیجیی جولاّنەوەی ڕزگاریی نیشتمانی کوردستان لەعێراقدا.

٥ـ هەوڵ دەدات مەسەلەی لەناوبردنی کوردو کوردستان بخاتە قاڵبی ئەوە کە شەڕی ئێستا، شەڕی نێوان هەوڵی بەرەو پێشەوە بردنی میللەتی دواکەوتوی کوردو ئاوەدانکردنەوەی خاکی بەجێماوی کوردستانە لەلایەكو لەلایەکی ترەوە بەرگری تاقمێکی دواکەوتوی دوژمنی پێشکەوتنو ژیانی هاوچەرخو ئاوەدانییە، شەڕی نێوان نەتەوایەتی عەرەب (پێشکەوتنخوازو پێشڕەو) و نەتەوایەتی کوردی "کۆنەپەرستو بەجێماو". شەڕی میللەتێکە کە هەر حەز لەئاژاوەو پشێویو بەربەرەکانێی دامو دەزگاکانی ئیداریو بەڕێوەبردنو پێشکەوتنو یاسایەو شەیدای کوشتنو برینو یاخیبوونو هەژاریو برسێتیو شاخەو شاخ کردنە. شەڕی میللەتێکە کە بەفیتی بێگانەو ئیمپریالیزمو دوژمنانی عەرەب دەیەوێ ڕێگە لەپێشکەوتنو یەکگرتنەوەی عەرەبو ئارامو

ئاسایشی ناو عێراق بگرێ، تا نەیپەرژێتە سەر پێشخستنی ئابووری، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی....[49].

٦ـ بەعەرەبکردنی کوردستانو کورد تا شوێنەواری نەتەوەییو ڕوخساری نەتەوەی کوردستان بسڕێتەوە، بە پەیڕەوکردنی سیاسەتی "استعماري استطاني"و شێواندنی ڕاستیيە مێژوییو جوگرافیەکانو تەنگ هەڵچنین بە کوردو ڕاگواستنیان لەناوچە تێکەڵاو، نەوتاویو ستراتیجییەکاندا.

٧ـ بە بەعسکردنی کورد لەڕێگەی زەبرو زەنگو تەفرەدانو لەخشتەبردنەوە بەمەبەستی لاوازکردنی جوڵاتەوەی رزگاری نیشتمانیی کوردستانو بەگژاچوونی جوڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی کورد بە کنەکردن لەکۆمەڵی کوردەواریدا، تا کورد بکاتە جاسوسو شۆفار بەسەر خزمو کەسو هاونەتەوەکەی خۆیدا، بۆئەوەش لەجوڵانەوەی نەتەوەکەیان دایانبڕنو ریسوایان بکەنو بیانشکێنن، بۆئەوەی وەکو مرۆڤیش ئەوان سوك بکەن لەنەتەوەکەیان بشۆرێنەوە، کەلکی خزمەتکردنی مەسەلەی میللەتەکەی خۆیان نەمێنێ، ئەگەر بشکرێ بەگژ مەسەلە ڕەواکەی خەڵکی کوردستانیاندا بکەن.

٨ـ قوڵکردنەوەی ئەو چەمکەی کە گوایا کورد لەسەر خاکی خۆی ناژی، بەڵکو میوانە لەسەر خاکی عەرەب، هەربۆیە دەوڵەتی عەرەبی عێراق هەقی خۆیەتی دەریان بکا، ڕایانگوێزێ، لەناوچە ستراتیجییو (نەوت)ییەکان نەیانهێڵێ، چونکە بونەتە مایەی سەرێشە بۆ "عەرەبی خانەخوێ".

٩ـ تێکدانی برایەتیو هاوخەباتی کوردو عەرەب، کوردو تورکمان لەڕێگەی کردنی عەرەب بە ئامرازێك بۆ چەوساندنەوەو ستەم کردنی نەتەوایەتی، بۆ کوشتنو بڕینی کورد، بۆ بەرپاکردنی جەنگی تەفروتوناکردنی کورد، بۆ عەرەبکردنی کوردستانو نیشتەجێکردنیان لەخاکی باوو باپیرانی کوردو پەرەوازەکردنی دانیشتوانەکەی. هەروەها تێکدانی هاوخەباتیو پەیوەندی لەمێژینەی کوردو تورکمان بە نانەوەی چەندین پیلانو بۆ تەقاندنەوەی ئەو پەیوەندیەو پچڕاندنی، واتە ڕژێم مەبەستێتی ناکۆکی نێوان کوردو ڕژێمی داگیرکەری بەعس بکاتە ناکۆکی نێوان هەردوو نەتەوەی کوردو عەرەب،

---

[49] ـ جوامێر، چەند ڕەواڵەتێکی نوێی پیلانەکانی دوژمن بۆ بەگژاچوونی شۆڕشی کوردستانی عێراق، گۆڤاری کۆمەڵە ژمارە٢، ١٩٧٩ل٤.

بەقولکردنەوەی ناکۆکییەکەو هاندانی عەرەبی عێراقو دنەدانیان تا کوردو کوردستان لەناوبەرن.

١٠ـ هەولدان بۆئەوەی پیلان دژی ڕێکخراوەکانی جولانەوەی رزگاریی نیشتمانی کوردستان بگێڕێ، بەگژ یەکیاندا بکا، هەولی کوردانەدنی شەڕی نێوانیانو پارچە پارچەکردنی ڕێکخراوەکانی بدا، چ لەڕێگەی دروستکردنی پارتە کارتۆنیەکانەوە، لەڕێگەی هاندانی دەستەوتاقمی بان ـ چەپ بۆ نانەوەی ئاژاوەو پشێویو پارچەکردنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، بۆئەوەی لەبەرچاوی خەلك هەم سوکیان بکاو هەم لاوازیشیان بکا.

١١ـ هەلوەشاندنەوەی هەموو دامو دەزگا زانستیو ڕێکخراوە دیموکراتیو پیشەییو جەماوەرییەکانی کورد کە بەخەباتی درێژخایەنو ماندو بوونی چەند ساڵەی هەولو تێکۆشان بە دەستی هێنابوون، وەك کۆڕی زانیاری کورد، ڕێکخراوەکانی قوتابیانو لاوانو ئافرەتانو مامۆستایانو جوتیاران...هەروەك ڕێگەگرتن لەچالاکیو ڕێکخراوە هونەرییەکان، تا هونەری کوردی بەرەو پێشەوە نەچێ.

١٢ـ گفتوگۆکردن وەك مانۆڕێکی سیاسی لەگەل جولانەوەی کوردا: لەبەر چەندین فاکتەر یەکێك لەخاسیەتەکانی جولانەوەی رزگاریی نیشتمانیی کوردستان لەعێراقدا، هەروەك یەکێك لەتاکتیکەکانی حکومەتەکانی عێراقیش گفتوگۆ بوون. مێژووی جولانەوەی کورد لەعێراقدا بریتی بووە لەشەڕکردنو گفتوگۆکردن دیسان شەڕکردنەوە و گفتوگۆکردن... لەبەرئەوەی مەسەلەی کورد مەسەلەیەکی سیاسیە، هەربۆیە هەرکاتێ حکومەتەکانی عێراق، لەوانەش بەعس، نەرمی نیشان دابێ، ئامادەی گفتوگۆ بووبێ حیزبو ڕێکخراوەکانی جولانەوەی رزگاریی نیشتمانی کوردستانیش ئامادە بوون، هەرکاتێکیش بازوی جولانەوەکە ئەستور بوبێ، گەشەی کردبێ، ڕژێمیش نەیتوانیبێت لەڕێگەی سوپاییەوە چۆکی پێداداو توشی گێژاوی سیاسی بوبێ ئەوا هاتۆتە پێش بۆ گفتوگۆکردن، بەلام هەموو حکومەتەکانی عێراق، بەبەعسیشەوە، هەمیشە گفتوگۆیان، وەك مانۆڕێکی سیاسی بەکارهێناوە بۆ کزکردنو لاوازکردنو پاشقولگرتن لەشۆڕشی کوردستانو ناو زڕاندنو سوکو ڕیسواکردنی لای دۆستو هاوپەیمانەکانیو هەمیشە وەك گەمە تەماشای گفتوگۆیان کردووە.

١٣ـ وەرنەگرتنی کورد لەدام و دەزگا گرنگەکانی دەوڵەت، سوپا، کۆلێجەکانی نەوت و ئامۆژگاری نەوت، کۆلێجی پەروەردەی وەرزش، (زمالة)و (بعثة)..تا کورد نەتوانێ کادری زانستی هەبێ کە ئەمانە لە جەردی ستراتیجیدا یەکێ لەخاڵە بەهێزەکانی هەر نەتەوەیەك پێکدێنن.

١٤ـ پەرەوازەکردن و دەربەدەرکردنی کورد بۆ ناوچەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق بۆ گەڕان بەدوای کارو ژیاندا یا بەهۆی نەفیکردنەوە.

١٥ـ ژیاندنەوەی پاشماوەکانی دەرەبەگایەتی وخێڵەکی لەکوردستاندا: (حیزبی بەعس کە نوێنەری جیهانبینی و بیرو بۆچوونی باڵی نەتەوە پەرستی و بۆرجوازی بیرۆکراتی مشەخۆری عەرەبە، بەحوکمی ڕەوشتی چینایەتی خۆی ئەبێ دژی پاشماوەی چینی دەرەبەگ و پەیوەندی کۆمەڵایەتی دەرەبەگی و فەرهەنگی دەرەبەگی و پەیوەندی خێڵەکی بێ لەناوچە دێهاتەکاندا، وەهەوڵی دامەزراندنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی بۆرجوازی بدا، لەڕاستیدا لەوەتەی هاتۆتە سەر کار گەلێك قانون و یاساو ڕێگەو شوێنی داناوە بۆ هەلکەندنی ڕەگوڕیشەی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، فەرهەنگی... دەرەبەگایەتی لەژیانی کۆمەڵاتی خەڵکی دێهاتەکانی ناوەڕاست و جنوبی عێراقدا. بەڵام هەمان حیزب کە حوکمی عێراق ئەکات و پەیڕەوی ئەو سیاسەتە ئەکات بەرامبەر بەچینی دەرەبەگ لەناوچە عەرەبییەکاندا، لەکوردستاندا سیاسەتێکی تری گرتۆتەبەر کە بەتەواوی پێچەوانەی ئەو سیاسەتەیە، کەبریتییە لەبوژاندنەوەو بەهێزکردن و جێگیرکردنی دەرەبەگایەتی و ڕیشە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگییەکانی و هێشتنەوەی پەیوەندی دەرەبەگی لەژیانی خەڵکدا، بۆئەمەش نەك هەر قانونی (إصلاح زراعي)و یاساو ڕێوشوێنەکانی چاککردنی کشتوکاڵی لەکوردستاندا بۆ زۆرکەس و لەزۆر شوێن، بەبڕیاری (مەجلس قیادەی سەورە) ڕاوەستاندوە، بەڵکو لەزۆر جێگەو دام ودەزگاکانی دەوڵەتی (ادارەو پۆلیس و امن و استخبارات و جەیش...)و دام ودەزگاکانی حیزبی بەعس سەرلەنوێ دەسەڵاتی دەرەبەگەکانیان زیندوکردۆتەوە بۆئەوەی دەس بەسەر ناوچەکانی خۆیان و جوتیارەکانیدا بگرنەوەو تەنانەت لەهەندێ شوێن کە بەڕێکەوت و لەهەندێ هەلومەرجی تایبەتیدا (إصلاح زراعي) تێدا کرابوو، یارمەتی دەرەبەگەکانیاندا بۆئەوەی ملکانەی کەڵەکەبووی چەند ساڵیان بەزۆر لێوەربگرنەوە، یا هەر دەریان بکەن لەگوندو زەوی و زارەکانیان،

بەبێ ئـەوەی هـیچ دەزگایـەکی حکومـەت لەشـکاتو سـکاڵای جوتیارەکـان بپرسێتەوە[50].

دیـارە ئەمـەش ڕوویـەکی تـری سیاسـەتی بەعسـە بـۆ دەسـتگرتن بەسـەر کوردستاندا لەڕێگەی چینی دەرەبەگی کورد بەهەر سێ توێژەکەیـەوە (زەویـداری گەورە، شێخەکان، سەرۆکی عەشیرەتەکان)، چـونکە ڕووداوەکـانی یـەك سـەدەی ڕابردوو خیانەتی چینی دەرەبەگی کوردستانی سەلماندوە، هەروەك هاوکاری حیزبی بەعس لەگەڵ چینی دەرەبەگی کـورد، بـۆ سـازدانی هێـزی مرۆیـی کـورد دژی شۆڕشی کورد، بۆبەشدار بـوون لەجـەنگی عێـراق ئێرانـدا، ڕووی ڕاسـتەقینەی داگیرکەرانەی حیزبی بەعس، بەباشترین شێوە دەردەخا.

١٦ـ پێکەوەنانی هێزی جاشو ئـەفواجی خەفیفـە بـۆ دژایـەتیکردنی شۆڕشـی کوردسـتان: (مەبەسـتی ڕژێمـی بـەعس لەدروسـتکردنی "الافـواج الخفیفـة" بەتەنیا سوپایی نیە، بەڵکو سیاسیو کۆمەڵایەتیشە، کە ئەمانە هەندێکیانن:

١ـ تێکدانی یەکێتی ریزەکانی میللەتی کـورد، بـەوەی گیـانی دەرەبەگایـەتیو پەیوەندی خێڵایەتی تیا زیندو بکەنەوە، بـەوەی کـە (یـەکێتی خـێڵ) بخەنـە شوێنی (یەکێتی نەتەوە) یا (یەکێتی گەل)ەوە، زیاتر میللەتی کورد بـەهۆی نـاکۆکی خێڵایـەتیو دوژمنایـەتی عەشـایەریو زیندوکردنـەوەی نـەریتی عەشایەرییەوە پچرپچڕ بکەنو بۆ دواوەی بەرنەوە. دەرەبەگایەتی کورد مانەوەی خۆی لەنۆکەری دەسەڵاتی داگیرکەری ناوەندیدا دیوە. نزیکەی قەرنێکە ئەمـە بۆتە دیاردەیەکی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئـابووری لەکوردسـتاندا، سـەرەڕای جیاوازی سروشـتی چـینایەتیو سیاسـی ئـەو ڕژێمانـەی حـوکمی عێراقیـان کردووە.

٢ـ کورداندنی شەڕ لەکوردستاندا، بەوەی کە شەڕ لەنێوان هێـزی پێشـمەرگەی کوردو هێزی داگیرکەری عێراقدا بگۆڕێ بە شەڕی بەینی هێـزی پێشـمەرگەی کوردو هێزی جاشی کورد[51].

---

[50]ـ ماهی، لە تاکتیکەکانی بەعس بۆ بە گژاچوونی شۆڕشـی کوردسـتان، بەشـی دووەم (ئـەفواجی خەفیفە)، گۆڤاری کۆمەڵە، ژمارە ٥، خولی ٣، ئایاری١٩٨٥، ل٣٩.

[51]ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤٢ ـ٤٣.

ب ـ لەبواری سوپایدا

ئەمنی ستراتیجی عێراق، لەبواری سوپایدا، رووی کردۆتە داگیرکردنی سوپایی کوردستانو بەگژاچوونی شۆڕشی کوردستانو تەفروتوناکردنی کورد.

١ـ داگیرکردنی سوپای کوردستان: رژێمی بەعس دەیەوێ لەرووی داگیرکردنی سوپاییەوە درێژە بە سیاسەتەکانی خۆی بدا، کوردستان کاول بکا، گەلەکەی دەربەدەربکا، سەروەتو سامانەکەی بەتاڵان ببا، بە سەدان سەربازگەی گەورەو بچووك، قەڵای سەربازی، دەیان فڕۆکەخانە، بەهەزاران ڕەبییە بەدرێژایی و بەپانایی کوردستان دانراون، ژمارەی ئەو سەربازگەو ڕەبیانەی لەسەر لوتکەی شاخو قوتەکان، لەسەر گردو کۆسپەکان،لەدەشتایی و سەر چۆمو ڕێگاو بانەکان، لەدەوری شارو شارۆچکەکاندا هەن، گەلێ زیاتر لەژمارەی شاروشارۆچکەو گوندەکانی کوردستان، ژمارەی ئەو بازگانەی لەسەر ڕێگاو بانی شارەکاندا دانراون لەئەندازە بەدەرن، ئەمانە هەمووی سیمای داگیرکردنی سوپایی کوردستان دەردەخەن کە بێ ویستو ئارەزووی گەلی کورد، بە هێزێکی سوپایی زۆرەوە، چۆکیان لەسەر سینگی کوردو کوردستان داداوە.

٢ـ بەگژا چوونی جوڵانەوەی کورد لەرووی سوپاییەوە بەهۆی: سوپا، جاش، جاشی خەفیفە، دامو دەزگا داپڵۆسێنەرو تۆقێنەرو جاسوسییەکانەوە لەڕێگەی:

*بەکارهێنانی زەبرو زەنگو دامرکاندنەوەی خوێناوی و پەلاماری چەکدارو تەفروتوناکردنی نەتەوەیی دژی جوڵانەوەکەو دژی دانیشتوانی بێدەرەتانی کوردستان، لەشارو گوندەکاندا، بەپەیڕەوی سیاسەتی کوشتو بڕی هەمیشەی، قەڵاچۆکردنی کورد بەجۆرێ (نمونەی دەسەڵاتی سیاسی بەعس لەکوردستاندا ڕەنگە لەدنیادا بێ وێنەبێ، تەنانەت ئەو فلیمانەی لەسینەماکاندا لەسەر ڕەفتاری نازی و فاشییەکان لەگەڵ گەلانی ژێر دەستەدا لە چلەکانداو ئەو چیڕۆکانەی لەم بابەتەوە نوسراون، یا ئەو هەواڵانەی لەڕادیۆکانەوە لەسەر ڕەفتاری سەهیۆنییەکانو ڕەگەزپەرستانی ئەفریقا بەرامبەر رەشەکان .... ئەبیسترێن، هێشتا ناگەنە ڕەفتاری بەعس لەگەڵ کوردا، بەتایبەتی ئەگەر ڕەچاوی ئەوە بکرێ کە دەسەڵاتی سیاسی بەعس، نمونەی دەسەڵاتی سیاسی هێزێکی داگیرکەری دواکەوتوی بێبەشە لە(قیەمونەخلاقی) شارستانی کۆنو

نــوێ دووره، لــەداب‌و نــەریتی مرۆڤایــەتی، تەنانــەت بێناگایــە لــەقانون‌و ئسولەکانی ئمپریالیزم لەبەڕێوەبردنی گەلانی ژێردەست‌و وڵاتان‌و داگیرکراودا[٥٢].
*سیاســەتی بەســوتماککردنی خــاکی کوردســتان بەســوتاندن‌و کــاولکردنی دێهاتەکان، سوتاندنی جەنگەڵ‌و لێرەوارو ڕەزو باخەکانی، کوێرکردنەوەی کارێزو کانیاوەکــانی، ڕاگواســتن‌و کۆچــپێکردنی دانیشــتوانەکەی، کوشــتن‌و بڕینــی خەڵکەکەی بە بۆمبابــاران‌و تــۆپ بــارانکردنی بــەردەوامی گونــدو لادێکــانی کوردستان بۆئەوەی هیچ شوێنەوارێکی ژیــانی ئاســایی لێنــەمێنێ‌و بــڵاوە بــە هەموو شۆڕشــی کوردســتان بکــا، بنکــەی جــەماوەری نــەهێڵێ، هــەر بۆنــەم مەبەســتە گشــت ناوچــە ســنوورییەکان، ناوچــەکانی تــەوەرە ســتراتیجیەکان‌و ناوچەکانی قوڵایی کوردستانی کاوڵ‌و خاپوور کردووە.
*قەدەغەکردنی کۆلێجــەکانی ســەربازی، پــۆلیس، ئــەمنی قــەومی لــەکوردو دەرکردنی ئەفسەرە کوردەکان لەڕیزەکانی سوپاو پۆلیس، بەتایبــەتی لەشــوێنە گرنگەکاندا، و تەسریحکردنی کوردەکانی ناوجەیش.
٣ـ مەسەلەی دەرخستن‌و هێشتنەوەی دیاردەی داگیرکردنی سوپایی کوردستان هەرتەنها لەبەر بوونی شەڕو شۆڕنییە، بەڵکو بۆ ئەنجامدانی هەنــدێ ئیجرائــاتی سیاسیشە، تا بتوانێ خەڵك بترسێنێ‌و بتۆقێنێ، تا بتوانێ لــەژێر ســێبەری ئــەو شوێنەوارە سایکۆلۆجییەدا سێکوچکەی بەعسیان وەك سێ دڕکی تیژ لەویــژدانی گەلی کورددا بچەقێنێ.

ج ـ لەبواری ئابووریدا

ئەمنی ستراتیجی عێراق لەبواری ئابووریدا ڕووی کردۆتە:
١ـ بێبەشکردنی کوردستان لەدامەزراندنی کارگەو کۆمپانیای پیشەسازی:
ڕژێمی بەعس لەروانگەیــەکی شــۆڤێنیانەوە نەخشــەو پەرەپێــدانی عێراقــی دارشتووە بــەجۆرێ هــیچ داموو دەزگایــەکی پیشەســازیی گــرنگ لەکوردســتاندا دانەمەزرێنراوە، جگە لەچەند کارگەیەکی بچــکۆلە، کــە لــەژمارەی پەنجــەکانی هەردوو دەست تێپەڕکەن، وەك: کارگەی شەکر، چیمەنتۆ، جگــەرە، پوختــەکردنی تووتن، مــافور، کە:

---

[٥٢]ـ ماهی، شۆڕش‌و دەسەڵاتی سیاسی، گۆڤاری کۆمەڵە، ژمارە٣، خولی٣،ئازاری ١٩٨٥، ل٢٢.

*ئەم پرۆژانە زەرەر دەکەنو قازانجیان نییە.
* ئەم پرۆژانە شتی بچوكو کەمبایەخن لەمەسەلەی پەرەپێدانی ولاتدا. ئەو پرۆژانەی کەلەبواری پەرەپێداندا رۆڵی کاریگەر دەگێرن: پرۆژەکانی ئاسنو توانەوە، فۆسفاتو پترۆکیمیاوی، ئۆتۆمبیلسازی، کە هەموویان لەباشوورو ناوەراستی عێراقدان.

٢ـ چۆڕبڕکردنی نەوتی کوردستان: رژێمی بەعس دەیەوێ هەرچی زووترە نەوتی کوردستان چۆڕبڕبکا، بەپەلە دەریبێنێ تا بتوانێ درێژە بەجەنگی کوردستان بدا لەلایەكو لەلایەکی تریشەوە درێژە بەجەنگی عێراق ـ ئێران بدا. لەناوەراستی هەشتاکاندا رێژەی دەرهێنانی نەوتی کەرکوك گەیشتە لە١٠٠٪. تەها جەزراوی لەچاو پێکەوتنێکا لەگەڵ رۆژنامەی (السیاسة)ی کویتیدا لەمانگی تەمووزی ١٩٨٦دا دانی بەوەدانا کە ئابووری عێراق ٩٠٪ی ئابوورییەکی نەوتە[٥٣]، بەڵام بەگوێرەی هەندێ سەرچاوەی باوەرپێکراو ئەو رێژەیە خۆی دەگەیەنێتە ٩٥٪. واتە ئابووری عێراق، لەکاتی ئێستادا، بەشێوەیەکی هەرە سەرەکی پشتی بە ئابووری نەوتی کوردستان بەستووە، کە ٩٥٪ی ئابوورییەکەی پێکدێنێ.

٣ـ لەرووی بژێوەوە:
*تەفروتوناکردنی سامانی کشتوکاڵیو ئاژەڵی کوردستان. سووتاند رەزوباخو دارستانو لێرەوارەکانی تا کورد نەتوانێ سودی لێببینێو پێیبژێت.
* دەسگرتن بەسەر سەرچاوەکانی، دەغڵودانو دانەوێڵە، ئەو دەغڵو دانەی لەخۆشکردنی ژیانی دانیشتوانی کوردا رۆڵی گرنگی هەبووە، ٥/٤ی دانەوێڵەی عێراق لەکوردستانەوە دابین دەکرێ، هەر بۆیە رژێمی بەعس دەستی بەسەر زۆربەی ئەو ناوچانەدا گرتووەو بە عەرەبی کردوون تا ئەمنی بژێوی خۆی دابین بکا، کوردیش بێبەری بکا لەسامانەکەی.
* دەسگرتن بەسەر بازرگانی توتندا، کە ئەویش بەروبومێکی پیشەسازیی گرنگەو رێژەی بەرهەمهێنانی لەکوردستاندا زیاتر ٩٨٪ی رێژەی بەرهەمهێنانیەتی لەعێراقدا.

---

[٥٣]ـ بروانە، الشرارة: الجریدة المرکزیة للاتحاد الوطني الکردستاني، العدد٧، السنة١٢، تموز١٩٨٦، ص٤.

*دەسگرتن بەسەر بازرگانی ناوەوەو دەرەوەدا.

٤ـ لەڕووی وزەوە: پێبەشکردنی کوردستان لە سەرچاوەکانی وزە، کە ماکینەی پیشەسازیو ڕەوتی بەرەو پێشەوەچوونی کۆمەڵی پێدەگەڕێ. بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم راستیە، ئێستگە کارەباییەکانی عێراقو توانای بەرهەم هێنانیان لەخوارەوە روون دەکەینەوە:

| ژ | ناوی ئێستگە کارەباییەکە | شوێنەکەی | وزەی بەرهەمهێنان (بەمێگاوات) |
|---|---|---|---|
| | أ ـ ئێستگە کارۆ گەرماییەکان | | |
| ١ـ | باشووری بەغدا... | دەروازەی سەربازگەی رەشید لەکەناری دیجلە نزیک پاڵاوتگەی دۆرە | ٢٠٠ |
| ٢ـ | دۆرە | | ٠٠٠ |
| ٣ـ | هارسە | هارسە/بەسرە | ١٢٠٠ |
| ٤ـ | نەبچیە | نەبچیە/بەسرە | ١٥٠ |
| ٥ـ | خور الزبیر | خورالزبیر/ بەسرە | ٦٣٠ |
| ٦ـ | ناسریە... | لەسەر رێگای ناسریە ـ بەسرە(١٥کم دوورە لەبەسرە) | ٨٠٠ |
| ٧ـ | دوبز | دوبز/کەرکوك | ٤٥٠ |
| ٨ـ | مەلا عبداللّە | لەسەر رێگای کەرکوك ـ حەویجە | ١٥٠ |
| | ب ـ ئێستگە کارۆ ئاوییەکان: | | |
| ٩ـ | بەستی دوکان | دوکان/سلێمانی | ٤٠٠ |
| ١٠ـ | بەستی دەربەندیخان | دەربەندیخان/سلێمانی | ٢٤٩ |
| ١١ـ | بەستی سامەڕا | سامەڕا/تکریت | ٦٠ |
| ١٢ـ | بەستی ئاسکی موسڵ | موسڵ | ١٣٠٠ |
| ١٣ـ | بەستی حەدیسە | حەدیسە/رمادی | ١٢٠٠ |

بەم جۆرە ئێستگە کارۆ گەرماییەکان زۆربەی هەرەزۆریان لەباشوورو ناوەڕاستی عێراقدان، بەشێك لەئێستگە کارۆ ئاوییەکان، بەهۆی بوونی بەستەوە، کەوتوونەتە کوردستان، ئەویش کوردستان سوودی لێنەبینیوە بۆ ئاوەدانکردنەوەو رووناك کردنەوەی گوندەکان یا بۆ کردنەوەی کارگە.

٥ـ لەڕووی ئاوەوە: دیارە سەچاوەی ئاو لەجیهاندا لەسێ چاوەوە بناوان هەڵدەگرێ:

*بەفروباران
*کانیو چۆمو رووبار
*ئاوی ژێر زەمین

ناوچەکانی ناوەڕاستو باشووری عێراق بارانیان کەم لێدەبارێ، هەروەك ئاوی ژێر زەمینیشیان زۆرکەمە، بۆیە پشت بەئاوی چۆمو رووبارەکان دەبەستن کە ئەویش هەمووی لەکوردستانەوەیە. رژێمی بەعس هەست بەمەترسی دەکا لەسەر ئەمنی ئاو، کە پایەیەکی گرنگی ئەمنی ئابوورییە چونکە:

- بارانو ئاوی ژێر زەمینی کەمەو بەشی ئاوەدانیو کشتوکاڵ ناکات.
- سەرچاوەی رووبارەکانیش لەدەرەوەی خاکی عێراقە (لەکوردستانی ئێرانو) (کوردستانی تورکیا)، هەربۆیە ئەو دەوڵەتانە دەشێ هەڕەشەی بڕینی ئاوی رووبارەکانی لێبکەن، چ بەهۆی دروستکردنی بەستی گەورەو زۆرەوە، چ بەهۆی گۆڕینی ئاوەڕۆکەی، بەمە عێراق دەکەوێتە پشێویو شڵەژانەوە، بۆیە هەر لەئێستەوە نەخشە دادەنێ تا ئاو پاشەکەوت بکا.

رژێمی بەعس دەیەوێ کوردستان بکاتە عەماراوی خۆی، دیارە لەمەشدا چەند مەبەستێکی هەیە.

١ـ گرنگترینیان پاشەکەوتکردنی ئاوە بۆ پاشەڕۆژی دەوڵەتەکەی.

٢ـ بەهۆی ئەو بەستانەوە کە دەیکات، ناوچەیەکی شاخاوی زۆری کوردستان بەرئاو دەکەوێ، بەمە لەلایەکەوە دانیشتوانەکەی ڕادەگوێزێو پەرەوازەیان دەکا، لەلایەکی تریشەوە ناوچەکانی کوردستان لەیەکتر دادەبڕێ، بەتایبەت ئەو بەستانەی دەکەونە ناوچەکانی سۆران و بادینان[٥٤]، وێڕای ئەمەش ئەم ناوچانە کە

---

[٥٤]ـ وەکو بەستی بێخمێ، هەروەها پرۆژە ئاوی دوبز ـ مەلا عبداللەو لەوێوە بۆ داقوق ـ دوزـ کفری لەسەروی جادەی کەرکوك ـبەغدا، تا ناوچەکانی نێوان چیای حەمرینو ناوچەکانی دەکەونە ژوور ئەو

بەکەلکی جەنگی پارتیزانی دێنو ناوچەی سەختن بەژێر ئاوییەوە دەکاتو ئەلقەی دەسەلاتی شۆڕش لەعێراقدا تەنگتر دەکات.

٣ـ ئەم بەستانەو چیاکانی کوردستان پێکەوە دەبنـە لەمپـەرێکی سروشـتی بەهێز بۆ پاراستنی عێراق لەهێزەکانی ڕۆژهەلاتو باکوور، واتە: ئێرانو تورکیا.

ڕژێمی بەعس نەخشەی کردنەوەی چـەندین بەسـتی دانـاوە کـە گـەورەترینو گرنگترینیان بەستی بێخمێیەکە دەتوانێ ناوچـەکانی سـۆرانو بادینـان لەیـەکتر دابڕێو ناوچەیەکی فراوانی کوردستانی عێراق بخاتە ژێر ئاوەوە. جگە لەوەی ئـەم بەستانە هیچ سودێکی ئابوورییان بۆ کوردستان نییە، وێرای ئـەوەی رووبـەرێکی فراوانی چەندین ناوچەی بەپیتو کشتوکالی ژێر ئاو دەخا.

هەروەها بێجگە لەو بەستانە، ڕژێمـی بـەعس هەولـدەدا کـورد لەعێراقـدا لەرووبارە گرنگەکان دووربخاتەوە. بـۆ نمونـە رووبـاری دیجلـە کەهـەر لەسـنووری عێـراق ـ تورکیـا ـ سـوریاوە تاسـەر موسـلّ بـەناو خـاکی کوردسـتاندا دەڕواو لەڕۆژهەلاتو ڕۆژئاواوە کوردی لێیە، لەوێشڕا تا فەتحـە سـنوورێکی سروشـتییە لەنێوان ناوچە عەرەبیەکانی عێراقو کوردسـتانی عێراقـدا، ڕژێـم هـەموو ئـەو ناوچـانەی ڕاگواسـتووەو بەعـەرەبی کـردووە لەڕۆژهـەلاتو ڕۆژئـاواوە کـوردی لێنەهێشـتووەو تەنانـەت سـنووری ئەتۆنۆمیەکەشـی لـەپارێزگای هـەولێردا نەگەیاندۆتە سەر دیجلە.

بۆئەوەی نەخشەی ستراتیجی بەعس بۆ دەسگرتن بەسـەر سـەروەتو سـامانی سروشتی کوردستانی عێراقدا باشتر روونکەینـەوە، پێویسـتە چـاوێك بـە بـاری ستراتیجیی عێراقدا بخشێنینەوە، ئەوسـا نـۆڕینی سـتراتیجیانەی بەعسـمان بـۆ دەردەکەوێ، کە گەرەکێتی کوردستان تالان بکاو خێرو بێرە ئابوورییەکەی بەرێت.

عێراق لەرووی جوگرافیەوە لەچوار ناوچەی جیاواز پێکـدێت، کـە هەریـەکێ لەوناوچانە ناوهەوای تایبەتی هەیەو جیاوازە لەناوهـەوای ناوچـەکانی تـر. ئـەم خشتەیەی خوارەوە رووبەری ناوچە جیاوازە پێکهێنەرەکانی عێراق (بە کوردستانی عێراقو بێ کوردستانیش)و ڕێژەی سەدییان نیشان دەدا:

---

پرۆژەیە لەیەکتر دابڕێ واتە مەبەستی ڕژێمی بەعس دروسـتکردنی بۆشـاییەکی جـوگرافی ـ ئاویـە لەنێوان ناوچە جیاجیاکانی کوردستانی عێراقو لێکدابڕینیانو دابڕینی ئەو ناوچـانەش لەدەسـەلاتی هێزی پێشمەرگەو شۆڕش.

## خشتەی ژمارە (١)[٥٥]

## ناوچە جوگرافیە جیاوازەکانی عێراق‌و ڕێژەی سەدییان لەچاو خاکی عێراقدا

| جۆری ناوچەکان | ڕووبەری بە کم² | % | ڕێژەی سەدیی (بێجگە لەکوردستان) |
|---|---|---|---|
| دەشتاییەکان | ١٣٢٥٠٠ | ٣٠,٢ | ٣٨,٦١ |
| گردۆلکەییەکان | ٤٢٠٠٠ | ٩,٦ | ١٣,٦٢ |
| شاخاوییەکان | ٩٢٠٠٠ | ٢١,٠ | |
| بیابان | ١٧١٨١٧ | ٣٩,٢ | ٤٨,٧٧ |
| هەموری | ٤٣٨٣١٧ | ١٠٠ | ١٠٠ |

ئەم خشتەیە ئەو ڕاستیە دەردەخات کە (بێجگە لەکوردستان) نزیکەی نیوەی خاکی عێراق بیابانەو بە کەڵکی کشتوکاڵ نایەت، هەروەها ٣٧،٦١٪یشی بریتیە لەناوچەی ڕەشەخاك کە چەندین زەلکاوی تێدایەو تەنها بەشێکی کەمی دەوری هەردوو ڕوباری دیجلەو فورات بەکەڵکی کشتوکاڵ دێت، ئەگینا بەشە هەرە زۆرەکەی شۆرەکاتەو بەرەبەرە بە بیابانبوون دەڕوا. هەروەها ١٣,٦٢٪ی بەشەکەتری کە ناوچەی شاخاوی‌و گردۆلکەییە، زیاتر ئاوهەوای بیابانیی بەسەردا زاڵەو بارانیشی کەم لێدەبارێ. هەر بۆیە عێراق مەترسی ئەمنی ئابووری، ئەمنی بژێوی لەسەرەو دەیەوێ دەس بەسەر سەروەت‌و سامانی ئابووری کوردستاندا بگرێ تا خۆی لەو گێژەنگە ڕزگار بکا.

---

[٥٥] ـ بڕوانە: وزارة التخطیط: المجموعة الآحصائیة السنویة لسنة ١٩٨٤، الجدول ١/٣. ناوچە دەشتاییەکان: بریتییە لەناوچەی ڕەشە خاکی عێراق کە زەلکاوەکانیش دەگرێتەوە هەروەها ئاوی ناوچەش دەگرێتەوە کە ڕوبەرەکەی ٩١٢کم²یە. ڕوبەری کوردستانی عێراق ٨٦هەزار کم² یەو. لەبەرئەوەی لە ناوچە شاخاوی‌و گردۆلکەییەکاندایە بۆیە ئەو ڕوبەرە لەکۆی هەردوو ناوچە شاخاوی‌و گردۆلکەییەکاندایە بۆیە ئەو ڕوبەرە لەکۆی هەردوو ناوچە شاخاوی‌و گردۆلکەی دەرکراوە لەعێراقداو ڕێژەکەی وەرگیراوە.

کەواتە ئەمنی ستراتیجیی عێراق لەئابووریدا رووی کردۆتە:
١ـ دەسگرتن بەسەر سەرچاوەکانی پەترۆڵی کوردستانو چۆڕبڕکردنی.
٢ـ دەسگرتن بەسەر سەرچاوەکانی ئاو و کردنی کوردستان بەعەماراو.
٣ـ بێبەشکردنی کوردستان لەسەرچاوەکانی وزە.
٤ـ بێبەشکردنی کوردستان لەکارگەو کۆمپانیای پیشەسازی.
٥ـ دەسگرتن بەسەر سەرچاوەکانی کشتوکاڵدا، بەتایبەت دانەوێڵە.
٦ـ تەفروتوناکردنی سامانی کشتوکاڵیو ئاژەڵی کوردستان لەو شوێنانەی کە ناتوانێ بە عەرەبی بکا.
ئەمانەش بە مەبەستی ئەوەی:
ـ کورد لەهێزێکی بەرهەمهێنەوە بکاتە هێزێکی بەرخۆر، تا هەمیشە چاو لەدەستی بەزەیی بەعس بێو نەتوانێ هێزێکی بەرهەمهێنی خورت بۆ خۆی پێکەوە بنێ.
ـ بۆئەوەی کورد لەرووی ئابوورییەوە بنکەیەکی بەهێزی پیشەسازی، کشتوکاڵی، دارایی، بازرگانی نەبێت کە زەمینەی جیابوونەوەو دامەزراندنی دەوڵەت ساز بکا.

د ـ لەبواری دیمۆگرافیدا

رژێمی بەعس چونکە ناتوانێ کورد لەناو ببات و قوتی بدا، بۆیە نەخشەی ستراتیجیی خۆی لەرووی دیمۆگرافیەوە بەشێوەیەك دارشتووە کە رێژەی نەتەوەیی لەعێراقدا تێك بدات بەجۆرێکی وا کورد رێژەی هەرەکەمی دانیشتوانی عێراقو عەرەبیش رێژەی هەرەزۆری دانیشتوانی عێراق پێکبێنێ، واتە نەخشەکە روو لەکەمکردنەوەی رێژەی کوردە لەعێراقدا، بۆ ئەوەی وەکو کەمە نەتەوەیەك لەروانگەیەکی شۆڤێنیانەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات، ئەمەش لەرێگەی چەندین هۆوە:

١ـ بەعەرەبکردنی کورد: رژێمی بەعس چەندین عەشیرەتو پەیڕەوانی چەندین ئایینی لەکوردستاندا بەعەرەب داناوە، لەوانە: یەزیدیەکان، کیکان، گەرگەری، شەبەك، گێژ، پالاتی، سالەیی، شێخ بزێنی، دیانەکانی کوردستانو شێخو سەیدەکانی کوردستان، بەجۆرە سەدان هەزار کوردی لەناونوسی گشتی ساڵی ١٩٧٧دا بەعەرەب نوسیوە.

٢ـ دەرکردنی کوردە فەیلییەکان لەعێراقداو ڕەوانەکردنیان بۆ ئێران، واتە تەسفیرکردنیان، بەم جۆرە لەساڵی ١٩٦٨ــ ١٩٨٢پتر لە٢٠٠،٠٠٠کوردی فەیلی لەشارەکانی بەغدا، قەزای بەدرە، مەندەلی، خانەقین دەرکراون‌و تەسفیری ئێران کراون.

٣ـ کوشتن‌و بڕینی کوردو بەرپاکردنی جەنگێکی هەمەلایی بۆ لەناوبردنی کوردو تەفروتوناکردنی.

٤ـ راونانی کورد بەهۆی سیاسەتی تۆقاندن‌و داپڵۆسینەوە تا کورد ناچاربکەن عێراق بەجێبێڵێت‌و ئاوارەی هەندەران بێت، بۆیە دەیان هەزار کوردی ئاوارەی ئێران‌و دەوڵەتە ئەوروپییەکان کردووە.

٥ـ هێنانی عەرەب لەوڵاتانی تری عەرەبەوەو نیشتەجێکردنیان لەعێراق‌و کوردستانداو دابەشکردنی زەوی‌و زار بەسەریاندا. هەر بۆ ئەم مەبەستە هەوڵی داوە زیاتر لەملیۆنێك جوتیاری میسری‌و٢٠٠هەزار جوتیاری سودانی‌و هی تریش بێنێتە عێراق تا ڕێژەی دانیشتوانی عەرەبی عێراق پتر بکات.

٦ـ تێکدانی سیمای دیمۆگرافی کوردستان لەڕێگەی:

*بەعەرەبکردنی کوردستان‌و هێنانی عەشایەری دواکەوتووی عەرەب بۆ جێگای کوردەکان‌و دەرکردنی کوردەکان.

* پەرش‌و بڵاوکردنی کورد بەسەر ناوچە عەرەبییەکانی ناوەڕاست‌و باشووری عێراق بەهۆی:

ــ راگواستنی زۆرە ملێی گوندەکانی ناوچەکانی تەوەرە ستراتیجییەکان‌و شارەگرنگەکانی کوردستان.

ـ فریودان‌و لەخشتەبردنی کورد بەهۆی کارپێدانەوە لەوشوێنانەدا.

ـ ناچارکردنی کورد بۆئەوەی بەدوای کاردا بگەڕێ‌و بەناچاریش لەو شوێنانەدا نیشتەجێبێت کە کاری تیا دەدۆزێتەوە.

ـ نەفیکردنی فەرمانبەرو کرێکاری کورد بۆ ئەوشوێنانە.

* کۆکردنەوەی کورد لەچەندین شوێنی ژێر دەسەڵاتی خۆی، لەچوارچێوەی ئۆردوگا زۆرەملێکان‌و چۆڵکردنی ناوچەکانی تر. واتە چڕکردنەوەیان لەهەندێ شوێن‌و چۆڵکردنی هەندێ شوێنی تر، بە مەبەستی ئەمنی.

- لەبواری ئەعلامی - ئایدۆلۆجیدا

١- بوختانو درۆ هەڵبەستن بۆ جوڵانەوەی ڕەواو هەق خوازی کورد، بەگوێرەی زەمانو زروفو هەرکاڵایەك لەبرەودا بووبێ، جارێك بەفیتی شۆڤێنیو جارێك بە فیتی ئیمپریالیزمو کەرەتێك بە دەسیسەی سەهیۆنیزم، کەرەتێکی تر بەفیتی ئێرانو تاوێك بەهی سوریا، زۆرجاریش بە کۆنەپەرستیو دواکەوتوییو پیلانگێڕیان لەقەڵەم داوە[56].

٢- لەقەڵەمدانی کورد بەعەرەبو هەوڵدان بۆ چەواشەکردنو گۆڕینی ڕاستیە جوگرافیو مێژووییەکانو شێواندنیان، وەك لەقەڵەمدانی چەندین عەشیرەتو پەیڕەوکەرانی ئایینی جیاجیا لەکوردستاندا.

٣- تەفرەدانو لەخشتەبردنی کورد بەشتی ساختەو درۆ وەکو: ئۆتۆنۆمی، ئەنجومەنی یاسادانان، بۆ دورخستنەوەیان لەمەسەلەی بنچینەیی گەلەکەیان کە جوڵانەوەی ڕزگاریی نیشتیمانی کوردستانە.

٤- بە بەعسیکردنی کورد، چونکە بەعس لایەنێکی ئایدۆلۆجیشی هەیە، بۆئەوەی کورد بە بیروباوەڕی عەرەبایەتیو بەعس پەروەردە بکا، لەگەلەکەی خۆی دوربخاتەوە، نەهێڵێ بەشداری شۆڕش بکەن.

٥- چاندنو قوڵکردنەوەی گیانی عێراقچێتی لەناو کوردا، تا هەست بکەن عێراقینو بەمەبەستی دابڕینیان لەنەتەوەکەی خۆیانو نەهێشتنی هەستی (انتما)ی نەتەوەی.

٦- لەقەڵەمدانی کورد بەمیوانی عەرەبو قوڵکردنەوەی ئەو چەمکە لای عەرەبو نیشاندانی ئەوەی کە کورد مەترسی بۆ سەر پاشەڕۆژی عەرەب دروست دەکا، دەیەوێ خاکەکەی پارچەپارچە بکا، تووشی چەرمەسەریی بکا، بۆئەوەی بتوانێ هانیان بدا دژی جوڵانەوەی رزگاریی نیشتمانیی کوردستان بە گەڕیان بخا.

٧- رووتکردنەوەی خەڵکی لەهەستو نەستی نەتەوایەتی، بە لەبیربردنەوەی مێژووی جوڵانەوەکەی، وە لەجێگەی ئەو چەسپاندنی مێژووی عەرەبو بەعسو چەمکی سەرشۆڕکردنو قایلبوون بە ژیانی ژێر دەستەیی بەعس، وەکو لەبەرنامەکانی پەروەردەو تەلەفزیۆنو بەرنامەکانی ئێستگەدا خۆی دەنوێنێ.

---

[56]- یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، دەزگای ڕاگەیاندن: عێراقو مەسەلەی کورد، سەرچاوەیەکی پێشووتر ل٦.

٨ـ دەلاقە خستنە نێوان دیالێکتو بن دیالێکتەکانی زمانی کوردیو کەلـەپورو فەرهەنگی ناوچەی سۆرانو بادینـانو خۆشـکردنی ئـاگری کینـەو بـوغز بـۆ رقەبەرایەتی بە دنەدانی هەستی ناوچەیی و خێلایەتی.
٩ـ شێواندنی ئەدەب، هونەر، کەلـەپورو زمـانی کـوردی بـەهۆی بەرنامـەکانی ئێزگەو تەلەفزیۆنو رۆژنامەو گۆڤارە دەهۆلْ کوتەکانی بەعسەوەو نیشـاندانی بەشتێکی پاشەکەوتوو دواکەوتوو.
١٠ـ قەدەغەکردنی ئەو کتێبانەی باسی کـورد دەکـەن، باسـی مێـژووی کـوردو جولاّنەوەکەی دەکەن، هەروەك قەدەغەکردنی دیـوانی شـاعیرە نیشـتمانپەروەرو شۆرشـگێرەکان، تەنانـەت ئەوانـەش کـە لەسـەردەمی پاشـایەتیدا وتـراونو نوسراون.
١١ـ هەلْوەشاندنەوەی چەندین رێکخراوی ئـەدەبیو هونـەرییو لـەجیاتی ئەوانـە دامەزرانـدنی لقـی عێراقـی ئـەو رێکخراوانـەو نەهێشـتنو رێگـەگرتن لەگەشەکردنی هونەری رەسەنی کوردی، بەیاساغکردنی چـالاکیی تیپـەکانی مۆسیقاو شانۆ تا هەر لەئاستێکی گەشەنەکردوودا بیانهێلْێتەوە.

## دووەم: ئامرازە دەرەکییەکان

ئەو ئامرازو رێـو شـوێنانەن کـە رژێمـی بـەعس بـەهاوکاری کۆنەپەرسـتی ناوچەکەو دەولْەتـە داگیرکـەرەکانی کوردسـتانو ئیمپریـالیزم بـۆ گـەمارۆدانو ئابلْوقەدانی جولاّنەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان لەعێراقدا گرتۆتەبـەر، کـە ئەمـەش بەپلـەی یەکـەم لەرێکەوتننامـەو پەیمانـە دروقـۆلیو فرەقۆلیانـەدا دەردەکەوێ، کە رژێمی بەعس بەستوویەتی، هەروەك رژێمەکانی پێش بەعسـیش هەمان رێگەیان گرتبوو.

ا ـ سیاسەتی پەیمانکاری

دەولْەتی عێراق، چونکە هیچ پاساوێکی مێژوویی بۆ دروسـتکردنی نـەبووە، هەرتەنها ویستو ئـارەزووی بـەریتانیا بـۆ دابینکردنـی بەرژەوەندییـە پـەترۆلیو سیاسیو ستراتیجییەکانی دایتاشیوە، هەربۆیە دەولْەتێکی ئاوەها ناتوانێ لەسەر پێی خۆی بوەستێ، رووبەرووی کێشەو گیروگرفتە ناوەکییەکان ببێتەوە، بۆیە پەنا دەباتە بەر سیاسەتی پەیمانبەسـتنو پـەیمانکاری لەگـەلْ دەولْەتـە هاوسـێکانیو

دەوڵەتانی تردا. مێژووی دەوڵەتی عێراق هەر لەدروستکردنیەوە، لەسەردەمی هاشمیەکانەوە تا ئێستای سەردەمی بەعسییەکان بریتی بووە لەکۆمەڵێك پەیمان و پەیمانکاری کە تەوەرەی ئەو ڕێکەوتن و پەیمانانەو خاڵی ناوکۆیی نێوان هەموو پەیمانەکان، بە جیاوازی زەمان و بەجیاوازی ڕژێمەکانیشەوە، دژایەتیکردنی مەسەلەی کوردو تواندنەوەی کوردو بەگژاچوونی جوڵانەوەی ڕزگاری نیشتیمانی کوردستان بووە، چ لەعێراقدا چ لەپارچەکانی تری کوردستاندا. ئەمەش ئەم ڕێککەوتن و پەیمانانەن کە ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بەستوویانە:

١- ١٠/١٠/ ١٩٢٢بریتانیاو عێراق یەکەمین پەیمانیان بەست بۆ ماوەی ٢٠ساڵ بەڵام لە ٣٠/٤/١٩٢٣دا کرایە چوار ساڵ.

٢- ١١/٥/١٩٢٦دوای لکاندنی کوردستانی باشوور بە عێراقەوە، بەریتانیاو عێراق و تورکیا پەیمانێکیان مۆر کرد بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان خۆیان.

٣- ٥/٦/١٩٢٦پەیمانی (حسن الجوار) لەنێوان نوری سەعیدو تۆفیق رشدی ئاراسدا بەسترا.

٤- ڕێکەوتننامەی نێوان بریتانیاو عێراق لەساڵی ١٩٣٠دا.

٥- لە٩/١/١٩٣٢دا نوری سەعید پەیمانێکی لەگەڵ تورکیادا بەست بۆ تەسلیمکردنەوەی تاوانباران.

٦- تەمووزی ١٩٣٧ پەیمانی سەعداباد لەنێوان عێراق و ئێران و تورکیاو ئەفغانستاندا بەسترا بۆ یەکەمین جار ئێران دانی بە عێراقدا نا.

٧- لەساڵی ١٩٤٦دا لەنێوان عێراق و تورکیا پەیمانی (الصداقة وحسن الجوار)و پرۆتۆکۆڵە پاشکۆکانی بەسترا، کە دووەمیان بەناونیشانی (هاوکاریی دوولایەنە لە کاروباری ئەمنی)دا بوو.

٨- ڕێککەوتنەکەی ساڵی ١٩٥٥ لەگەڵ تورکیا بۆ جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی ڕێککەوتنەکەی ساڵی ١٩٤٦.

٩- پەیمانی بەغدا لەنێوان عێراق، ئێران، تورکیا پاکستان لەساڵی ١٩٥٥دا.

١٠- ڕێککەوتننامەی جەزایر ساڵی ١٩٧٥ لەنێوان شاو صدام دا.

١١- ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٧٦لەنێوان تورکیاو عێراقدا بۆ ڕاگواستنی ناوچە سنوورییەکانی کوردستانی تورکیا لەسەر حسابی عێراق.

١٢- ڕێککەوتننامەی تشرینی یەکەمی ١٩٨٤ی عێراق - تورکیا بۆ هاتنە ناوخاکی کوردستانی عێراق و ڕاونانی پێشمەرگە.

هەروەك ئاماژەی بۆ كرا، خاڵی ناوكۆی ئەو پەیمان و ڕێككەوتنانەی مەسەلەی كورد بووە، بۆیە بەنموونە ئەو بەندانە دێنینەوە كە پەیوەندیان بەم مەسەلەیەوە هەیە:

*مادەی (٦)ی پەیمانی (حسن الجوار) لەنێوان توركیاو عێراق كە لە ٥/٦/١٩٢٦ مۆر كراوە، دەڵێ: پەیمان ـ بەستە خاوەن شكۆكان بە دووقۆڵی بەڵێن دەدەن، بە هەرچییەك لەدەستیان دێ، ڕێگە لەخۆسازدانی كەسێكی چەكدار یا كەسانێكی چەكدار بگرن كە مەبەستیان كاری چەتەگەری و سەرەڕۆییە لەناوچەكانی سەرسنووردا، بەڵێن دەدەن، بە هەرچییەك لەدەستیان دێ، ڕێگە لەسنووربەزاندنیان بگرن.

* مادەی (٧)ی پەیمانی سەعدابادی ١٩٣٧ دەڵێ: پەیمان بەستە خاوەن شكۆكان بەڵێن دەدەن، هەریەكەو لەسنووری خۆیدا، ڕێگەی دروست بوونی تاقمی چەكدار یا كۆڕو ڕێكخستن نەدات، كە بە مەبەستی هەڵگێڕانەوەی دام و دەزگاكان، یا هەڵسان بەكاری ئاژاوە نانەوەو شلۆقاندنی ئاسایشی گشتی و شێواندنی ڕژێمی حوكمساز دەكرێن، لەهەریەشێك لە وڵاتانی هاوپەیماندا، چ لەناوچەی سەرسنوور یا غەیری ناوچەی سەر سنوور بێ.

*هەروەك پەیمانی بەغداش یەكێك لەبەندەكانی و هۆیەكی بەستنیشی مەسەلەی كورد بوو.

* ڕێككەوتننامەی جەزائیرو پرۆتۆكۆڵە پاشكۆكانیشی لەسەر هەمان شێوەی پەیمانەكانی پێشتر لەسەر دژایەتیكردنی جوڵانەوەی ڕزگاری نیشتیمانی كوردستان جێگیر بووە. بەندی سێیەمی ڕێكەوتننامەی شا ـ صدام دەڵێ: (هەردوولای بەڕێز كە ڕێككەوتوون، پەیمان دەدەن كە هەمیشە لەسەر سنور چاودێرییەكی وریاو گورج و گۆڵ دابنێن بۆ وەستانی هەموو هاتن و چوونێكی سەر سنوور كە شێوەی وێرانكاری دەبێ و لەهەر لایەكەوە هاتبێ. ئەمەش لەسەر بنەرەتەكان و بەگوێرەی ئەو ئەحكامانەی كە لەپرۆتۆكۆڵەكەو پاشكۆكانیدا هەن و پەیوەندیان بە هێمنی سەر سنووری پاشكۆی ئەم پەیمانەوە هەیە).

هەروەها لە پرۆتۆكۆڵی ٢٦/١٢/١٩٢٥دا كە لەبەغدا مۆركرا، بەندی دووەمی دەڵێ: (هاوكاری هەمەجۆر كە لەنێوان كاربەدەستانی تایبەتی هەردوولای ڕێكەوتوودا دروست بووە، سەبارەت بە داخستنی سنوور بە مەبەستی

ڕێگەگرتن لەو زەلامە وێرانکارانە، دەبێ لەلایەن کاربەدەستانی سنووری هەردوو وڵاتەوە دەسبەردار نەبێ‌و ئەم کارەش دەکرێ، تا دەگاتە پلەی بەرزی وەزیرەکانی بەرگری‌و دەرەوەو ناوخۆی هەردوولا). هەروەها ڕژێمەکانی عێراق لەشەستەکاندا چەندین جار سودیان لەهێزەکانی سوپای سوری‌و میسری وەرگرتووەو هێناویانن بۆ کوردستان تا شەڕی کورد بکەن.

ب ـ ڕژێمی بەعس هەوڵیداوە ڕای گشتی ناوچەکەو جیهان وا لێبکا بڕوای پێبکەن کە چارەسەری کێشەی کوردی بە باشترین شێوە کردووە، تەنانەت زیاد لەمەش هەوڵی داوە ئەوە بسەلمێنێ کە تەجروبەی بەعس بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد بە باشترین شێوە کردووە، تەنانەت زیاد لەمەش هەوڵیداوە ئەوە بسەلمێنێ کە تەجروبەی بەعس بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی لەعێراقدا (پێشەنگی) هەموو تەجروبەکانی ترەو دەشێ ئەم وڵاتانە بیکەنە نموونە!

ج ـ شێواندنی مێژووی کوردو ریسواکردنی لەدەرەوەو تۆمەتی دواکەوتویی‌و پاشکەوتویی دانەپاڵی‌و نیشاندانی بە جۆرێکی وا کورد کێوییەو دژی پێشکەوتن‌و ژیانی هاوچەرخ‌و ئاوەدانییە، دژی ئارامی‌و ئاسایشە هەر حەزی لەتەقوتۆق‌و پشێوی‌و شەڕو ئاژاوەیە.

د ـ هەوڵدان بۆ کڕینی چەندین ڕۆژنامەو ڕۆژنامەگەرو نوسەر تا بەشێوەیەکی خراپ‌و بێویژدانانە لەسەر مەسەلەی کورد بنوسن، تۆمەت بدەنەپاڵ شۆڕشی کوردستان‌و ڕێکخراو و ڕێبەرەکانی، بۆئەوەی ناو ناوبانگیان بزڕێنێ‌و بە گێرەشێوێن‌و تیرۆریست‌و ئاژاوەچی بیاندەنە قەڵەم.

هـ ـ یارمەتیدانی چەندین حیزب‌و ڕێکخراوی چەپی ئەورووپی‌و ڕێکخراوی ڕزگاریی نیشتیمانی وڵاتانی تر، ئەوانەی دەشێ ببنە دۆستی کوردو جوڵانەوەکەی، تا ڕێگە لەدۆستایەتی بگرێت‌و لەکوردیان بکات.

و ـ یارمەتیدانی هەندێ حیزب‌و ڕێکخراوی کوردستانی لەپارچەکانی ترو هەروەها حیزب‌و ڕێکخراوە کوردییەکانی لوبنان، بەمەبەستی بەگژاکردنەوەی شۆڕشی کوردستانی عێراق، بەو بیانووەی گوایا شۆڕشی کوردستانی عێراق بۆتە ڕێگر لەبەردەم یارمەتی‌و پێشکەوتنی ئەوانەدا، ئەگینا بەعس ئامادەیە یارمەتییان بداو هاوکارییان بکا!

## پوختەی بەشی یەکەم

١- دەوڵــەتی عێــراق قەوارەیەکــە دەســتنێژی ئیمپریــالیزمی بریتانیایــە، هــیچ قوڵاییەکی مێژووی نییە، لەمێژووی کــۆن و نوێــدا دەوڵــەتێك نــەبووە بــەناوی دەوڵەتی عێراقەوە. دەوڵــەتی عێــراق لەئــەنجامی پێکەوەلکانــدنی زۆرەملێــی ویلایەتەکانی بەغداو، بەسرەی عــەرەبی و کوردســتانی باشــووردا پێکهــاتووە، داتاشــینی ئــەم قەوارەیــە بــەر لەهەرشــتێك، دابینکــردن و مســۆگەرکردنی بەرژەوەندییە سیاسی، ئابووری، پەترۆڵی و ستراتیجییەکانی بریتانیا بووە.

٢- رژێمەکانی عێراق هەر لەسەردەمی هاشمییەکانەوە، تــا ئێســتای ســەردەمی بەعسیەکان، لەسەر بنچینەی بەرژەوەندیە چینایەتیەکانی خۆیان، کرێگرتــەی ئیمپریــالیزمی بریتانیــا بــوون، لەمــەڕ لەقاڵبــدانی کــورد لەعێراقــداو بێبەشکردنی لەسەرەتایترین مافە دیموکراتی و مرۆیی و نەتەوەییەکانی، رژێمــی بەعسیش لەهەموو رژێمەکانی پێش خۆی زیــاتر، بــە نەخشــەترو جدیتر ئــەم سیاسەتەی جێبەجێ کردووە.

٣- ئەمنی ستراتیجیی عێراق لەســەر بنچــینەی شۆڤێنیســتی و رەگەزپەرســتانە دامــەزراوەو رووی کردۆتــە سیاســەتی فراوانخــوازی و دەســدرێژی و پــەلاماردانی نەتەوەی تر، رووی کردۆتە زەوتکردنی مافــە دیمــوکراتی و مرۆییــەکانی گــەلی عێراق، هەروەك بەنیسبەت گەلی کوردیشەوە رووی کردۆتە:

- تێکــدانی قــوڵایی نەتــەوەیی و ســتراتیجیی جوڵانــەوەی رزگــاریی نیشــتیمانی کوردستان لەعێراقدا.
- بێبەشکردنی کورد لەسامانە سروشتییەکانی خۆی: نەوت، کشــتوکاڵ، ئــاو و زەوتکردنی ئەو سامانانە.
- نەهێشتنی (مەترسی کورد) لەسەر پاشەڕۆژی دەوڵەتی عێراق.

واتــە ڕووی کردۆتــە هەڵلوشــینی کــوردو قوتــدانی خــاك و نیشــتیمانەکەی: کوردستان.

٤- ڕژێمی بەعس بۆ بەدیهێنانی ئەمنی ستراتیجی عێراق گەلێ شێوازو ئامرازی بەکارهێناوە بــە مەبەســتی نەهێشــتنی مەترســی کــورد، لەســەر پاشــەڕۆژی دەوڵەتی عێراق، لەوانە:

- ئامرازە ناوەکییەکان: سیاسی، کۆمەڵایەتی، سوپایی، ئابووری، دیمۆگرافی، ئەعلامی، ئایدیۆلۆجی...

- ئامرازە دەرەکییەکان: کە گرنگترینیان سیاسەتی پەیمانکارییە لەگەڵ دەوڵەتە کۆنەپەرستەکانی ناوچەکەو داگیرکەرانی کوردستانو ئیمپریالیزمدا، کە تەوەرەی بنچینەیی ئەو ڕێککەوتننامانەو پەیمانەکان مەسەلەی کوردە.

## فەسڵی یەکەم

## سیاسەتی ڕاگواستنی کورد لەکوردستانی عێراق

### ٢ ـ ١ ـ ١ سەرەتا

سێکوچکەی تەرحیل، تەعریب‌و تەبعیس، سێ مەترسی گەورەن کە هەڕەشـە لەبوونی نەتەوایەتی نەتەوەی کورد دەکەن لەکوردستانی عێراقدا، هـەروەك سـێ پایەن سیاسەتی شۆڤێنیانەو ڕەگەزپەرستانەی ڕژێمی بەعسیان لەسەر وەستاوە.

وەنەبێ ئەم سیاسەتە لەئەنجامی بڕیارێکی سەرپێی یا تاکتیکییـەوە هاتبـێ، بەڵکو بـەقوڵیی لەبیروبۆچـوون‌و لێکدانـەوەی بەعسـدا ڕەگـی خـۆی داکوتـاوەو قوڵاییەکی ستراتیجیی هەیە کەڕووی لەتوانەوەی نەتەوەی کـوردە لەکوردسـتانی عێراقدا لەبۆتەی نەتەوەی عەرەبداو سڕینەوەی دوا شوێنەواری کوردسـتانیبوونی بـوونی ئـەم پارچـەیەی نیشـتیمانەکەمان، کـە بـەزۆری بـەپێی نەخشـەیەکی ئیمپریالیستانە بەعێراقەوە لکێنراوە.

دیارە لە وڵاتانی دنیادا، دوو جۆر یا دوو شێوەی ڕاگواستن‌و بەرچاو دەکەوێ بە مەبەستی کۆکردنەوەی گوندو لادێکان:

یەکێکیان: کۆکردنــەوەی ئــەو گونــدو لادێیانــە بــە مەبەسـتێکی ئـابووری کۆمەڵایەتی‌و شارستانێتییە تا مرۆڤ و زەوی بەجۆرێ کارلێـك (تفاعـل) بکـەن هەم بە باشترین شێوە زەوی ڕەنێو بهێنرێ‌و هەم بەرزترین ئاستی گوزەرانیش دابین بکرێ، واتە ڕاگواستن شێوەیەکی ئارەزوومەندانە بەخۆوە دەگـرێ، کـە لـەپێناوی

پەرەپێدانی ناوچە دواکەوتوەکانو گشت وڵاتەکەدایە. بەڵام لێرەشدا چەند فاکتەرێك ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن.

١ـ دەبێ گوندنشینەکان ڕۆڵێکی سەرەکی لەپرۆسەی پەرەپێدانی لادێدا بگێڕن .

٢ـ دەبێ دەستێوەردانی حکومەت لەسەر داخوازیی خەڵك بێ، نەك بە پێچەوانەوە.

٣ـ دەبێ توخمە بنچینەییەکانی پەرەپێدان هی هەمان ناوچەبن[1].

واتە کۆکردنەوەو گردکردنەوەی گوندو لادێکان دەبێ لەشوێنێك بێت، نزیك بە زەوی‌و زارو مەزراکانیان بێ، جۆری خانووبەرەو ژیانیشیان لەگەڵ ئاستی گەشەکردنیان‌و سایکۆلۆجی خەڵکەکەدا بگونجێ، بۆئەوەی لەپەرەپێدانی گشت وڵاتو زیادکردنی داهاتی نەتەوەییدا ڕۆڵێکی بەرچاو گرنگیان هەبێت‌و پەیتاپەیتا هەوڵی بەرزکردنەوەی ئاستی گشتی ژیانیان بدرێ.

دووەمیان: ڕاگواستنی زۆرەملێیە، کە ڕژێمە داگیرکەرو کۆلۆنیالیست‌و زەوتکەرەکانی مافی مرۆڤایەتی دژی گەلانی ڕزگاریخواز بەکاری دەهێنن بۆئەوەی:

- دانیشتوانی ناوچە جۆراوجۆرو گرنگەکان لەهێزە شۆڕشگێڕە چەکدارەکان دوربخەنەوەو لەشوێنێکدا کۆیان بکەنەوە کە لەشێوەی گرتووخانەدایە، تا هەمیشە لەژێر کۆنترۆڵی داموو دەزگا داپلۆسێنەرەکانیاندا بمێننەوە.
- لەبواری بەرهەمهێنان دوریان بخەنەوە و بیانکەنە هێزێکی بەرخۆر تا:

* لەلایەکەوە نەتوانن بژێوی‌و پێداویستییەکانی شۆڕشگێڕەکان دابین بکەن.
* لەلایەکی تریشەوە بۆئەوەی لەدەرفەتی شیاوو گونجاودا چەکداریان بکەن‌و بەگژ شۆڕشگێڕەکانیاندا بکەنەوە.

ئاشکرایە کە ڕاگواستنی گوندو لادێکانی کوردستان بۆ جۆری دووەمی ڕاگواستنەکە دەگێڕێتەوە.

تاقیکردنەوەو تەجروبەکانی جوڵانەوەی ڕزگاریی نیشتیمانی‌و شۆڕشەکانی گەلانی دنیا گەلێ نموونەمان دەخاتە بەرچاو کە چۆن دەوڵەتە داگیرکەرو کۆلۆنیالیستەکان بە سەدان‌و هەزاران گوندی گەلانی ژێردەستەو داگیرکراویان

[1] ـ محمد، خليل اسماعيل: انماط الاستيطان الريفيفي العراق، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٨٢، ص٣٩٤.

ڕاگواستووەو ڕەزوباخ‌و بێستانەکانیان سوتاندون‌و کارێزو کانیاوەکانیان کوێرکردۆتەوە.
- لەسییەکانی ئەم سەدەیەدا، فاشییەکانی ئیتالیا زیاتر لە ٨٠ هەزار کەسیان لە دانیشتوانی لیبیادا ڕاگواست‌و لەئۆردوگا - گرتوخانەکان (معسکرات الاعتقال)یان خزاند کە خەڵك پێیان دەوت (ئۆردوگاکانی مردن).
- لەدوای ساڵی ١٩٥٧وە فەرەنسا هەموو خاکی جەزائیری کردە چەند چوار گۆشەیەك‌و دانیشتوانەکەی لەچەند چوارگۆشەیەکدا کۆکردەوەو نیشتەجێیان کرد. لەساڵی ١٩٦٢وە ئەمەریکا بەپێی نەخشەیەکی وردو بەرفراوان زیاتر لە٣/٢ی دانیشتوانی ڤیتنامی خوارووی لە١٦ هەزار گونددا کۆکردەوە کە ناویان نابوو (گوندی ستراتیجی).
- هەروەها نازیەکانی ئەڵمانیاش لەجەنگی جیهانی دووەمدا هەر شوێنێکیان دەگرت خەڵکەکەیان ڕادەگواست‌و لەشوێنێکی ترا کۆیان دەکردەوەو گوندوشارە داگیرکراوەکانیشیان دەکردە قەرەبروت.
- بەهەمان شێوە بەعسییەکانی عێراق زۆربەی ناوچە گرنگەکانی کوردستانیان ڕاگواستووەو زوربەی دانیشتوانیان لەو شوێنەدا کۆکردۆتەوە کە ناویان ناوە (گوندی هاوچەرخ)و کوردیش ناوی ناوە (ئۆردوگای زۆرەملیێ).
بەڵام ئەگەر سیاسەتی فاشییەکانی ئیتالیاو ئیمپریالیزمی فەرەنسی‌و ئەمەریکی لەراگواستنی گوندو لادێکانی وڵاتە داگیرکراوەکاندا ڕوو لەمەبەستێکی سوپایی ڕووت بوبێ، بۆئەوەی تەنگ بەشۆڕشگێڕە چەکدارەکان هەڵبچنن‌و جەماوەریان لێ دووربخەنەوە، ئەوە ڕاگواستنی گوندو لادێکانی کوردستان لەلایەن بەعسەوە لایەنێکی تریشی هەیە، کە ئەویش لایەنی نەتەوەی - شۆڤێنییە، تا بتوانن کورد لەعێراقدا لەقاڵب بدەن‌و بەشێنەیی لەبۆتەی نەتەوەی عەرەبدا بیتوێننەوە. هەر بۆیە ئەم سیاسەتە ڕوو لە:
-- ڕاگواستن‌و (تەرحیل)ی هەموو ناوچەکانی سەر سنووری کوردستان‌و کۆکردنەوەی دانیشتوانەکەیەتی لە ئۆردوگا زۆرەملێکاندا.
- کۆچپێکردن (تهجیر)ی هەموو ئەو ناوچانەی عێراق بە تەوەرەی ستراتیجییان دەزانێ بۆ پارێزگاریکردنی عێراق لەمەترسییەکانی دەرەوەو ناوەوەو پەرەوازەکردنی دانیشتوانەکەی‌و بەعەرەبکردنی ئەو ناوچانە.

- کۆچپێکردن (تهجیر)ی زۆربەی ناوچە (نەوت)ییەکانی کوردستانی عێراق‌و دەرکردن‌و پەرەوازەکردنی دانیشتوانەکەی‌و بەعەرەبکردنی ئەو ناوچانە.
- دەرکردن (تسفیر)ی هەموو ئەو کوردانەی تۆمەتی ئێرانیبوونیان داونەتەپاڵ، کە لەشارو شارۆچکەکانی عێراقدا نیشتەجێن، وەك: بەغدا، بەسرە، عەمارە، و هەندێ لەو کوردانەی لەناوچەکانی بەدرە، مەندەلی، شارەبان، خانەقین لەسەر خاکی مێژووی خۆیان نیشتەجێ بوون، کە بەشێوەیەکی سەرەکی کوردە فەیلییەکانی گرتۆتەوەو لەساڵی ١٩٦٨ـ١٩٨٢ زیاتر لە ٢٠٠هەزار کەسیان لێ تەسفیر کراوە و دەس بەسەر خانوو ماڵ‌و سەرمایەیاندا گیراوە.
- راگواستنی هەموو ئەو ناوچانەی جەنگی عێراق - ئێران لێی نزیك بۆتەوەو پەرەوازەکردنی دانیشتوانەکەی.

دیارە ئەم هەموو راگواستن‌و ئازاردانە، ئەم هەموو خۆماندوکردن‌و پارەوپول خەرج کردنەی حکومەت، ئەم هەموو هێزی کارو خێرو سامان لەکیسچوونە هەروا بەخۆڕایی نەبووە، بەڵکو هەمووی بەگوێرەی نەخشەو پلان ئەنجام دراوە، بۆئەوەی:

١ـ نەخشەی دیمۆگرافی عێراق تێك بدەن‌و سەرلەنوێ ئەم نەخشەیە بەگوێرەی بیروبۆچوون‌و لێکدانەوەی کاربەدەستان دابڕێژنەوە تا ڕێژەی کورد لەعێراق کەم بکەنەوەو لەئەنجامدا وەك کەمەنەتەوەیەك لەروانگەیەکی شۆڤێنیانەوە هەڵس‌وکەوتی لەگەڵدا بکەن.

٢ـ مەسەلەی کورد وەك مەسەلەی گەلێکی ڕزگاریخواز، بەعس هەمیشە مەترسی جیابونەوەی لێکردووە، لەبەرنامەو پلانی خۆیدا شوێنێکی تایبەتی بۆ داناوە.

(رژێمی بەعس خۆی بۆچوون‌و تێگەیشتنی تایبەتی هەیە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی گەلی کورد لەکوردستانی عێراقدا، ئەویش "تەختکردنی کێشەی کوردە بەتواندنەوەی کورد لە بۆتەی نەتەوەی عەرەبدا۔ نووسەر" هەرگیز ئەم بۆچوونەی لەئاستی داخوازییە ڕەواکانی گەلی کورددا نەبووەو سروشتی چینایەتی‌و شێوەی پێکهاتنی فکری بەعسیش ئەو گەشەکردن‌و گۆڕانەی لێ ڕەچاونەکرێ، کە بێتە ئاستی ئەو داخوازیانە، ئەمە جگە لەوەی کە بەعس داخوازییەکانی ئێستای گەلی کورد بەهەنگاوێك ئەزانێت بۆ جیابونەوە، هەربۆیە لەئێستاوەو بەهەموو شێوەیەك هەوڵ ئەدەن ئەوەی لەتوانایاندایە ئەیکەن لە

بێبەشکردنی گەلی کوردو شێواندنی روخساری کوردستان، بەبۆچوونی خۆیان بەم هەنگاوەیان پێداویستییەکانی جیابوونەوە لەبار ئەبەن[٢]).

سیاسەتی راگواستنی زۆرەملێی کورد، پایەیەکی گرنگی لەدارشتنی هێڵە گشتییەکانی ئەمنی ستراتیجی عێراقدا گرتووە، هەربۆیە کاتێ لەساڵی ١٩٦٣دا بەعسییەکان بۆ ماوەیەکی کەم رکێفی دەسەڵاتی سیاسیان گرتە دەست، دەستبەجێ دەستیان کرد بەراگواستنو بەعەرەبکردنی ناوچە نەوتییەکانی کەرکوكو هەولێرو گەلێ ناوچەی تریش بەر ئەم شاڵاوە کەوتن، کاتێ بۆ جاری دووەمیش لەتەموزی ١٩٦٨دا دەسەڵاتی سیاسیان کەوتە دەست، بەشێوەیەکی هەمەلایی تر، قوڵتر، بەرفراونترو جددیتر کەوتنە دارشتنی نەخشەو پلانی راگواستنی ناوچە کوردنشینەکان، بۆ ئەم مەبەستەش دەیان ملیار دیناریان خەرج کرد.

جا لەبەرئەوەی تەرحیلو تەعریبو تەبعیس نەك هەرسێ مەسەلەی نەتەوەیی و نیشتیمانین، بەڵکو سێ مەسەلەن کە چارەنوسی گەلەکەمانو جوڵانەوەکەی و گۆرانو گەشەکردنو پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و فەرهەنگی کۆمەڵەکانی پێوە بەندە، بۆیە پێویستە بایەخێکی تایبەتی پێ بدەین، تا رۆڵەکانی گەلەکەمانو حیزبو رێکخراوە سیاسییەکانی لەئاستی ئەو مەترسییە ترسناکەدا هۆشیارو بەئاگابن، هەرچەند هێڵە گشتییەکانی هەموو جۆرەکانی راگواستنو ئەو پرنسیپە سەرەتاییانەی رژێم لەراگواستنی ناوچە جۆراو جۆرەکانی کوردستاندا لەبەرچاو گرتووە، هەر هەموویان لەو خاڵانەی کە لەسەرەوەدا باسکرا یەکدەگرنەوە، بەڵام هەموو بە مەبەستی زانستی و لەپێناوی باشتر روونکردنەوەو دەسنیشانکردنی ناوچە جیاجیاکانو ئەو هۆو سۆنگانەی لەپشت راگواستنی هەریەکێ لەو ناوچانەوەیە، هەموو ئەو ناوچانەمان پۆل پۆل کردووەو هەریەکێك بەجیا باسی لێوە دەکەین.

بەڵام پێداویستییەکانی لێکۆڵینەوەکە وا دەخوازێ بەر لەباسکردنی جۆرەکانی راگواستنو ناوچەکانی سنوری کوردستانی عێراق دەست نیشان بکرێ تا روونتر شوێنە راگوێزراوەکانو رێژەی ئەو رووبەرەی بەر راگواستن کەوتووە، دیاری بکرێ.

---

[٢]ـ ناوەند، پەیامی کۆمەڵە: کاول کردنی کوردستان لە ستراتیجی بەعسدایە، گۆڤاری کۆمەڵە ژمارە٨، خولی٣، ئەیلولی ١٩٨٥. ل٤.

## ٢ـ ١ـ٢ : سنووری کوردستانی عێراق

اـ یەکێك لەو کێشە ئالۆزانەی لەسەرەتای پەیدابوونی مرۆڤایەتییەوە ڕووبەڕووی گەلان و وڵاتانی جیهان بۆتەوە، کێشەو گیروگرفتی بۆ دروست کردوون و تووشی جەنگ و پێکدادانی کردون، کێشەی سنوور بووە، هەر لەخێڵە سەرەتاییەکانەوە تا دروست بوون و پەیدابوونی ئیمپراتۆریەتە گەورەکان و ئینجا پەیدابوونی دەوڵەتی نوێ، ئەم کێشەیە پێ بەپێی ئەو گۆڕان و گەشەکردنانە هاتووە، هەمیشە لەگەڵ خۆیا گیروگرفتی هێناوە، چونکە یەکێك لەو فاکتەرانەی بڕیاردەری داڕشتنی سنووربووە، هێزی سوپایی و لەشکری ئەو گەل و نەتەوانە بووە، ئەو گەل و نەتەوانەی خاوەن هێزێکی مرۆیی و سوپایی گەورەبوون بە زەبری چەك و کوشتار خاکی گەلانی تریان دابڕیوەو بە بەشێك لەخاکی مێژوویی خۆیان لەقەڵەمیان داوە. مەسەلەی دیاریکردنی سنوورو قایلبوون بەو بەشە خاکەی لەسەر زەمین بەر گەلێك یا نەتەوەیەك کەوتووە، نەك هەر لەلایەن ئەو دەوڵەتانەی ستراتیجێکی پەلامارەدەرانەیان هەبووەو هەیە، یا ئەو دەوڵەتانەی چەند نەتەوەیەکیان تێدایەو چارەسەری مەسەلەی نەتەوایەتی تێدا نەکراوە، جێگەی مشت و مڕو لێدوان و کێشەو گیروگرفت بووە، بەڵکو لەو دەوڵەتانەش بەشێوەیەکی بنەڕەتی چارەسەری مەسەلەی نەتەوایەتی کراوە، ئەم کێشەیە کەم تا کورتێك بەچارەسەرنەکراوی ماوەتەوەو ناوبەناو بۆتە هۆی لەبەریەك ڕاچوون و توندو تیژبوونی پەیوەندی نێوان ئەو گەلانەی لەچوارچێوەی یەك دەوڵەتدا دەژین، یا لەچەن دەوڵەتێکدا هاوسنوورن. دیارە دیاریکردنی سنووری کوردستانی عێراق، دیاریکردنی ئەو مەڵبەندانەی بەخاکی مێژوویی کورد دادەنرێن و هەزاران ساڵە کورد نیشتەجێیەتی، هەمیشە گیروگرفتی بۆ کورد دروست کردووە، چونکە هەمیشە هەوڵی گۆڕینی واقعی مێژوویی و جوگرافی کوردستان و سڕینەوەی شوێنەواری کوردستانیبوونی ناوچەکانی، یەکێك بووە لەئەرکە سەرەکییەکانی رژێمە داگیرکەرە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق و ناسیۆنالیستە ڕەگەزپەرستەکانی عەرەب بەتایبەتی، چونکە کورد خاوەنی دەوڵەتی خۆی و لەشکرو سوپای تایبەت بەخۆی نەبووە، بۆیە ئێمە لێرەدا بەر لەدیاریکردنی سنووری کوردستانی عێراق پەنا دەبەینە بەر ڕاو بۆچونی جوگرافیزانە عەرەبی و

بیانییەکان، تا بزانین لەبارەی جوگرافیای کوردستانەوە، چ ڕاو هەڵوێستێکیان هەبووە.

جوگرافیزانی عەرەب شاکر خسباك لەکتێبەکەیدا (کوردو مەسەلەی کورد) لەبارەی جوگرافیای کوردستانەوە نوسیویێتی: (وشەی کوردستان وەکو زاراوەیەکی جوگرافی بۆ یەکەمین جار لەسەدەی ١٢ی زایینیداو لەسەردەمی سەلجوقیەکاندا بەکارهاتووە، کاتێ سوڵتان سنجەر بەشی ڕۆژئاوای هەرێمی شاخەکانی خستە ژێر دەسەڵاتی سلێمان شای خزمی، ئەو ناوچانەش هەموو ئەو شوێنانەی دەگرتەوە کە دەکەوتنە نێوان ئازربایجان و لوڕستان (سنە، دینەوەر، هەمەدان، کرماشان....هتد) سەرباری ئەو ناوچانەی ڕۆژئاوای چیای زاگرۆس، وەکو شارەزوورو کۆیە، زاراوەی شارەزووریش لەکۆندا بۆ ناوچەکانی سلێمانیو کەرکوكو هەولێرو قەزای خانەقینو مەندەلیو شارەبان بەکارهاتووە، ئەو زاراوەیە لەبەڵگە ڕەسمییەکانی سەردەمی عوسمانیەکانیشدا بەکارهاتووە[٣]).

مێژوونووسی بەناوبانگی روس، نیکیتین لەکتێبەکەیدا (کورد) لەبارەی جوگرافیای کوردستانەوە دەڵێت: (کوردستان چەند ویلایەتێك دەگرێتەوە کە زنجیرە چیای زاگرۆسیان لەنێواندایە، ویلایەتەکانی هەمەدانو دینەوەرو کرمانشاه دەکەونە ڕۆژهەڵاتی ئەو زنجیرەیە، لەڕۆژئاواشیدا ویلایەتی شارەزوورو شنگارە، کە پایتەختەکەشی قەڵای بەهار بوو[٤]).

مێژوونووسی بەناوبانگی عەرەبی عێراق عبدالرزاق الحسنی لەکتێبەکەیدا (تاریخ العراق السیاسي) دەڵێ: (کوردەکان لەعێراقدا لەو شارو گوندانەدا نیشتەجێن، کە بەهێڵێکی ڕاست لەسنوری ئێران ـ عێراق ڕا دەسپێدەکا، لە (چیای حەمرین) ڕا تا ( چیای شنگار) درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە ئەو شوێنەی کەبەسنوری عێراق ـ تورکیاـ سوریا دەیبەستێتەوە[٥]).

و.ئاڕ.های یش لەکتێبەکەیدا (سنتان في کردستان) دەڵێت: (بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەو زەویانەی دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی دیجلەو باکووری ئەو هێڵەی لەمەندەلییەوە تا گەیشتنی زێی بچووك بەو ڕووبارە درێژ دەبێتەوە، نیشتیمانی

---

[٣]ـ الدکتور شاکر خصباك: الکرد والمسألة الکردیة، بغداد، ١٩٥٩، ص١٤ـ١٥

[٤]ـ نکیتین، باسیل: الاکراد، أصلهم، تأریخهم خصباك، موطنهم ـ ترجمة: طائفة من الکتاب، دار الروائع، مطبعة الجهاد، بیروت، ١٩٥٨ ص١٤٤.

[٥]ـ الحسني، عبد الرزاق: تأریخ العراق السیاسي، الجزء الثالث، ص٢٩٨.

کوردەکانەو گرنگترین دوو مەڵبەند کە دەکەوێتە باشووری زێی بچووکەوە: کەرکوك‌و سلێمانییە. شاری یەکەم، وەکو هەولێر، دانشتوانی تورکیشی تێدایە، بەڵام ئەوی دیکەیان بەتەواوەتی کوردنشینە، هەردوکیشیان مەرکەزی یەکەیەکی سیاسین[٦]).

مێجەر ئەدمۆنزیش لەکتێبەکەیدا (کوردو تورك‌و عەرەب) دەڵێت: (کوردستان بەسەر تورکیاو عێراق‌و ئێراندا دابەشکراوە، چەند چوکلەیەکیشی لەسوریاو یەکێتی سۆڤییەت هەیە. سنورەکانی باکوری بەهێڵێکدا دەڕوا، کە بە ئەریڤان‌و ئەرزەڕۆم‌و ئازربایجاندا تێدەپەڕێ، ئنجا بەشێوەیەکی کەوانەیی لە مەراشەوە بەرەو حەڵەب خوار دەبێتەوەو لەباشووری ڕۆژئاواش ڕا بە درێژایی بناری ئەو چیایانەی بەرۆخەکانی دیجلە دەگەنەوە، درێژ دەبێتەوە، ئینجا دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی دیجلەوەو زۆر لێی دوور ناکەوێتەوەو لەهێڵی چیای حەمرینەوە تا دەگاتە خاڵێك لەگەڵ سنووری عێراق ـ ئێران لەنزیك شاری (مەندەلی) درێژ دەبێتەوە[٧]).

هەروەها دکتۆ فاضل حسین لەکتێبەکەیدا (مشکلة الموصل) نوسیوێتی: (کۆمسیۆنەکە چۆوە سەر ژمارەیەکی زۆر نەخشە عەرەبیەکان‌و سەدان نەخشەی دێرینی نێوان سەدەی شانزەهەم‌و بیستەم‌و سەفەرنامەکانی هەموو قوناغەکانی سەرچاوە جوگرافییەکان‌و کتێبە جوگرافییەکانی خوێندنگە ناوەندیە عەرەبیەکانی میسر، لەئەنجامدا چووە سەر ئەو باوەڕەی کە سێ ناوچەی دیار هەیە: ١ـ عێراقی عەرەبنشین، ٢ـ جزیرە، ٣ـ کوردستان. عێراق لەباکووردا لەهیت ـ تکریت یا لەناوچەی چیای حەمرین تێپەڕ نابێ. هیچ بەشێکی خاکەکەی جێی مشتومڕ نییەو هیچ کات بەشێك نەبووە لەعێراقی عەرەبنشین. کۆمسیۆنەکە ساغی کردەوە کە لەهەموو ئەدەبیاتی جوگرافیادا، لەسەردەمی فەتحی عەرەبەوە تا مێژووی لێکۆڵینەوەی کۆمسیۆنەکە، واتە لە (١٩٢٥) خاکی جێی مشتومڕ نەبووەو بەهیچ شێوەیەك بە بەشێکی عێراق دانەنراوە[٨]).

---

[٦]ـ های، دبلو، آر: سنتان في كردستان، ترجمة: فؤاد جميل، الجزء الاول، ص٥٨.

[٧]ـ ادموندز، سي، جي،: كرد وترك وعرب، ترجمة : جرجيس فتح اللة، مطبعة التايمس، بغداد، ١٩٧١، ص٧.

[٨]ـ الدكتورفاضل حسين: مشكلة الموصل، اطروحة دكتوراه، ١٩٧٧، ص٧٨.

هەروەها دکتور شاکر خصباك لەکتێبەکەیدا (الاکراد) دەڵێ: (هەروەها کوردە لوڕەکان لەهەردوو لیوای عەمارەو کوتدا بلاوبونەتەوە، هەروەك ژمارەیەکی زۆریشیان لەبەغداو بەسرەو هەموو شارەکانی تردا دەژین[9]).

هەموو ئەو راو بۆچوونانە ئەو زاناو گەڕیدە جوگرافی زانانە سەبارەت بە دیاریکردنی ناوچەکانی کوردستانی عێراق لە چەند خاڵێکدا یەکانگیر دەبنەوە:

١ـ هەموو ئەو ناوچانەی دەکەوێتە باکووری چیای حەمرین، ناوچەی کوردستانە.

٢ـ هەموو ئەو ناوچانەی دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی دیجلە، لەو شوێنەوە کە چیای حەمرین دیجلە دەبڕێ تا دەگاتە شاری موسڵ، ناوچەی کوردستانە.

٣ـ هەموو ئەو ناوچانەی دەکەوێتە باکورو باکوری ڕۆژئاوای شاری موسڵ، واتە ناوچەکانی شنگارو تەلەعفەرو زمار، زمار ناوچەی کوردستانە.

٤ـ قەزاکانی خانەقین و مەندەلی و ئەو ناحیەو ناوچانەی سەر بەو قەزایانەن، هەموو ناوچەکانی کوردستانە.

بەڵام ئەوەی بەرچاو دەکەوێت، پشتگوێ خستنی ناوچەی بەدرەو زرباتیەو جەسانە، کە بەشێکە لەناوچەی پشتکۆو درێژبوونەوەیەکی سروشتیی ناوچەی لوڕی بچوکی کوردستانی ئێرانە[10]).

بە شێوەیەکی گشتی کوردستانی عێراق یا کوردستانی باشوور دەکەوێتە ناوەڕاست و باکووری عێراق و هەموو ئەو خاکە دەگرێتەوە کە بەهێلێکی راست لەسنووری عێراق ـ ئێرانەوە بەرەو ڕۆژئاوای بەلەدروزو شارەبان (مقدادیە) دەڕواو لەوێش ڕا بەرەو چیای حەمرین هەڵدەکشێ، ئنجا بەرەو باکووری ڕۆژئاوا لەگەڵ زنجیرە چیای حەمریندا دەڕوا تا دەگاتە فەتحە، لەفەتحە ڕا لەگەڵ ڕووباری دیجلە بەرەو سەر هەڵدەکشێ، هەموو ئەو زەویانەی دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتییەوە بەر کوردستان و هەموو ئەو زەویانەش کە لەڕۆژئاوایەتی بەرناوچەی عەرەبی عێراق دەکەوێ تا دەگاتە سەروی شاری موسڵ، لەسەر موسڵیشەوە هێلێکی راست روو لەباشووری ڕۆژئاوا دەکات و بەخوار تەلەعفەردا تێدەپەڕێت تا دەگاتە ١٠کم

---

[9] الدکتور شاکر خصباك: الاکراد، دراسة جغرافية اثنوغرافية، مطبعة شفيق، بغداد، ١٩٧٢، ص٥٢٠.

[10] ـ ناوچەکانی لوڕی بچوك بریتین لە: پشتکۆ، پێشکۆ، لەك، کەلهوڕو باڵاگریوە، بەشێك لەناوچەی پشتکۆ کەوتۆتە عێراقەوەو باقی بەشەکانی تری ناوچەی لوڕی بچووك کەوتونەتە کوردستانی ئێرانەوە.

باکووری شاری (بەعاج) ، ئینجا بەهێڵێکی راست بەرەو رۆژئاوا دەڕواتو لەگەڵ سنووری عێراق ـ سوریادا یەك دەگرێتەوە.

پێوانەی خاکی کوردستانی عێراق دەکاتە ٨٦هەزار کم[٢]، واتـە: ١٩,٦٢٪ی خاکی عێراق پێکدێنێت وزیاتر لە ٣٦٦٨٤کم[٢] بەر شاڵاوی ڕاگواستن کەوتووە کە دەکاتە زیاتر لە ٤٢،٦٦٪ی خاکی کوردستانی عێراق.

ب ـ کوردستانی عێراق لـەڕووی ئیـداری سیاسـییەوە بەسـەر دوو ناوچـەدا دابەشکراوە:

یەکەم: ناوچەی ئۆتۆنۆمیدار.

دووەم: ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی مەرکەزیدایە.

## یەکەم: ناوچەی ئۆتۆنۆمیدار

ئـەو ناوچـەیەیە کـە بـەگوێرەی یاسـای ئۆتۆنـۆمی لـە ١٩٧٤/٣/١١دا دیاریکراوەو پارێزگاکانی هەولێر، سـلێمانیو دهـۆك دەگرێتـەوە کەرووبەرەکـەی دەکاتـە ٣٦٣٤٧کـم[٢]. بـەو پێیـەی ناوچـەی ئۆتۆنۆمیـدار ٤٢,٢٦٪ی خـاکی کوردستانی عێراق پێکدەهێنێو ٥٣,٧٤٪ی لێ دابڕاوە بۆ دەسەڵاتی مەرکەزی.

لەکۆی ٣٦٣٤٧کم[٢] زیاتر لە ١٣١٠٠کم[٢] بەر شاڵاوی ڕاگواستن کـەوتووە، یـا بەواتایەکی تر ٣٦,٠٤٪ی ناوچـەی ئۆتۆنۆمیـدار راگوێزرایـەوە، بـەجۆرە تـەنها ٢٣٢٤٧کم[٢] بەکردەوە لەسەر ناوچەی ئۆتۆنۆمییە.

## دووەم: ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی

٥٣,٧٤٪ی خاکی کوردستانی عێراق دابڕاوە بۆ دەسەڵاتی مەرکـەزی بەغـدا کە ئەویش بەسەر چەندین پارێزگادا دابەشکراوە کە ئەمانەن: نەینەوا، کەرکوك، سەلاحەدین، دیالە، واست ، میسان. مەبەست لەدابەشکردن بە پلـەی سـەرەکی ئەوەیە کە کورد لەو پارێزگایەدا کەمایەتیو کوردستانیش پارچەپارچەتر بکـەن تا بتوانن ئاسانتر بیگرێو گۆلتر نەخشەکانی خۆیان لەمەڕ ڕاگواستنو بەعـەرەب کردنی کوردستان جێبەجێ بکەن.

ئەم خشتەیەی خوارەوە ڕێـژەی خـاکی کوردسـتان لـەپێکهێنانی ئـەو شـەش پارێزگایەو ڕێژەی لەپێکهێنانی خاکی کوردستانی عێراقدا نیشان دەدا.

## خشتەی ژمارە (٢)

| ژ | پارێزگا | رووبەرەکەی بە کم٢ | رووبەری ناوچە کوردییەکان لەپارێزگاکەدا بەکم٢ | ناوچە کوردییەکانی پارێزگاکە ٪ | ناوچە کوردییەکان لەچاو کوردستانی عێراق |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | کەرکوک | ١٠٣٩١ | ١٠٣٩١ | ١٠٠ | ١٢,٠٨ |
| ٢ | نەینەوا | ٣٧٦٩٨ | ١٥١٩٢ | ٤٠,٣٠ | ١٧,٦٧ |
| ٣ | سەلاحەددین | ٢٩٠٠٤ | ٤٠١٩ | ١٣,٨٦ | ٤,٦٧ |
| ٤ | دیالە | ١٩٢٩٢ | ١٣٨٨٤ | ٧١,٩٧ | ١٦,١٤ |
| ٥ | واست | ١٧٣٠٨ | ٣٧٤٠ | ٢١,٦١ | ٤,٣٥ |
| ٦ | میسان | ١٤١٠٣ | ٢٢٢٤ | ١٥,٧٧ | ٢,٥٩ |

## نەخشەی ژمارە (١)

## عێراق و کوردستانی باشوور (کوردستانی عێراق)



## فەسلی دووەم

# ڕاگواستنی ناوچەکانی تەوەرە ستراتیجیەکان

### ٢-١-٢: تەوەرە ستراتیجییەکانی بەرگری کردن لەعێراقدا

عێراق دەکەوێتە بەشی باشووری رۆژئاوای کیشوەری ئاسیاوە، لەرۆژهەلات را لەگەڵ ئێرانو لەرۆژئاواوە لەگەڵ ئوردنو عەرەبستانی سعودیو سوریا، لەباکوردا لەگەڵ تورکیاو لەباشووردا لەگەڵ عەرەبستانی سعودیو کوێت هاوسنوورە. هەروەك سنورێکی کورتیشی بەسەر کەنداوەوەیە، کە درێژییەکەی ٣٨ میلە.

هەرولاتێکی دونیا کە هاوسنوور بێ لەگەڵ ولاتانی تردا بەپێی بنەما جیۆپۆلەتیکییەکانو بەگوێرەی زانستی سەربازیو جوگرافیای سوپایی، تەوەرەکانی بەرگریکردن لەهێرشو پەلاماری دەولەتە هاوسێکانی دادەڕێژێ. دیارە فاکتەرە ئابووری، سروشتیو مرۆییەکانو سروشتی چینایەتی ڕژێمەکەو فەلسەفەی تایبەتی حکومڕانی دەوریان هەیە لەدارشتنی ئەوەی ئەو دەولەتە ستراتیجێکی پەلاماردەرانەو هێرشبەرانە بگرێتەبەر، یا ستراتیجێکی بەرگریکردن. جا لەبەرئەوەی دارشتنی تەوەرەکانی بەرگریکردن بەلای بەعسەوە تەنها بەرگری نیە لەهێرشو پەلاماری دراوسێکان، بەڵکو بەرگریکردنیشە لە (مەترسیی نەتەوەی کورد)و کێشەو جولانەوە رزگاریخوازانەکەی، بۆیە لەو بۆچوونو دارشتنەدا کێشەی کورد دەخاتە مەترسییەکانی سەر ئەمنی ستراتیجی عێراق، کە ئەویش پەیوەندی بە راگواستنو کۆچ پێکردنی نەتەوەی کوردو بەعەرەبکردنی شارو گوندو ناوچە کورد نشینەکانەوە هەیە، بۆیە بە دوورو درێژی

باسی ئەو تەوەرانەو گرنگیو بایەخی هەریەکێکیان دەکەین، کە دەکەونە سنووری کوردستانەوەو تەوەرەکانی تر فەرامۆش دەکەین.
مەبەست لەتەوەرەی ستراتیجی، ئەو ناوچەو ڕێگەو بانانەیە کە سوپای دەوڵەتێك لەهێرشێکی ستراتیجیدا بۆ گرتنی نیشانێکی ستراتیجیی دیاریکراو لەناوچەکەدا دەگرێتەبەر. تەوەرە ستراتیجییەکان بە پلەی یەکەم بە گوێرەی تۆپۆگرافیی ناوچەکەو هەبوون یا نەبوونی کۆسپە سروشتیو دەستکردەکان دیاری دەکرێن. هەرچەندە گەشەکردنو پەرەسەندنی تەکنەلۆجیای سەربازییو پەیدابوونی فڕۆکەی جەنگیی نوێو تانكو زرێپۆشو دروستکردنی لەمپەڕو کۆسپی دەستکرد لەجیهانی ئێستادا دەوری گرنگو کاریگەریان هەیە لە دیاریکردنی جۆری جەنگەکەو تەوەرەکانیو لابەلاکردنەوەی جەنگدا، بەڵام تا ئێستاش تەوەرە ستراتیجییەکان، وەکو زەمانی کۆن، بایەخی ستراتیجیی خۆی هەرماوە، چونکە ئەو تەوەرانە، وەك باسکران، بەپلەی یەکەم پەیوەندی تۆپۆگرافیای ناوچەکەو سنووری هەردوو دەوڵەتەکەوە هەیە، دیارە پەیدابوونی چەکی ستراتیجیی وەك: چەکی ئەتۆمی، هایدرۆجینی، نیترۆنی، لیزەر...هتد. ستراتیجیی سوپایی جەنگی هاوچەرخی لەبنچینەوە گۆڕیوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو چەکە ستراتیجییانە تایبەتن بەچەند دەوڵەتێکەوەو باقی دەوڵەتانی تر لێی بێبەشن، بۆیە بایەخو ئەهمیەتی جەنگی کلاسیکی هەروەکو خۆی ماوە.
تەوەرە ستراتیجییەکانی بەرگریکردن لەعێراق لەسەر بنچینەی مەترسییەکانی دەرەوەو ناوەوە دانراونو روو لەپاراستنی ئەم شوێنانەیە:
١ــ بەغدا: کە پایتەختی عێراقو شوێنی کۆبوونەوەو جێگیربوونی دامو دەزگاکانی دەوڵەتو ناوەندی حکومڕانیی سەرانسەری وڵاتە، واتە: دڵی دەوڵەتەکەیە.
٢ـ کەرکوك: کە سەرچاوەو شادەماری ئابووری عێراقو گرنگترین شوێنی ستراتیجی باکووری عێراقە، گرتنی کەرکوك واتە دەستگرتن بەسەر سەرچاوەی پەترۆڵی عێراقداو بێبەشکردنی دەوڵەتی عێراق لەو سامانە زۆرەی نەوتی کەرکوك.
٣ـ بەسرە: کە تاکە دەروازەی عێراقە بەسەر دەریاوەو بینە قاقایەتی، یا وەك عەرەب دەڵێ (عنق الزجاجة)ی عێراقە، چونکە ژیانی سوپاییو ئابووری عێراق بە بەردەوامبوونی کەشتیوانیی (شط العرب)ەوە بەستراوەتەوە.

هەریەکێك لەم سێ شوێنە نەخشەی بەرگریکردنی تایبەتی خۆی هەیە. بۆ نمونە: پارێزگاکانی نەینەوا، کەرکوك، سەلاحەددین، دیالە، کوت، لە نەخشەی بەرگریکردنی شاری بەغدادان.

لەبەرئەوەی ئەو تەوەرە ستراتیجییانە لەسەر بنچینەی مەترسییەکانی دەرەوەو ناوەوە دارێژراون، ئێمە ئەو تەوەرانە بە پێی ئەو ئەرکانەی بۆیان دیاریکراون دەکەینە دوو بەشەوە:

أ ـ تەوەرەکانی دەرەوە: ئەو تەوەرانەن کە لەسەر بنچینەی مەترسییەکانی ئێران، تورکیا، سوریا...هتد دارێژراون.

ب ـ تەوەرەکانی ناوەوە: ئەو تەوەرانەن کە لەسەر بنچینەی مەترسیی کورد لەسەر پاشەڕۆژی عێراق دارێژراون.

## ٢-٢-٢ تەوەرەکانی دەرەوە

بۆ ئاسانترکردنی باسەکە تەوەرەکانی دەرەوە بە گوێرەی جیاوازی دەوڵەتە هاوسنورەکانی عێراق بەسەر ئەم تەوەرانەی خوارەوەدا دابەش دەکەین:

یەکەم: تەوەرە ستراتیجیەکانی عێراق ـ ئێران.

دووەم:تەوەرە ستراتیجیەکانی عێراق ـ تورکیا.

سێیەم: تەوەرە ستراتیجیەکانی عێراق ـ سوریا.

## یەکەم: تەوەرە ستراتیجیەکانی عێراق ـ ئێران

أ ـ ئێران درێژترین سنوری لەگەڵ عێراقدا هەیە، کە درێژییەکەی (١٢٣٥کم[1])و لەڕێژگەی (شط العرب)ەوە دەست پێدەکا تا دەگاتە دۆڵی حاجی بەگ، کە سنوری عێراق ـ ئێران ـ تورکیا بە یەکەوە دەبەستێتەوە.

---

[1]ـ بەگوێرەی (الجغرافية العسكرية للعراق) درێژیی سنورەکانی عێراق ـ تورکیا ٣٥٠، عێراق ـ ئێران ١٢٣٥، عێراق ـ سوریا ٦١٨، عێراق ـ ئوردن ١٤٨، عێراق ـ سعودیە ٩٤٨و عێراق ـ کوێت٢٠٠ کیلۆمەترە. لەکاتێکدا بە گوێرەی (المجموعة الاحصائية السنوية لسنة ١٩٨٤) درێژی سنورەکان یەك لەدوای یەك، بەم جۆرەیە: ٣٧٧، ١٣٠٠، ٦٠٠، ١٤٠، ٨١٢ ، ١٩٥کم. ئێمە بەڵگەی ( الجغرافية العسكرية)مان کردۆتە بنچینە.

ب ـ لەبەر درێژیی سنوری عێراق ـ ئێـران‌و تۆپۆگرافیـای جیـاوازی سـنور، ساحەی عێراق ـ ئێران، لەڕووی زانستی جوگرافیـایی سـوپاییەوە دەکرێتـە سـێ بەش:

١ـ بەشی باکوور

٢ـ بەشی ناوەڕاست

٣ـ بەشی باشوور

ئەوەی کە پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوە هـەبێت، هـەردوو بەشـی بـاکوورو ناوەڕاستە، بۆیە واز لەبەشی باشوور دەهێنین‌و تەنها لەو دوو بەشە دەدوێین.

١ـ بەشی باکوور:

ـ ئەو بەشە لەو شوێنەوە دەست پێدەکات کـە لەسـنوری عێـراق ـ ئێـران ـ تورکیا بەیەك دەگەن تا دەگاتە رووباری سیروان (دیالە) لەنزیك هەڵەبجە، هێڵـی سنور لەو بەشەدا بەنیسبەت ئێرانەوە قۆقزو بەنیسبەت عێراقەوە روو لە چـاڵەو بریتییە لە زنجیرە چیای سەخت‌و دژوار بە نیسبەت هەردوولاوە.

ـ ئەو بەشە گرێی هاتوچۆی عێراق‌و ئێرانـی تێدایـە، موسـڵ گرێـی هاتوچـۆی باکوری عێراق‌و تەورێزیش گرێی هاتوچۆی باکووری رۆژئاوای ئێرانە. هەروەها گرنگترین تەوەرەی پێدا دەڕوا، کـە بۆتـە هـۆی بەسـتنەوەی ئـەو بەشـە لـەو ناوچەیەدا کە ئەویش تەوەرەی هەولێر ـ تەورێزە.

ـ ئەو ناوچەیە گرنگترین مەڵبەندی دەرهێنانی نـەوتی عێراقـی تێدایـە، بـەڵام لەبەشی ئێراندا هیچ نیشانەیەکی ستراتیجی گرنگی لێ نییە.

٢ـ بەشی ناوەڕاست:

ئەو بەشە دەکەوێتە نێوان رووباری سیروان‌و کوت، هێڵی سنور لەو بەشەدا بە نیسبەت عێراق قۆقزو بەنیسبەت ئێران روو چاڵە. بایەخەکەی لەوەدایە کە:

ـ دوو نیشانی ستراتیجیی گرنگی تێدایە، کە بەغداو تارانە.

ـ گرنگترین هێڵی جوجوڵ‌و خەتەرترینیان بەو ناوچەیەدا دەڕوا.

ـ نزیك بوونەوەی هێڵی سنور لە بەغـدا، کەتـەنها ١١٧ میـل لێـی دوورە، لـە کاتێکدا پێنج ئەوەندە لە تارانەوە دوورە.

- لەئێراندا کۆسپە سروشتییەکان، کە بریتین لە زنجیرە چیا سەختەکان، دەکرێ بە ئاسانی بەرگریان لێ بکرێ‌و گرنگترینی ئەو کۆسپانە دەربەندی بای تاقە لە زنجیرەی کەرەند.
- هێڵی سنور بە بنارەکانی رۆژئاوای شاخی پشتکۆدا دەڕوا، بەم جۆرە ناوچە شاخاوییەکان دەکەونە ئێرانەوە، لەکاتێکدا ناوچە دەشتاییەکان بەر عێراق دەکەون.

ج - تەوەرەکانی جموجۆڵی سەربازی

لە ساحەی ئێران - عێراقدا سێ تەوەرەی سەرەکی بۆ جموجۆڵی سەربازی هەیە کە ئەمانەن:

١- تەوەرەی تەورێز - مهاباد - هەولێر.
٢- تەوەرەی تاران - کرماشان - بەغدا.
٣- تەوەرەی ئەهواز - بەسرە.

١- تەوەرەی تەورێز - هەولێر

ا - ئەو تەوەرە گرنگترین تەوەرەی ستراتیجییە لە ناوچەکەدا، چونکە ناوچە (نەوت)ییەکانی عێراق بە ناوچەی ئازربایجان‌و هەروەها موسڵ کە گرێی هاتوچۆی سەرەکی باکوری عێراقەو تەورێزیش گرێی هاتوچۆی سەرەکی باکوری رۆژئاوای ئێران بەیەکەوەی دەبەستێتەوە.

ب - ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان‌و نیشانەکان:

* بە نیسبەت ئێرانەوە:
ناوچەی گردکردنەوەی هێزەکان: تەورێز، مهاباد، مەراغە، میاندواو.
- نیشانەکان: رواندز، هەولێر، کەرکوك، موسڵ.
* بە نیسبەت عێراقەوە:
- ناوچەکانی گردکردنەوەی هێزەکان: هەولێر، رواندزو هێزەکانی پێشەوەش لە ڕایات.
- نیشانەکان مهاباد، مەراغە، تەورێز.

ج ـ ئەو تەوەرە ڕێگاکەی قیرتاو کراوە لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا، لە هەردوو لاوە بۆ بەکارهێنانی ماشێن بە کەڵك دێ، جگە لە هەندێ شوێنی کە لە زستاناندا بەفر دایدەپۆشێ‌و دەیگرێ.

درێژی ڕێگاکە لە هەولێرەوە تا تەورێز ٣٥٥ میلە، بە ناوچەیەکی شاخاوی زۆر سەختدا دەڕواو سوپای عێراق دەتوانێ بۆ بەرگریکردن سودی لێ وەربگرێ چونکە:

- هێڵی جموجۆڵی ئەستور دەبێ لەسەر ئاقار (اتجاه)ی چیاکان‌و زنجیرە چیاکان هەموویان هاوڕێکن.
- ئەو تەوەرە گەلێ دەربەندی سەخت‌و هەڵدێری تێدایە، کە دەکرێ بەباشی بەرگری لێ بکرێ و ڕێگا نەدەن هێزەکانی ڕۆژهەڵات لەو تەوەرەدا پێشڕەوی بکەن. گرنگترینی ئەو دەربەندانەش ئەمانەن:

*دەربەندی حاجی ئۆمەران
*دەربەندی رایات
* دەربەندی ڕێزانۆك
* دەربەندی برسرینی
* دەربەندی جوندیان
* گەلی عەلی بەگ
* دەربەندی سپیلك
* دەربەندی میراوە

٢ـ تەوەرەی تاران ـ کرماشان ـ بەغدا

اـ ئەم بەشە مەترسیدارترین بەشە بە نیسبەت سوپای عێراقەوە، چونکە:

- کورتترین ڕێگایە لەنێوان بەغداو تاراندا‌و زۆرباشیش قیرتاو کراوە هەروەها ڕێگاکەش بە کەڵکی جموجۆڵی سەربازی دێ‌و سنووریش لە پایتەختی عێراق بە شێوەیەك نزیك دەبێتەوە، کە دەگاتە ٩٠ میل.
- وێڕای ئەو شوێنەوارە مەعنەوییەی کە عێراق لە ئەنجامی گرتنی پایتەختدا تووشی دەبێ، ئەوا ئەو هێزە دەتوانێ بگاتە ڕووباری فورات‌و عێراق بکاتە دوو پارچە، چونکە فورات لەو ناوچەیە لە دیجلە نزیك دەبێتەوە.

- له ناوچه‌که‌دا هیچ کۆسپێکی سروشتی گرنگ نییه، که ڕێگر بێ له پێشڕه‌وی جموجۆڵی سه‌ربازیی، چونکه گردۆلکه‌کانی داره‌ویشکه‌و قزلربات‌و حه‌مرین، ئه‌وه‌نده سه‌خت نین بتوانن ڕێگربن له‌به‌رده‌م هێرشه‌که‌دا.
- له‌ئاقاری مه‌نده‌لی - به‌له‌دروز - باقوبه‌وه مه‌ترسی له‌سه‌ر باڵی ڕاستی سه‌نگه‌ره‌کانی به‌رگری له داره‌ویشکه‌و قزلربات‌و حه‌مرین هه‌یه، جموجۆڵ له‌م ناوچه‌یه‌دا ته‌واوکه‌ری جموجۆڵی ناوچه‌که‌ی تره، زه‌ویش له‌باره بۆ به‌کارهێنانی ماشێن.
- ناوچه‌که ئاوی هه‌یه‌و ژیانیشی لێ ده‌کرێ.
- ناوچه‌که به که‌ڵکی ئه‌وه دێت به به‌رفراوانی ماشێنی تێدا به‌کار بهێنرێ، له‌به‌رئه‌وه ئه‌م ناوچه‌یه به نیسبه‌ت عێراقه‌وه پڕ مه‌ترسییه.

ب - ناوچه‌کانی گردکردنه‌وه‌ی هێزه‌کان‌و نیشانه‌کان.

* به نیسبه‌ت ئێرانه‌وه
- ناوچه‌کانی گردکردنه‌وه‌ی هێزه‌کان: هه‌مه‌دان‌و کرماشان. هه‌روه‌ها ده‌کرێ هه‌ندێ له هێزه‌کانی پێشه‌وه له قه‌سری شیرین گرد ببنه‌وه.
- نیشانه‌کان: چوار ڕیانی جه‌له‌ولا - شاری باقوبه - به‌غدا.

به نیسبه‌ت عێراقه‌وه:
- ناوچه‌کانی گرد کردنه‌وه‌ی هێزه‌کان: سه‌عدییه، جه‌له‌ولا، باقوبه، هه‌روه‌ها به‌شه‌کانی پێشه‌وه‌ش له خانه‌قین‌و مه‌نده‌لی کۆده‌بنه‌وه .
- نیشانه‌کان : کرماشان - هه‌مه‌دان - تاران.

ج - سوپای عێراق له‌م به‌شه‌دا ته‌نها دوو نه‌خشه‌ی به‌رگری له‌به‌رده‌مدایه:
- یه‌که‌میان: به پڕتاو په‌لاماری ناوچه‌ی بای تاق بدات‌و بیگرێ‌و له‌وێ به‌رگری بکا.
- دووه‌میان: به‌رگریکردن له‌زنجیره‌کانی داره‌ویشکه‌و قزلربات‌و حه‌مرین، له‌گه‌ڵ چاودێریکردنی ده‌روازه‌ی مه‌نده‌لی به‌هه‌ندێ هێزی گه‌ڕۆك.

د ـ ئەو دەروازانەی هەردوو لا لەهێرش بردندا دەیگرنە بەر، بریتین لە:
- رێگای بەغدا ـ باقوبە ـ خانەقین ـ قەسری شیرین ـ کرماشان ـ هەمەدان ـ تاران.
- رێگای بەغدا ـ باقوبە ـ مەندەلی ـ شاناباد (ئیسلام ئابادی ئێستا).
- بایەخ و کاریگەری رێگاوبانەکانی سلێمانی لەوەدا دەردەکەوێ، کە تەواوکەری جموجۆڵەکانی ئەو بەشەیە.
- لایەنی عێراق دەتوانێ بۆ دورکەوتنەوە لە دەربەندی بای تاق لەرێگای قەسری شیرین ـ گێلان ـ کرماشان بگرێتەبەر.

هـ ـ تەوەرەی کرماشان ـ سلێمانی: بە بەراوردکردنی لەگەڵ تەوەرەکانی تردا بە تەوەرەیەکی ناسەرەکی دەژمێردرێت، کە هەڕەشە لە ناوچەی کشتوکاڵی سلێمانی دەکاو لەوێشەوە مەترسی دەخاتە سەر کەرکوك. دەشێ سود لەم رێگایانە وەربگیردرێت بۆ هاوکاریکردنی تەوەرە سەرەکییەکانی تر.
- رێگای کرماشان ـ سنە ـ مەریوان ـ پێنجوێن ـ سەیدسادق ـ سلێمانی.
- رێگای کرماشان ـ سنە ـ سەقز ـ بانە ـ سەردەشت ـ قەڵادزێ ـ سلێمانی.
- رێگای کرماشان ـ سنە ـ سەقز ـ بانە ـ چوارتا ـ سلێمانی.
- رێگای کرماشان ـ نەوسود ـ هەڵەبجە ـ سلێمانی.

و ـ تەوەرەی کوت ـ بەدرە ـ زرباتییە ـ مەهران ـ ئیلام ـ شا ئاباد (ئیسلام ئاباد).

**کرماشان:**

ئەمەش تەوەرەیەکی ناسەرەکییە، کە دەشێ هێزەکانی سوپای ئێران سودی لێوەربگرن بۆ مەترسی خستنە سەر دیجلەو پێشڕەویکردن بەرەو فورات لەرێگای کوت ـ حەی ـ ناسریەوە بۆ بەشکردنی عێراق، تاکە رێگە کە کوت بە مەهرانەوە دەبەستێتەوە رێگای کوت ـ بەدرە ـ زرباتیە ـ مەهران ئیلام ـ شاناباد ـ کرماشان، گرنگی ئەو تەوەرە ئەوکاتە دەردەکەوێ، کە هێزەکانی ئێران لە بەشی ناوەڕاستدا بە هێزێکی زۆرەوە بێنە پێشەوە، ئەوا لەو تەوەرەشەوە دەتوانن چەند رەتلێك بۆ یارمەتیدانی رەتلە گەورەکانی تەوەرە سەرەکییەکە بنێرن، بە مەبەستی گرتنی شاری کوت، کە گرێی هاتوچۆی ئەو ناوچەیەیە، ئینجا گرتنی بەغدا.

## دووەم: تەوەرە ستراتیجیەکانی عێراق ـ تورکیا

ا- تورکیا دەکەوێتە باکووری عێراقەوەو سنورێکی ٣٥٠ کیلۆمەتریی لەگەڵ عێراقدا هەیە، کە بەناوچەیەکی شاخاوی سەختدا دەڕواو لە دۆڵی حاجی بەگەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە ئەو شوێنەی خاپور دەڕژێتە ناو رووباری دیجلەوە.

ب ـ لەپێناو ئاسانترکردنی باسەکەو بەپێی زانستی جوگرافیای سوپایی ساحەی باکوور دەکرێتە دوو بەش:

١ـ بەشی رۆژهەلات

٢ـ بەشی رۆژئاوا

١ـ بەشی رۆژهەلات

ـ ئەم بەشە لە ناوچەیەکی شاخاوی زۆر سەخت پێکدێت، چ لەدیوی عێراق و چ لەدیوی تورکیاو، لەبەر کەمیی رێگاوبان یارمەتی جموجۆڵی فراوان نادات، بەلام دەشێ هەردوولا بۆ جموجۆڵی بەرگریکردن سودی لێ ببینن، ئەو رێگەیانەش کە تیایدایەتی، تەنها بە کەلکی هاتوچۆی پێرۆو ئاژەڵ دێت، زۆربەی وەرزەکانی سالیش لەبەر بەفر دەگیرێت.

ـ لەبەرئەوەی ئەم بەشە لە ناوچەی ئازربایجانی ئێرانەوە نزیکە، کە ئەویش بە گرنگترین هێڵی جموجۆڵەوە بەستراوەتەوە، کە رێگای موسل ـ هەولێر ـ رەواندوز ـ مهاباد ـ تەورێزە، بۆتە هۆی دروستکردنی مەترسی لەسەر ئەم بەشە، چونکە ئەگەر تورکیا بیەوێ لەم بەشەوە هێرشێکی ستراتیجیی بکاتە سەر عێراق، ئەوا دەبێ ئازربایجانی ئێران بگرێت، ئەوسا لەوێرا لەسەر تەوەرەی تەورێز ـ رەواندوز ـ هەولێر دەڕواو رەتلێکی لاوەکیش بەرەو تەوەرەی تەورێز ـ وان ـ باشقەلا-ئامێدی دەنێرێ و بەجۆرە ساحەی سنوری باکوور هەڕەشەی لێ دەکرێت و موسڵ دەکەوێتە مەترسییەوە. هەروەها رەواندوز بە رێگایەکی تریشەوە بە باشقەلاوە بەستراوەتەوە، کە رێگای باشقەلا- دیزەکوار- نیری ـ جامە ـ رەواندوز، کە بەکەڵکی (ئالیات) دێ تا جامە سەرەکییەکانی بەرەو پێشەوە بچن.

ـ نیشانه ستراتیجییه‌کان:

* له‌ته‌وریز ـ رایاتـه‌وه: هێزه‌کـان بـه‌ره‌و ره‌وانـدوزو هـه‌ولێر، وه‌ك نیشـانه‌یه‌کی سه‌ره‌تایی ئینجا به‌ره‌و موسڵ ده‌چن، که نیشانه ستراتیجییه گرنگه‌که‌یه.

* له وان ـ باشقه‌ڵا ـ ئامێدی ـ موسڵه‌وه: هێزه‌کان به‌ره‌و ئامێـدیو دهـۆك وه‌ك نیشانێکی ستراتیجیی پێشه‌وه ئینجا به‌ره‌و موسـڵ، کـه نیشـانه سـتراتیجییه گرنگه‌که‌یه، ده‌چن.

* به‌ڵام لایه‌نی عێراق نیشانه ستراتیجییه‌که‌یانی له رێگای دووه‌مه‌وه (ئامێدی ـ وان) سـوپایی تـورك‌و باشـقه‌ڵایه وه‌ك نیشـانێکی سـه‌ره‌تای، ئینجـا وان کـه نیشانێکی ستراتیجیی گرنگی باشوری رۆژهه‌ڵاتی تورکیایه.

٢ـ به‌شی رۆژئاوا

ـ ئه‌م به‌شه گرنگترین ساحه‌ی باکووره به نیسبه‌ت عێراقه‌وه، چـونکه زه‌ویـه‌کانی ده‌کرێنه‌وه‌و کۆسپه‌کانیش که یارمه‌تی به‌رگریکردن ده‌ده‌ن، که‌م ده‌بنه‌وه.

ـ گرنگترین رێگا که یارمه‌تی بـه‌کارهێنانی (ئالیـاتی) فـراوان ده‌دا له‌زۆربـه‌ی مانگه‌کانی ساڵدا، له باکووره‌وه به‌ره‌و رۆژئاوا به‌م به‌شه‌دا تێده‌په‌ڕێ.

ـ ئه‌م به‌شه گرنگترین نیشانی ستراتیجیی‌و گرێـی هاتوچـۆی بـاکووری عێـراق‌و باشووری تورکیا به‌یه‌که‌وه ده‌به‌ستێته‌وه، که موسڵ ـ دیاریه‌کره.

ـ شێوه‌ی زه‌وی دیوی تورکیا که نزیکه له سنوره‌کانی باکووری عێـراق ـ سـوریا کاری به‌رگری کردن به نیسبه‌ت تورکیاوه ئاسان ده‌کا، چونکه زنجیره‌یه‌ك چیای لێیه، که به‌سه‌ر هه‌موو رێگاکاندا زاڵه، به پێچه‌وانه‌ی زه‌وییـه‌کانی سـوریا ـ عێراق، که کراوه‌یه‌و کۆسپێکی گرنگی وای لێنییه بتوانێ پێشڕه‌وی هێزه‌کانی باکوور دوا بخا، یا یارمه‌تی به‌رگریکردنی بدات.

ـ ناوچه‌که له‌عێراقدا ده‌شتاییه، به‌تایبه‌تی له رۆژئاوای رووباری دیجله به که‌ڵکی جه‌نگی زرێیی‌و کاری ئاسمانی دێت، به‌ڵام به‌کاری جموجۆڵی به‌رگریگردن نایه، بـه‌ڵکو بـه پێچـه‌وانه‌وه، به‌کـه‌ڵکی هێرشـبردن دێ، هـه‌روه‌ها ناوچـه‌که‌ش وشکارۆیه، بێجگه له ناوچه‌کانی نزیك دیجله. هه‌ڵوێستی سوریا، هه‌ڵبـژاردنی ئه‌و رێگایانه دیاریده‌کات، چونکه به‌شێك له‌و رێگه‌ی جموجۆڵانه، کـه عێـراق به تورکیاوه ده‌به‌ستـێ، به زه‌وی‌و زاره‌کانی سوریادا ده‌ڕوا.

ج ـ تەوەرەکانی جموجۆڵی سەربازی:

١ـ ڕێگای دیاربەکر ـ جزیر ـ موسڵ ئەو ڕێگایەیە، کە هێزەکانی تورکیا دەیگرنەبەر، ئەگەر هاتو نەیانویست پەلاماری سوریا بدەن.

٢ـ ڕێگای دیاربەکر ـ نسیبین ـ تەل کوچك ـ موسڵ.

٣ـ ڕێگای تر هەیە هاوڕێك لەگەڵ ڕووباری دیجلەدا، ئەویش ڕێگای جزیر ـ شەلگییە ـ تەل ئەبو زاهر ـ زمار ـ عەین زالە ـ موسڵ.

١ـ ڕێگای دیاربەکر ـ جزیر ـ زاخۆ ـ موسڵ

ـ ئەگەر تورکیا بیەوێ سوریا بەبێ لایەنی بێنێتەوەو پەلاماری نەدا، ئەوا ئەو ڕێگەیە تەوەرەیەکی سەرەکی جموجۆڵە لەو بەشەی ساحەی باکووردا، چونکە تاکە ڕێگەیەکی باشە بۆ هاتوچۆی هەموو جۆرە (صنف)ێك لە هەموو وەرزەکانی ساڵداو یارمەتی هەردوولاش دەدات کە هێزێکی زۆر بخەنە جەنگەوە. ـ گرنگترین شوێنێك کە عێراق لەسەر ئەو ڕێگەیە بۆ بەرگریکردن دیاری بکات، ڕووباری خاپووروو دەربەندی زاخۆو چیای سپی (چیای بێخێر)، کە لەلای ڕۆژهەڵاتەوە بەسەر ڕێگەکەدا زاڵەو هەروەها شوێنی فەیدێش بە جێگیرکردنی باڵەکانی شوێنەکە لە چیای دهۆك (چیای کەرێژاڵ)و پێچاوپێچەکانی ڕووباری دیجلە.

ـ شوێنی گردکردنەوەی هێزەکانو نیشانەکان:

ا ـ لایەنی عێراق:

* شوێنی گردکردنەوەی هێزەکان: موسڵ ـ دهۆك هێزەکانی پێشەوەش لەزاخۆو ئامێدی.

* نیشانەکان: بریتییە لە سوپایەکی تورکی، هەنگاوی یەکەم جزیرەو هەنگاوی دووەم دیاربەکر.

ب ـ لایەنی تورکی:

* شوێنی گردکردنەوەی هێزەکان: دیاربەکرو هێزەکانی پێشەوەش لە جزیرەو هەکاری (جولەمێرگ).

* نیشــانەکان: ســوپای عێــراق نیشــانە ســتراتیجییەکانی پێشــەوە، زاخــۆو هەنگاوەکانی، دووەمیش موسڵ، ئینجا کـەرکوك کـە نیشـانێکی سـتراتیجیی گرنگە.

٢ـ دیاربەکر ـ نسیبین ـ تەل کوچك ـ موسڵ.

ئەو ڕێگایە بە خاکی سوریادا دەڕوا، بۆیە ئـەو لایەنـەی نەیـەوێ پـەلاماری سوریا بدا، ناتوانێ بەکاری بێنێ.

ـ ڕێگەکە بەناوچەیەکی گردۆڵکەییدا دەڕوات، کـە یارمـەتی بـەکارهێنانی (ئالیات)و جەنگی زرێی دەدات و لایەنی عێراقیش هیچ کۆسپێکی گرنگی نییـە تا بۆ بەرگریکردن سودی لێ ببینێ، جگـە لـە چـیای شـەنگال کـە دەشـێ وەك شوێنێکی پەراوێزی بەرامبەر سوپای باکوور بـەکاری بێنـێ، هـەروەها لـەنزیك موسڵیش هەندێ گردۆڵکە هەن کە بە گردۆڵکەکانی عەتشان ناسراوەن و دەکـرێ وەك شـوێنی بـەرگریکردن بـەکار بهێنـرێن و باڵـەکانی ئـەو شـوێنە لەشـوێنی پێچکردنەوەی دیجلە جێگیر بکرێن.

شوێنی گردکردنەوەی هێزەکان و نیشانەکان:

ا ـ لایەنی عێراق:

* شوێنی گردکردنەوەی هێزەکان: موسڵ هێزەکانی پێشەوەش لە شنگار.

ب ـ لایەنی تورکی:

* شوێنی گردکردنەوەی هێزەکان: دیاربەکرو هێزەکانی پێشەوەش لـە مـاردین و جزیرە.

* نیشانەکان: سوپایی عێراق ئینجا موسڵ وەك نیشانێکی ستراتجیی گرنگ.

ج ـ ڕێگەی موسڵ ـ عەین زالە شلە گییـە ـ جزیـرە کـە هاوڕێکـە لەگـەڵ دیجلە بە ڕێگایەکی ناسەرەکی دادەنرێ کە هێزە تورکییـەکان دەتـوانن ڕەتڵێکـی لاوەکی پێدا بنێرن، تا بتوانن بەرگری عێراق پەرەوازە بکـەن و یارمـەتیی ڕەتڵـە سەرەکییەکە بدەن، کە لەسەر تەوەرەی دیاربەکر ـ تەل کوچك ـ موسڵ پێشـڕەوی دەکات.

## سێیەم: تەوەرە ستراتیجییەکانی عێراق ـ سوریا

اـ هێڵی سنور لە گوندی خانکی ژێری بەرامبەر فیشخاپور لە کەناری راستی رووباری دیجلەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە چەند میلێك لە خوار چیای تنفەوە کە لەوێ سنووری عێراق ـ سوریا ـ ئوردون بەیەك دەگەنەوە. درێژی سنوری عێراق ـ سوریا ٦١٨ کیلۆ مەترە.

- سێیەکی باکووری سنوری عێراق ـ سوریا بە خاکی کوردستانی عێراقدا دەڕوات، بۆیە ئێمەش باسی ئەو تەوەرانە دەکەین کە بەو بەشەی سنوردا تێدەپەڕێ.
- بەشی هەرە زۆری زەوییەکانی ئەم ساحەیە، دەشتاییو بە دەرەوەیەو هیچ کۆسپێکی سروشتیی گرنگی تێدا نییە.
- ئاو هەوای ئەو ساحەیە لە ئاوو هەوای ناوچەی بیابان دەچێ، بۆیە جۆری سروشتیی جموجۆڵ لەو ناوچانەدا شەکڵی جەنگی بیابانی پێوە دەبێ.

ئەو ساحەیە عێراق لە رێگای سوریاوە، بە ئیسرائیل دەبەستێتەوە، چونکە ئەو تەوەرانەی عێراق بە سوریا دەبەستنەوە، دەچێتە سەر نیشانە ستراتیجییەکانی ئیسرائیل.

- بایەخی ئەو ساحەیە ئەوکاتە دەردەکەوێ کە هێزەکانی باکوور بۆ گرتنی سوریا دێن، ئەوکاتە ئەو ساحەیە دەبێتە ساحەیەکی هاوبەش بۆ سوریاو عێراق کە دژی تورکیا بجەنگن.
- ئەو ساحەیە تەواوکەری ساحەی عێراقی ـ تورکییەو زەویەکانی کراوەیەو هێزەکانی تورکیا دوای گرتنی حەڵەب، کە گرێی هاتوچۆی باکووری سوریایە، دەتوانن بە ئاسانی لەسەر تەوەرەی حەڵەب ـ دیر الزور ـ موسڵ پێشڕەوی بکەن تا لەو ئاقارەوە ساحەی سنوری باکووری عێراق بخەنە مەترسییەوە.

ب ـ تەوەرەکانی جموجۆڵو نیشانی ستراتیجییەکان:

١ـ تەوەرەی موسڵ ـ حەڵەب کە ئەو تەوەرە گرنگترین تەوەرەی ساحەی عێراق ـ سوریایە، چونکە گرنگترین نیشانی ستراتیجیی بەیەکەوە دەبەستێتەوە، کە هەردوولا دەیانەوێ بیگرن، کە موسڵو حەڵەبە ( گرێی هاتوچۆی باکووری عێراقو گرێی هاتوچۆی باکووری سوریا ) چونکە هەموو ئەو رێگاو بانانەی بۆ

باکوورو باشووری سوریا دەچێ ( بەهێڵی ئاسنینیشەوە) بە هێڵە گرنگەکانی جموجۆڵی سەربازییەوە دەبەستێتەوە، کە بەرەو تورکیا دەچێ، هەروەها موسڵو حەڵەب بە چەند تەوەرێکەوە بەیەکەوە بەستراونەتەوە:

- تەوەرەی موسڵ ـ تەلەعفەر ـ بەدیع ـ دیر الزور ـ حەڵەب کە درێژییەکەی ٣٢٣میلە.
- تەوەرەی موسڵ ـ تەلەعفەر ـ شنگار ـ حەسەکە ـ شەددادی ـ دیر الزور ـ حەڵەب کە درێژییەکەی ٢٠٠میلەو شنگاریش قیرتاوە .
- تەوەرەی موسڵ ـ تەل کوچك ـ قامیشلی ـ حەڵەب، درێژی رێگەکە تا قامیشلی ١١٨ میلە.

٢ـ تەوەرەی بەغدا ـ فەلوجە ـ روتبە ـ دیمەشق.

٣ـ تەوەرەی بەغدا ـ رمادی ـ البوکمال ـ دیر الزور ـ دیمەشق.

ئەو دوو تەوەرانەی دوای پەیوەندیان بە باسەکەمانەوە نییە.

### ٢ـ٢ـ٣ : تەوەرەکانی ناوەوە

ئەگەر دارشتنی تەوەرە ستراتیجییەکانی بەرگریکردن لە عێراق لەسەر بنچینەی مەترسییەکانی دەرەوەبێ، ئەوا دارشتنی تەوەرەکانی ناوەوە لەسەر بنچینەی مەترسی کوردە لەسەر پاشەرۆژی عێراقو یەکێتی خاکەکەی!

عێراق تەوەرەکانی ناوەوەی بەشێوەیەك دارشتووە کە:

- هەموو ناوچە گرنگە ستراتیجیو ئابوورییەکان لە ناوچەی ئۆتۆنۆمی دابڕێ.
- ئەگەر هەلومەرجێکی وا بۆ ئەو بەشەی ئێستای کوردستانی ئۆتۆنۆمیدار هەلکەوت کە جیا بێتەوە لە عێراقو دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێکەوە بنێ، ئەوا مەترسییەکی جددی نەخاتە سەر عێراقو شوێنە ستراتیجییە گرنگەکانی هەر بە دەستەوەبێت.
- ئەو تەوەرانە وا دارێژراون کە قولایی ستراتیجیو جوگرافی بۆ کەرکوكو موسڵ دروست بکەن، بە شێوەیەکی ئەوتۆ ئەو شارانە بکەونە ناوەراستی پارێزگاکەوە، ئەمەش بە گۆڕینی ئیدارەی ناوچەکانی کوردستانو راگواستنو بە عەرەبکردنیان.

- دامەزراوە پەترۆڵی‌و شوێنە گرنگە ستراتیجییەکان لە زەبری هێزی پێشمەرگەی کوردستان بپارێزێ، بە جۆرێ کە چەکی پێشمەرگە نەگاتە ئەو دامەزراوەو شوێنە گرنگانە.

هەر بۆیە دارشتنی تەوەرەکانی ناوەوە روو لە پاراستنی دوو شوێنی ستراتیجییە:

١- کەرکوک‌و چاڵە نەوتەکان.

٢- موسڵ

### ا - تەوەرە ستراتیجییەکانی پاراستنی شاری کەرکوک:

ا - تەوەرەی یەکەم بریتییە لە زنجیرە چیاکانی سنوری رۆژهەڵاتی عێراق کە دەکەوێتە پارێزگای دیالە، سلێمانی، هەولێرو بەشێوەیەکی بنچینەیی بۆ چیای بەمۆ.

ب - تەوەرەی دووەم کە تەوەرەیەکی بنچینەییە، بریتییە لە زنجیرە چیای سەرگرمە تا دەربەندیخان‌و رووباری سیروان.

ج - تەوەرەی سێیەم بریتییە لە چیای کانی دومەڵان‌و گردۆلکەکانی بەینی کەرکوک‌و چەمچەماڵ (ناوچەی شوان) تا شاخی تاشداخ.

پاش ئەوەی هێزی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان توانی لە ١٠ی تشرینی دووەمی ١٩٨٦ گشت دامەزراوە پەترۆڵییەکانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوک بخاتەبەر زەبری چەکە قورس‌و نیوە قورسەکانی، بە جۆرێ دامەزراوە پەترۆڵییەکانی زەمبورو جەبەل بۆر بەتەواوی خاپور کران‌و زیانی قورس‌و کاریگەریش بەر دامەزراوەکانی باباگوڕگوڕو کەرکوک کەوت، رژێم دەستی کرد بە دروستکردنی پێشینەیەکی ئەمنی بە دەوری کەرکوک‌و چاڵە نەوتییەکانیداو تەوەرێکی تری دارشت بۆ پارێزگاریکردنی ئەم ناوچە گرنگە.

* بەر لەو زەبرە کاریگەرە، رژێم تەوەرەکانی ئەو ناوچەیەی بەشێوەیەک دارشتبوو، کە چەکی پێشمەرگە نایگاتێ، لەبەرئەوەی چەکی هەرە کاریگەری پێشمەرگە ئاربیجی‌و بیکەیسی بوو، بۆیە هەموو ئەو شوێنانە بەقوڵایی دوو کیلۆمەتر رەبایەو سەربازگە بە دەوریا دانرابوون تا بیانپارێزن.

* ساڵی ١٩٨٧ قوڵایی تەوەرەی کەرکوک بووبە ٢٠ کیلۆمەترو درێژکرایەوە، ئەویش بەم جۆرە: لە گەڵۆزییەوە ناوچەی ساڵەیی سەرسکەو لەجادەی

کەرکوك ـ شوان لەناو سەرکەڵەوە بۆ گەڕە دێو پشتی باپیلانو جەڵتوکەو ئۆمەربەگو سوردێو لەخاسە پەڕیوەتەوە بەرەو دوجەیلەو چیمەنەکانو لەجادەی کەرکوك ـ سلێمانیش پەڕیوەتەوە دیوی جەباری تا دەوری جەبەل بۆر.

هەموو دانیشتوانی ئەو گوندە ئاگادار کراون کە دەبێ گوندەکانیان چۆڵ بکەن. ئەوەی بڕوات بۆ باشووری عێراق ۱۰هەزار دینارو ئەوەی بچێتە هەولێر ۳هەزار دیناری دەدرێتێ، ئەوانیش کە دەچنە سلێمانی، پارچە ئەرزیان دەدەنێ. بەجۆرە کۆمەڵە گوندێکی تری کوردستان کەوتۆتە بەرشاڵاوی ڕاگواستنو کۆچپێکردن.

## ۲ـ تەوەرە ستراتیجیەکانی پاراستنی شاری موسڵ:

اـ ئەو تەوەرانەی لەبەشی تەوەرەکانی دەرەوەدا باسیانکراوە.

ب ـ ناوچەی شێخان (تا ئەندازەیەکی کەمیش ئاکرێ).

ج ـ ڕۆژهەڵاتی دیجلە.

د ـ قەزای تلکیف.

هـ ـ قەزای حەمدانیە.

هەربۆیە عێراق گشت ئەو ناوچانەی لە سنووری ئۆتۆنۆمی دەرهاویشتووە کە وەکو ئەڵقەیەك دەوری شاری موسڵیان داوە.

## ۲ـ۲ـ٤: ئەو ناوچانەی بەهۆی تەوەرە ستراتیجییەکانەوە ڕاگوێزراون

ڕژێمی بەعس هەمیشە وا تەماشای گەلی کوردی کردووە کە خائینو نیشتیمان فرۆشەو دژی ئەمنو سەربەخۆیی عێراق کار دەکا، بۆیە هیچ کاتێ بڕواو متمانەی پێنەکردووە. نەیهێشتووە لەناوچە گرنگەکاندا بمێنێتەوەو ڕایگواستون. دیارە تەوەرە ستراتیجییەکان لەو شوێنە گرنگانەن، کە پاراستنی عێراقیان پێوە بەندە، بۆیە بەلای بەعسەوە ڕاگواستنی ئەو ناوچانە کارێکی نیشتمانیەو بۆ پارێزگاریکردنی عێراقو خاکەکەی کارێکی پێویستو بەجێیە. هەر لەم ڕوانگەیەوە، هەموو ناوچەکانی تەوەرە ستراتیجییەکان لەکوردستاندا ڕاگوێزراونو دانیشتوانەکەشیان زۆربەی پەرشو بڵاوو پەرەوازەی شارو گوندەکانی کوردستانو عێراق بوون، یا بۆ دەرەوەی عێراق تەسفیر کراون، هەروەها زۆربەی ئەو ناوچانەش تەعریب کراون.

١ـ ئەو ناوچانەی بەر راگواستن و کۆچپێکردن کەوتون بەهۆی تەوەرەی ستراتیجییەوە، بریتین لە:

*قەزاکانی خانەقین و[12] مەندەلی لە پارێزگای دیالە.

*قەزای بەدرە لە پارێزگای واست.

*قەزای شێخان، تلکێف، تەلەعفەر[2] و شنگار[3] لەپارێزگای نەینەوا.

---

[12]ـ خانەقین جیا لەوەی لەتەوەرەی ستراتیجیدایە، ناوچەیەکی نەوتاوی گرنگی کوردستانیشە.

٢ـ ناوچەی زمار (لەقەزای تەلەعفەر) نیوەی باشووری بەشی هەرە باکووری حەوزی رووباری دیجلە (لەسەرەتای هاتنە ناو عێراقەوەی) پێك دێنێ، لەرووی شێوەی زەوییەکانیەوە دەچێتە بەشی ناوچە گردۆلکەییەکانەوەو لە چەندین گردۆلکەی پەرش و بڵاو پێکهاتووە، کە بەرزاییەکانیان لە ٤٠٠م تێناپەڕێ.ئەم ناوچەیە لەگەڵ دەشتی سلێڤانیدا، کە نیوەی باکووری حەوزەکەیە، سنورێك لەنێوان ناوچە شاخاوییەکانی باکوور (چیای بێخێرو شاخەکانی زاخۆ)و ناوچەی جزیر لە باشوور پێکدێنێ .

بێجگە لەوەی ئەو ناوچەیە بەر تەوەرەی ستراتیجیی کەوتووەو بەم هۆیەوە راگوێزراوە، هەندێ هۆی گرنگی تریش هەیە لەپاڵ راگواستن و بە عەرەبکردنی ئەم ناوچەیە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

ـ ئەم ناوچەیە چەند چاڵگەیەکی نەوتی تێدایە لەوانە: چاڵگەی عەین زالەو بەتمە.

ـ ناوچەیەکی کشتوکاڵی گرنگەو بەشێوەیەکی بەرفراوان دانەوێڵەی لێدەکرێ .

ـ ئەم ناوچەیە دەکەوێتە رۆخەکانی باشووری کوردستان، بۆیە راگواستن و بە عەرەب کردنی ئەم ناوچەیەو دەشتی سلێڤانی، پاڵ پێوەنانی کوردەکان بەرەو چیاکان مسۆگەر دەکا کەرژێم مەبەستێتی لە پێناوی گەمارۆدانی بڵاو بوونەوەی کوردو سنور دانان لەبەردەم تەنینەوەی شۆڕش لە شارو ناوچە دەشتاییەکاندا.

ـ ناوچەکە لەگەڵ سوریا هاوسنورەو درێژبوونەوەی سروشتی جوگرافی ئیتنۆگرافیی ناوچەکانی کوردستانی سوریایە، بۆیە راگواستن و بەعەرەبکردنی ئەم ناوچەیە دەبێتە هۆی دابرینی کوردەکانی ئەم ناوچەیە لە کوردەکانی سوریا ( کە زۆربەیان هاو عەشیرەتن).

ـ راگواستن و بە عەرەبکردنی ناوچەکە دابرینی چیای شنگار مسۆگەر دەکا، کە ناوچەیەکی کورد نشینەو ئێزیدی و موسوڵمانی تێدایەو دەشێ بۆ جەنگی پارتیزانی و پێشمەرگانە سوودی لێوەربگیرێ، بە تایبەت لە کاتێکدا کە پەیوەندی بە ناوچەکانی ترەوە هەبێ.

[3] ـ هەرچەندە ئەم ناوچەیە بەهۆی تەوەرەی ستراتیجییەوە راگوێزراوە، بەڵام هەندێ هۆی گرنگی تریش لە پشت راگواستنی ئەم ناوچانەن:

ـ ناوچەی نەوتی لێ دۆزراوەتەوە.

ـ یۆرانیۆم ، کە کانزایەکی ستراتیجییە لە ناوچەکەدا دۆزراوەتەوە.

ـ ناوچەکە لەگەڵ کوردستانی سوریا هاوسنورە، بۆئەوەی بە تەواوەتی کوردستانی عێراق لەو بەشەی کوردستانی سوریاو کوردەکانی ئەو ناوچەیەش لە کوردەکانی سوریا دابڕێت و بیکاتە ناوچەیەکی عەرەبنشین.

ـ ئەو ناوچانەی چیای شنگاری تێدایە کە بە کەڵکی جەنگی پێشمەرگانە دێت، هەروەك دوا رۆخی باشووری سنووری کوردستانە.

بەشێك لەقەزای زاخۆو قەزای سمێل لەپارێزگای دهۆك.

* بەشێك لەقەزای دوزی سەر بە پارێزگای کەرکوك.

٢ـ ژمارەی ئەو گوندانەی کە بەر راگواستن کەوتونو لێرە کۆکراونەتەوە ٥٩٣ گوندە کە ناوی ٥٨٣یان زانراوەو زانیاری تەواویش لەسەر ٣٢٠ گوندیان کۆکراوەتەوە کە ژمارەی خێزانەکانی دەکاتە (٢٢٥٢٩) خێزان.

قەزاکانی مەندەلی، بەدرە بەشێك لە قەزای خانەقین، بەشێك لە قەزای کەرکوك، قەزای شنگارو بەشێك لە قەزاکانی شێخانو تلکێف، نەتوانراوە زانیاریان لەسەر کۆبکرێتەوە.

٣ـ ئەو گوندانەی بەهۆی تەوەرەی ستراتیجییەوە راگوێزراون:

* هی قەزاکانی بەدرە، مەندەلی، خانەقین زۆربەیان تەسفیر کراون بۆ ئێران یا بەشارو گوندەکانی باشووری عێراقدا بڵاوکراونەتەوە، هەندێکیش لەهی قەزای خانەقین لە ئۆردوگاکانی قەزاکانی: سلێمانی، دەربەندیخان، کەلار جێگیربوون.

* هی ناحیەی پردێ سەر بەقەزای دوبز لەو ئۆردوگایانەدا کۆکراونەتەوە: گەڵۆزی، گورزەیی، بیبانی، یارجە، کەلور.

* هی دەشتی سلێڤانی، قەزای سمێلو زمار پەرشو بڵاون.

* هی شێخان لە ئۆردوگاکانی: جسری مەندان، مەهت،...و هەندێکیشیان پەرشو بڵاون.

* هی شنگاریش لە ئۆردوگاکانی: تەل قەسەب،...وهتد.

نەخشەی ژمارە (٣)

ئەو ناوچانەی لە پارێزگای دیالەدا بەهۆی تەوەرە ستراتیجییەکانەوە ڕاگوێزراون



## نەخشەی ژمارە (٤)

## ئەو ناوچانەی لە پارێزگای واسط دا بەهۆی تەوەرە ستراتیجییەکانەوە راگوێزراون

سنووری دەولی
سنووری پارێزگا
سنووری ناوچەی ڕاگوێزراو
ناوچەی ڕاگوێزراو

باکور
پارێزگای بەغدا
پارێزگای دیالە
پارێزگای بابل
دیجلە
ئێران
کوت
پارێزگای میسان
پارێزگای قادسیە
پارێزگای زی قار

**نەخشەی ژمارە (٥)**

**ئەو ناوچانەی لە پارێزگای میساندا بەهۆی تەوەرە ستراتیجییەکانەوە ڕاگوێزراون**



نەخشەی ژمارە ( ٦ )

ئەو ناوچانەی لە پارێزگای دهۆک دا بەهۆی تەوەرە ستراتیجییەکانەوە ڕاگوێزراون



## نەخشەی ژمارە (٧)

## ئەو ناوچانەی لە پارێزگای نەینەوادا بەهۆی تەوەرە ستراتیجییەکانەوە ڕاگوێزراون



نەخشەی ژمارە ( ٨ )

نەو ناوچانەی لە پارێزگای کەرکوک دا بەهۆی تەومرە ستراتیجییەکانەوە راگوێزراون



# فەسلی سێیەم

# ڕاگواستنی ناوچە (نەوت)ییەکان

## ٢-٣-١: ناوچە (نەوت)ییەکانی کوردستانی عێراق

کوردستانی عێراق یەکێکە لەو ناوچە هەرە گرنگانەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کە خاوەنی نەوتێکی ئێجگار زۆرو زەبەندە، هەر بۆیە لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە جێی سەرنج و چاوتێبڕینی چلێسانەی ولاتە ئیمپریالیستەکان و بەتایبەتی بەریتانیا هەولێکی لەڕادە بەدەرو بێ ئەندازەیدا تا کوردستانی باشوور بەعێراقی عەرەبەوە بلکێنێ، تا لەلایەکەوە بتوانێ بەرژەوەندیە پەترۆلیەکانی لەناوچەکەدا بپارێزێ، لەلایەکی تریشەوە ڕێگای هاتوچۆی بۆ مسۆگەر بکات لەڕێگەی کەنداوەوە. حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقیش هەر لەسالی ١٩٢٥وە تەقەلایەکی بێ سنوریان داوە تا ئەو سیاسەتەو هێلە گشتیەکانی زیتر بچەسپێنن و بەشێوەیەك کورد لەقالب بدەن، کە مەبەستەکانیان لەدزین و تالانکردنی نەوتی کوردستان بەئاسانترین شێوە بهێنێتەدی، دیارە ڕژێمی بەعس پتر لەهەر ڕژێمێکی تری عێراق بەشێوەیەکی جددیتر، قولتر وردبینانەتر، بەلام شۆڤێنیانەتر بۆ ئەم مەسەلەیە چووەو هەولی ئەوەشی داوە کە بەتەواوی کورد لەناوچە (نەوت)ییەکانی کوردستان ڕاگوێزێ و دووریان بخاتەوە، بەنیازی ئەوەی ((مەترسیی کورد)) لەسەر پاشەڕۆژی عێراق کەم بکاتەوە یا نەهێلێ. جا لەبەر ئەوەی زۆربەی هەرە زۆری ناوچە (نەوت)ییەکانی کوردستان بەر سیاسەتی ڕاگواستن و کۆچ پێکردنی زۆرەملێ کەوتون، بەپێویستی دەزانین بەر لەوەی باسی

ئەو گوندو لادێیانە بکەین، کە ڕاگوێزراون، ناوچە (نەوت)ییەکانی کوردستان دەست نیشانو دیاری بکەین: دەشێ ئەو ناوچانەی چالگە[1] ی نەوتیان تێدایە، بکەینە سێ بەشەوە:

یەکەم: ئەو چالگانەی دۆزراونەتەوەو نەوتیان لێ دەردەهێنرێ (منتج).
دووەم: ئەو چالگانەی دۆزراونەتەوە بەڵام تا ئێستا نەوتیان لێ دەرنەهێنراوە (ئیستکشافی).
سێیەم: ئەو ناوچانەی نەوتیان هەیە، بەڵام تا ئێستا دەستی دۆزینەوەی نەگەیشتۆتێ (لم یتم استکشافها بعد).

## یەکەم: ئەو چالگانەی دۆزراونەتەوەو نەوتیان لێ دەدەهێنرێ:

١- چالگەی کەرکوك: درێژترینو گەورەترین چالگەی نەوتی جیهانە... لەقوبەکانی بابا- سارەلو – سەربەشاخ پێك دێو لەناوچەی جەبەل بۆرەوە تا ناوچەی دیبەگە درێژ دەبێتەوە.
تێکڕای چینی بەرهەمهێن: ٣٠٠ پێو لەقوڵایی ٣١٠-٣٧٠ مەترەو لەدوای نەوتی باکۆو تکساس سێیەمین جۆری نەوتی جیهانە.
ساڵی ١٩٨٦ چینێکی تر لەژێر ئەم چینەدا دۆزراوەتەوە کە قوڵیەکەی نزیکەی ١٣٥٠ مەترە (جۆرێکی خراپترە). بەدرێژایی ئەم چالگەیە ٨ ئیستگەی جیاکردنەوەی غاز (Degasing) هەیە بەمەبەستی ناردنی بۆ ئیستگەی سەرەکی چڕکردنەوە. ئەم چالگەیە لەتوانایدا هەیە ڕۆژانە ٢,١٠٠،٠٠٠ بەرمیل بهێنێتە بەرهەم بەبێ ئەوەی کار لەچالگەکە بکا.
ئەم چالگەیە ٢٢٢ چاڵە نەوتی تێدایە کە بەم شێوەیە دابەش بوون:

---

[1]- وشەی چالگە (چاڵ + پاشگری گە) لەسەر پێودانگی شینگە، شەڕگە... داڕێژراوە لەجیاتی ووشەی (حقل)ی عەرەبیو (Field)ی ئینگلیزی، چونکە بەکارهێنانی چاڵە نەوت یا بیر لەجیاتی (حقل) هەڵەیە، چونکە (حقل) ڕەنگە زیاتر لەچاڵێکی تێدابێ. هەروەك بەکارهێنانی کێڵگەش هەر هەڵەیە، چونکە کێڵگە ئەو شوێنە دەگرێتەوە کە دەغڵو دانی لێ دەکرێ. بۆیە ئێمە رامان بەڕاستتر زانی کە ئەم وشەیە بەکار بێنین تا وشەیەکی شیاوتری بۆ دەدۆزرێتەوە.

* ناوچەی بابەگوڕگوڕ ٥٤ چاڵ
* ناوچەی جەبەل بۆر ٢٢ چاڵ
* ناوچەی هەنجیرە ٣٢ چاڵ
* ناوچەی قوتان ٣٨ چاڵ
* ناوچەی قوشقایە ٢٤ چاڵ
* ناوچەی ئاڤانە ١٨ چاڵ
* ناوچەی سارەلو ١٤ چاڵ
* ناوچەی سەربەشاخ ٢٠ چاڵ

لەگەڵ ١٤ چاڵ لەناوچەی عەمشە کە تەنها بیری ئاون.
پەستان: ٧١٥ ئەتمۆسفیر.

١. چاڵگەی زەمبور: لەبەرامبەر گونـدی بەعـەرەبکراوی عـەلی دەحامـەوە درێژ دەبێتەوە تا بازگەی ئێستای کەرکوك – بەغدا.
ژمارەی چاڵەکان: ٧٠
ژمارەی ئیسگەکانی جیاکردنەوەی غاز: ٢
پلەی پەستان: نزمترین: ٢٠٨٠ بەرزترین: ٣٢٨٠ ئەتمۆسفیر.

٢. چاڵگەی بای حەسەن: لەناوچەی سلێمان بەخشیانەوە تـا گونـدی بـای حەسەن لەنزیك زێی بچوك درێژ دەبێتەوە.
ژمارەی چاڵەکان: ٧٢ بەم شێوەیە دابەش بووە:
* بای حەسەن: ٣٢ چاڵ
* شناغەو داود گورگە: ٤٠ چاڵ
پەستان: ١٧٣٠ ئەتمۆسفیر.

٣. چاڵگەی خوبـازە: لەناوچـەی خوبـازە، (١٢) چـاڵی تێدایـە کـە بـەم زوانـە بەئیسـتگەکانی بـای حەسـەنەوە دەبەسـترێنەوە. درێـژیی چـاڵگەکە ٤ کـمو پانیەکەی ٢ کیلۆمەترە.

٤. چاڵگەی نەفتخانە: چاڵگەیەکی کۆنە، لەکاتی جەنگی عێراق ـ ئێراندا بەرهەمی نەبو.
بەر لەجەنگ بەرهەمی ڕۆژانەی ۷۰،۰۰۰ بەرمیل بوو.
ژمارەی چاڵەکان: ۳۷ چاڵ.
چاڵگەیەکی هاوبەشە لەگەڵ ئێراندا (نەفتشا).
٥. چاڵگەی بەتمە: (نزیك عەین زالە). لەساڵی ۱۹۸۰وە نەوتەکەی بەرەو بڕان چووە.
ژمارەی چاڵەکان: ۱۸ چاڵ. چاڵگەیەکی تریان دۆزیوەتەوە کە لەیەکەم قوڵترە.
٦. چاڵگەی عەین زالە: ساڵی ۱۹۹۰ کارگەکانی سەر ئەم چاڵگەیان لابرد، بەهۆی نەمانی نەوت تیایدا، بەڵام چاڵگەیەکی گەورە لەژێر هەمان چاڵگەدا دۆزراوەتەوە.
ژمارەی چاڵ: ۲۲ چاڵ
۷. چاڵگەی سفەییە: دەکەوێتە نزیك ناحیەی مەحمودیە بەرامبەر سنوری سوریا. چاڵگەیەکی هاوبەشە لەگەڵ سوریادا (دەکەوێتە هەر دوو بەشی کوردستانی عێراق‌و کوردستانی سوریاوە).
ژمارەی چاڵ: ۲٤ چاڵ، ئێستا لەرێگەی عەین زالەوە بەهێڵی عێراقی ـ تورکیەوە بەستراوە.

## دووەم: ئەو چاڵگانەی دۆزراوەنەتەوە، بەڵام تا ئێستا نەوتیان لێ دەرهێنراوە.

۱. چاڵگەی گوێر: لەناوچەی گوێر.
۲. چاڵگەی قەرەچوغ: لەشاخی قەرەچوغ. درێژبونەوەی چاڵگەکە بەئاراستەی درێژبوونەوەی شاخەکەیە، بەرهەمی ڕۆژانەی هەر چاڵێك ۷۰۰۰ بەرمیلە.
۳. چاڵگەی مەخمور: ئەو چاڵگەیە هەموو دەشتی مەخمور دەگرێتەوە، کە بەرامبەر شاخی قەرەچوغە.
٤. چاڵگەی جدیدە: ناوچەی گوندی جدیدە لەباشوری داقوق.
درێژبوونەوەی چاڵگەکە: درێژیەکەی ٦,٥ کم‌و پانیەکەی نزیکەی ۲ کم.
٥. چاڵگەی ئینجانە: دەکەوێتە سەر جادەی کەرکوك ـ بەغدا پێش ئەوەی لەسەیتەری ئێستای حەمرین بچێتە خوارەوە.

٦. چاڵگەی گلاباب: لەناوچەی گلاباب، ٣ چاڵی لێ دۆزراوەتەوە.
پەستان: زۆر بەرزە: ٥٧٦٠ ئەتمۆسفیر.
٧. چاڵگەی کۆرومور: لەناوچەی قادر کەرەم.
٨. چاڵگەی بەلکانە: زەنجیرەی ئەو چیایەی لەشاری کفریەوە درێژدەبێتەوە تا ماوەی نزیکەی ١٢ کم.
٩. چاڵگەی گومار: لەناحیەی کۆکزەوە لەسەر چۆمی سیروانتا گوندی تلیشان درێژ دەبێتەوە (زنجیرەی ئەو گردۆلکانەی سەرو ناوچەکە).
ژمارەی چاڵەکان: ١ چاڵ.
پەستان: نزیکەی ٤٦٥٠ ئەتمۆسفیر.
بەرهەمی مەزەندە: ٣٥٠٠ بەرمیل / رۆژ بۆ هەر چاڵێك.
١٠. چاڵگەی منصوریە الجبل: دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای شارەبانو تا ئێستا چاڵێك دۆزراوەتەوە.
پەستان: نزیکەی ٤٦٥٠ ئەتمۆسفیر.
بەرهەمی مەزەندە: ٣٠٠٠ بەرمیل / رۆژ بۆ هەر چاڵێك.
١١. چاڵگەی ناودۆمان: دەکەوێتە ناوچەی ناودۆمان لەباشووری لەشاری خانەقینەوە.
چاڵگەیەکی زۆر دەوڵەمەندە لەرووی چۆنایەتیی نەوتەکەیەوە.
ژمارەی چاڵەکان: ٣ چاڵ.
پەستان: ٨١٥٠ ئەتمۆسفیر (زۆر بەرزە).
١٢. چاڵگەی تل الغزال: راستەوخۆ دەکەوێتە خوار چاڵگەی ناودۆمانەوە.
١٣. چاڵگەی دارە خورما: دەکەوێتە نزیك ناحیەی مەیدان لەنزیك سنووری ئێران.
پەستان: بەرزترین پەستان لەجیهاندا ١٣٨٦٠ ئەتموسفیر.
١٤. چاڵگەی چەمچەماڵ: دەکەوێتە رۆژهەلاتی شاری چەمچەماڵەوە... سێیەم جۆری نەوتە لەجیهاندا. تا ئێستا بەکار نەهێنراوە.
١٥. چاڵگەی شنگار: دەکەوێتە دەشتی شنگارەوە، لەخوار ئۆردوگا نوێکەوە باشترین جۆری نەوتە (ممتاز).
١٦. چاڵگەی شاخی قەند: دەکەوێتە ٨ کیلومەتری باشووری ئەلکیشەوە.
ژمارەی چاڵەکان: ١ چاڵ کە قوڵترین چاڵە لەعێراقدا.

١٧. چاڵگەی تەق تەق: چاڵگەیەکی زۆر گەورەیە، دەکەوێتە ناوچەی شیوە سوور بەدووریی ١٠کم لەرۆژئاوای باشووری شاری کۆیە. درێژی چاڵگەکە ٢٠کم و پانێکەشی ٧کم، باشترین جۆری نەوتە لەجیهاندا. ژمارەی چاڵەکان : ٣ چاڵ.

١٨. چاڵگەی حەمرین: دەکەوێتە زنجیرەی چیای حەمرین، لەسەر رێگای گشتی کەرکوک ـ تکریت.

ژمارەی چاڵەکان: ١٢ چاڵ، جۆرێکی باشە.

## سێیەم: ئەو ناوچانەی نەوتیان هەیە، بەڵام تا ئێستا دەستی دۆزینەوەی نەگەیشتۆتێ:

لەکوردستاندا گەڵێ ناوچەی تر هەیە کە نەوتی تێدایە، بەڵام تا ئێستا دەستی دۆزینەوەی نەگەیشتۆتێ، هەرچەندە ئەو ناوچانە هەمووی دیاری کراوە، هەر ئەوە ماوە شوێنی چاڵگەکان بدۆزنەوە:

١. ناوچەی ئاوەکەڵە لەقەرەداغ.

٢. ناوچەی دێلێژە لەقەرەداغ.

٣. ناوچەی شارەزوور.

٤. هاوینە هەواری سەلاحەددین.

٥. چیای ئاوەگرد لەنێوان کۆیەو شەقڵاوە.

٦. ناوچەی دوکان.

٧. ناوچەی ناحیەی مەیدان: ٣ چاڵگەی تێدایە.

٨. ناوچەی ناحیەی قۆرەتو: ٣ چاڵگەی تێدایە، کە یەکێکیان لەقولە سوتاو ئەوەی تریان لەقۆرەتووە.

٩. ناوچەی ئاوە سپی.

١٠. شاکەل (لەکفری).

١١. سەرووی شاری خانەقین.

١٢. بێستانە (نێوان هەولێر ـ تەق تەق ـ پردێ) لەنزیك نیەگین و بەردەسپی.

١٣. بخرانی: دەستە راستی جادەی نێوان حەمدانیە ـ ئاکرێ.

١٤. ساسان لەسەری شنگار.

١٥. لەخوارووی تەلەعەفەرەوە.

١٦. جەسان لەقەزای بەدرە.

**چوارەم: کانزاکانی تر:**

بێجگە لەنەوت لەکوردستاندا گەلێ کانزای تر هەیە، کە هەندێ لەوانە کانزای ستراتیجین.

١.یۆرانیۆم: بەئەندازەیەکی زۆر لەناوچەی سەید سادق هەیە، کە دەکەوێتە سەر جادەی سەید سادق ـ ئەحمەد ئاوا. لەهەر تەنێکا ٣,٥غم یۆرانیۆم هەیە. هەروەها لەناوچەی شنگاریش هەیە. بەئەندازەیەکی کەمتریش لەشوێنی تر هەیە.

٢.ئاسن: ئاسن لەمیشیاو ( ناحیەی گەرمکی قەزای پێنجوین)هەیەو بەمەزندە ١٠ملیۆن تەن دەبێ.

٣.مەگنەتایت: لەشنگارو کۆیە هەیە.

٤.گۆگرد: لەحەمام جەلی/ کۆیە هەیە. هەروەها لەهەموو ئەو شوێنانەی نەوتی لێیە.

٥.مس، قورقوشمو زێو، بەبڕێکی زۆر لەناوچەی بارزان هەیە، کە بەملیۆنان تەن مەزەندە دەکرێن.

٦.چاوەکانی زێی گەورە (زێی بادینان) سوودەی هەیە، کە بەشی ٣/٤ی پێداویستیەکانی جیهان دەکا.

٧.هەروەها ئەلمینیۆم، مەنگەنیز، خەلۆزی بەردین... هتد لەشوێنەکانی تر هەیە.

### ٢-٣-٢: رۆڵی نەوت لەژیانی ئابووری، کۆمەڵایەتیو سیاسی گەلی کوردستاندا

نەوت یەکێکە لەو سامانە سروشتیانەی بایەخێکی ستراتیجیی گرنگی هەیە لەژیانی گەلانی جیهاندا، نەوت لەخاکی هەر دەوڵەتێك یا گەلێکدا بێ، چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرێ ئاستی ژیانی ئەو وڵاتە یا نەتەوەیە بەرەو سەر بباتو رۆڵی گرنگ لەپێشخستنو بەرەو پێشەوەبردنو پەرەپێدانی وڵاتدا وازی بکا، دەورێکی گرنگیشی هەبێت لەبەهێزکردنی ئەو وڵاتەدا، بەشێوەیەکی ئەوتۆ دوژمنانو ناحەزانی نەتوانن مەترسی لەسەر پەیدا بکەن، لەهەمان کاتیشدا نەوت یەکێکە لەو سامانە گرنگانەی دەبێتە جێی سەرنجو چاو تێبڕینی وڵاتانی

ترو گەلانیتر، هەمیشە هەوڵی لاوازکردن‌و پارچەپارچەکردنی ئەو نەتەوەیە دەدەن بۆ ئەوەی بتوانن بەئاسانی ئەو سامان‌و خێروبێرە هەڵلوشن‌و بەتالآنی بەرن.

ئەگەر گەلانی دنیا ئاواتەخوازی ئەوەن نەوتیان هەبێ بۆ ئـەوەی وڵاتەکـەیان بەرەو پێشەوە بەرن‌و پەرەی پێ بدەن تا لـەڕەوتی شارسـتانێتی دوا نەکـەون، بـۆ ئەوەی ئاستی ژیانی گەلەکەیانی پێ بەرز بکەنەوە، بۆ ئەوەی ژیانێکی ئاسـودەو بەختیار بنیات بنێن، ئەوا لەکوردستاندا بەپێچەوانەوەیە.

نەوت یەکێك بووە لەو هۆیانـە، بگـرە هۆیـەکی کاریگـەریش بـووە لـەوەی کوردستان پارچەپارچـە بکرێـت‌و گەلەکەشـی بەشـبەش، بـەریتانیا لـەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندیە پەترۆڵیەکانی خۆیدا، ئەو نەخشە شومەی جێبەجێ کـرد، کە تا ئێستاش بۆتە هۆی دواکەوتن‌و پاشـکەوتنی گـەلی کوردسـتان‌و نەتـەوەی کوردیشی تووشـی مەینـەتی‌و چەرمەسـەریەکی بـێ ئەنـدازە کـردووە، کـە تـا ئێستاش لەژێر باری گرانیدا دەناڵێنێ.

حکومەتی یەك لەدوای یەکەکانی عێراقیش هەر لەسەردەمی هاشمیەکانەوە تا سەر بەعس، لەجیاتی ئەوەی نەوتی کوردستان لەپەرەپێدان‌و گەشە پێکـردن‌و بۆ پێشەوە بردنی وڵاتەکە خەرج بکەن، نەوتیان کردۆتە هۆیـەك بـۆ دواخسـتنی وڵات‌و بەکارهێنانی زەبرو زنگ‌و سەقامگیرنەکردنی.

پاشەکەوتی ئێستای نەوتی عێراق دەگاتە ٦٤ ملیارد تەن، بـەجۆرە، عێـراق لەدوای روسیاو عەرەبستانی سعودی دەبێتە سێەمین دەوڵەت لەرووی پاشەکەوتی نەوتەوە. لەسەدا ٦٤٪ی ئەو نەوتە لەکوردستاندایە لەکاتێکدا ناوەڕاستی عێراق ١٠٪و باشوری عێراق ٢٦٪ پاشەکەوتی نەوتی عێراق پێکدێنن.

### ا- رۆڵی نەوت لەژیانی ئابووری – کۆمەڵایەتی کوردستاندا

بایەخی نەوت لەهەر وڵاتێکدا بەشێوەیەکی بنەڕەتی بۆ دوو شت دەگەڕێتەوە:

* وەك هۆیەکی ڕووناکی‌و وزە.
* بۆ پەرەپێدانی وڵات.

بەپێی ئەو ئامارانەی لەبەر دەستدان زیاتر لە٩٩,٥٪ ی ئەو گوندانـەی بـەر راگواستن کەوتون، کارەبایان نەبووەو گوندەکانی ناو قوڵایی کوردسـتانیش زیـاتر لە٨٥٪ یان بێ بەشن لەڕووناکی کارەبا.

ئەو خشتەیەی خوارەوە ڕێژەی سەدیی بوونی خوێندگا، خەستەخانەو تیمارگە، ڕێگاوبان لەکوردستاندا نیشان دەدا، لەو ناوچە جیاجیایانەی ڕاگوێزراون:

خشتەی ژمارە (٣)

| جادەی قیرتاو لەچاو ڕێگاو بانەکان ٪ | ڕێگاوبان ٪ | نەخۆشخانە٪ | خوێندنگە٪ | ناوچە | جۆری ڕاگواستن |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣,٧٩ | ٤٢,٤٤ | ٦,٩٧ | ٢٩ | پارێزگای سلێمانی | سنووری |
| ١٠,٦٣ | ٣١,٧٥ | ٩,٤٦ | ٢٣,٦٤ | پارێزگای هەولێر | سنووری |
| ٧,٥٩ | ٣٨,٣٥ | ٢,٤٣ | ١٩,٤ | پارێزگای دهۆك | سنووری |
| ٥,٥ | ٣٩,٦٥ | ٦,٣٢ | ٢٥,٨٦ | ناوچەی ئۆتۆنۆمی | سنووری |
| ٤,٤٩ | ٩٥,٥ | ٥,٦٢ | ٢٦,٩٦ | پارێزگای دهۆك | تەوەری |
| ١٩,٤ | ٧٣,٣ | ٣,٨٨ | ٢٥ | قەزای خانەقین | ستراتیجی |
| ٢٥,٢٥ | ٩٩ | ٧,٤ | ٦٣ | هەولێر – کەرکوك - سەلاحەدین | جەنگی کوردستان |

ئەم خشتەیەی سەرەوە بەروونی ئەوە دەردەخا کە کوردستان چەند دواکەوتووە، نەك هەر لەڕووی پەرەپێدانی گشتیەوە، بەڵکو لەڕووی سادەترین پێداویستیەکانی ژیانی هاوچەرخ، کە بوونی خوێندنگەو خەستەخانەو ڕێگاوبانن.

نەخشەی پەرەپێدان لەعێراقدا لەسەر بنچینەیەك دادەڕێژرێ، کە ڕوو لەبێبەشکردنی کوردستانە لەهەموو پرۆژەیەکی پیشەسازی. کوردستان هیچ پرۆژەیەکی پیشەسازی گرنگی تیادا دانەمەزراوە، جگە لەچەند شتی سادەی لەجۆری شەکر، چیمەنتۆ، جگەرە، کە:

* ئەم پرۆژانە زەرەر دەکەن.

* ئەمانە شتی بچوكو بێ بایەخن لەمەسەلەی گەشەپێدانو پەرەپێدان وڵاتدا.

كوردستان وڵاتێكی كشتوكاڵیە، بەروبومی فرە جۆری هەیە: تووتن، گەنمو جۆ، برنج، پەموو، كونجی، میوەی فرە جۆر، بنێشتو كەتیرەو قەزوان... هتد، هەروەها بەرهەمی ئاژەڵی فرەچەشن لەجۆری: گۆشت، پەنیر، ماست، رۆن، پێستەو خوری، هەنگوینی زۆری هەیە. ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی گەلی كوردستان بەم بەروبومو بەرهەمانە بژیتو ئاستی گوزەرانیشی بەرەو سەر ببات، ئەگینا نەوت نەك هەر لەپەرەپێدانی وڵاتەكەیدا هیچ دەورێكی نەبووە، بگرە لەبوونی روناكیو سوتەمەنیشدا دەوری نەبووە، تا ئێستاش لەزۆربەی گوندەكانی كوردستاندا ئاوردۆ سەرچاوەی سوتەمەنیە، لەوڵاتێكدا كە لەسەر دەریای نەوتە. نەوت ئەگەر كاریگەریەكی هەبوو بێ لەسەر ژیانی ئابووری گەلی كوردستان، تەنها بەهۆی ئاوسانی دراوەوە هەیبووە. لەراستیدا نەوت لەبری ئەوەی لەگەشەپێدانو پێشكەوتنی پیشەسازیو كشتوكاڵو بازرگانیدا بەكار بهێنرێ، بۆتە هۆی:

١.پاشكەوتنی پیشەسازی بەهۆی مەترسیی رژێمەوە.

٢.پاشكەوتنی كشتوكاڵو ئاژڵداری، بەهۆی راگوێزرانی زۆرەملێی گوندەكانو بێبەشكردنی دانیشتوانەكەی لەبەكارهێنانو رەنێوهێنانی زەویەكانیان، كە ئەمانەش شوێنەواری خۆیان بەسەر باری كۆمەڵایەتیدا بەجێ هێشتووە، وەك: نەخۆێندواری، نەخۆشی، دواكەوتنی كۆمەڵایەتی...

## ب- رۆڵی نەوت لەژیانی سیاسی كوردستاندا

ئەو رۆڵەی نەوت لەژیانی سیاسی كوردستاندا وازی كردووە، بەو ئەندازەیە لەژیانی ئابووری كوردستاندا وازی نەكردووە.

- نەوت بۆتە هۆی ئەوەی جەنگێكی نارەوای درێژخایەن دژی گەلی كوردستان بەرپا بكرێ.
- نەوت بۆتە هۆی ئەوەی بەعس بتوانێ سیاسەتی تەرحیل، تەعریبو تەبعیس دژی گەلی كوردستان جێبەجێ بكاتو سەدان گوندیش بەعەرەب بكا، واتە: ئەو داهاتە زۆرەی نەوت لەكاول كردنی كوردستاندا خەرج كراوە.

- نەوت بۆتە هۆی ئەوەی عێراق بتوانێ هێزێکی سوپایی گەورەی پێکەوە بنێ‌و بەنوێترین‌و کاولکەرترین چەك پڕ چەکی بکـا، بەسـەدان فڕۆکـەی جـەنگی‌و هەزاران تانك‌و زرێپۆش بکڕێ‌و شـارەکانی کوردسـتانی پـێ بۆمبـاران بکـا، لەخۆی باغر ببێ‌و بەلوت بەرزیەوە تەماشای داوا ڕەواکانی گەلی کـورد بکـاو تەنها وەڵامی سەرکوتکردنی ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد بێ.
- نەوت بۆتە هۆی ئەوەی عێراق بتوانێ دەیان دامودەزگای جاسوسی‌و تۆقاندن‌و داپڵۆسین دابمەزرێنێ‌و بیانخاتە ویزەی شۆڕشگێرانی کوردستان‌و عێراقەوە.
- ئەگەر نەوت نەبوایە، نەیدەتوانی جەنگێکی درێژ خایەن دژی دەوڵەتی ئێـران هەڵبگیرسێنێ‌و کەللەی سەدان هەزار کەس لەڕۆڵەکانی هەردوو وڵات بهاڕێ.
- نەوت بۆتە هۆی ئەوەی دەیان کەس بکاتە جاش‌و بەگژ گەلی کوردیاندا بکـا، تا جەنگی کوردستان بکوردێنێ.
- نەوت بۆتە هۆی ئەوەی چەندین ناوچـەی کوردنشـین لەکوردسـتان دابڕێـت‌و بیخاتە سەر حکومەتی مەرکەزی.

### ۲-۳-۳: ئەو ناوچانەی بەهۆی نەوتەوە ڕاگوێزراون

هۆکانی ڕاگواستنی ناوچە (نەوت)ییـەکانی کوردسـتان لـەدوو سەرچـاوەوە بناوان هەڵدەگرێن.

یەکێکیان: بێبەشکردنی کوردە لەو سـامانەی هەیـەتی، تـاکو بنکەیـەکی ئابووری بەهێزی نەبێ، زەمینەی جیابوونەوەی کوردستانی عێراق ساز بکا، واتـە بەمەبەستی دوور خستنەوەی مەترسیی کوردە لەسەر پاشەڕۆژی یـەکێتی خـاکی عێراق.

دووەمیـان: بـەتاڵانبردنی ئـەو سـامانەیە بـۆ جێبـەجێکردنی نەخشـە ستراتیجیەکانی خۆیان لەکوردستان‌و لەناوچەکەدا.

۱. ئەو ناوچانەی بەهۆی نەوتەوە بەر ڕاگواستن کەوتون:

* قەزای کەرکوك‌و قەزای دوبز لەپارێزگای تەئمیم.
* قەزای کۆیە لەپارێزگای هەولێر.

۲. ژمارەی ئەو گوندانەی بەر ڕاگواستن کـەوتون، ۷۱ گونـدن، کـە تـەنها زانیـاری دەربـارەی ٥٥ گونـدیان کۆکراوەتـەوە، کـە ژمـارەی خێزانـەکانیان دەکاتە:٢٦٥٨ خێزان.

٣. دانیشتوانی ئەو گوندانە هەر هەمووی پەرش‌و بڵاو بوون.
٤. گوندەکانی سنووری قەزای دوبز لەساڵی ١٩٦٣دا بەر شاڵاوی ڕاگواستن‌و بەعەرەبکردن کەوتون. بۆ جـاری دووەمـیش لەسـاڵانی ١٩٧٤-١٩٧٦دا دووبـارە ڕاگوێزراونەتەوەو ناوچەکەشیان بەعەرەب کراوە.
لەکاتێکا گوندەکانی قەزای کۆیە لەساڵی ١٩٨٠ دا ڕاگوێزراون.

**نەخشەی ژمارە (١١)**

**ناوچە (نەوت)ییە ڕاگوێزراوەکانی پارێزگای هەولێر**



# فەسڵی چوارەم

# ڕاگواستنی ناوچە سنووریەکان

## ٢-٤-١: هۆکانی ڕاگواستنی ناوچە سنووریەکان

نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ی شۆڕشی کوردستان دەرفەتێکی لەباری بۆ دەسەڵاتدارانی بەعس ڕەخساند تا نەخشەو پلانە ستراتیجیەکانی خۆیان لەمەڕ کوردستان بەکردەوە ئەنجام بدەن. هەر بۆیە بەپەلە کەوتنە جێبەجێ کردنی نەخشەکەو ئیمکانیاتێکی سوپاییو دارایی زۆریشیان تەرخان کرد، تا ناوچە سنوریەکانی عێراق ـ ئێران، عێراق ـ تورکیا، عێراق ـ سوریا بە قوڵایی ١٠-٢٠ کم، بەناوی پشتێنەی ئەمنیەوە ڕاگوێزنو دانیشتوانەکەشی بخزێننە ئۆردوگا زۆرەملێکانەوە، کە بەعس ناوی ناوە (گوندی هاوچەرخ) ، ساڵاتی ١٩٧٥-١٩٧٨ دەیان هەزار خێزانی کورد لەو ئۆردوگایانەدا کۆکرانەوەو هەموو گوندو لادێکانی سەر سنوری کوردستانیش لەگەڵ خاکو خۆڵدا یەکسان کران.

دیارە گەلێ هۆی ستراتیجی، سوپاییو سیاسی لەڕەنگ ڕشتنی ئەم پلانەو ڕاگواستنی گوندو لادێکانی سەر سنووردا دەوریان هەبووە، کە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

أ - کاربەدەستە سیاسیو سوپایەکانی عێراق بەگشتیو هی بەعس بەتایبەتی، لەوەتەی دەوڵەتی عێراق دامەزراوە هەمیشە باڵۆرەی ئەوەیان لێداوە کە خاکی عێراق بەشێکە لەنیشتمانی عەرەبو گەلی عێراقیش بەشێکە لەنەتەوەی عەرەب، هەمیشە وایان نیشانداوە کە کورد لەسەر خاکی عەرەب میوانەو فڕی بەو خاکەوە نیە، هەمیشە ویستویانە گەلی کورد لەبۆتەی گەلی

عێراق یا نەتەوەی عەرەبدا لەقاڵب بدەن، بۆیە تێکدانی یەکێتی نەتەوەیی کورد یەکێك بووە لەو مەسەلە گرنگانەی لەبیرو لێکدانەوەی بەعسدا شوێنێکی گرنگو بەرچاوی هەبووە. ڕاگواستنی گوندەکانی سەر سنوور بەو مەبەستە کە یەکێتی نەتەوەیی کورد تێك بداتو کورد لەعێراقدا لەبۆتەی گەلی عێراقو نەتەوەی عەرەبدا بتوێنێتەوەو وابکات پەیوەندیە سیاسی، ئابووری ـ کۆمەڵایەتی، فەرهەنگیو سایکۆلۆجیەکانی بەپارچەکانی تری کوردستانەوە نەمێنێتو پارچەکانی تریش ئاگایان لەهی عێراق نەبێت، واتە: تێکدانی قوڵایی نەتەوەیی کورد لەعێراقدا، تا ئەوەندەی لەتوانایدا بێ لەپارچەکانی تری دابڕێو هەستی ئینتمای بۆ نەتەوەی کورد لاواز بکا یان نەهێڵێ، تا حکومەتی مەرکەزی عێراق بەئارەزووی خۆیو بەو جۆرەی دەیەوێ لەعێراقدا کورد لەقاڵب بدا.

چاوخشاندنێکی ورد بەباری پێکهاتنی کۆمەڵایەتی ناوچەکانی سەر سنور، ئەو ڕاستیەمان بەباشی بۆ روون دەکاتەوە کە زۆربەی هەرە زۆری عەشیەتو تایفەکانی سەر سنور لەکوردستانی ئێران، تورکیاو سوریادا درێژبوونەوەیان هەیە:

لەقەزاکانی بەدرەو مەندەلیو خانەقین: فەیلیەکان درێژبوونەوەی لوڕی بچوکی کوردستانی ئێرانن.

لەقەزای خانەقین عەشیەتو تایفەکانی: شەرەفبەیانی (بەهەموو تیرەکانیەوە: کوێرەکی، ئەمیرخان بەگی، عەزیز بەگی، گاخار، نادری)، گڵەزەردەیی، تایشەیی، جاف (بەهەموو تیرەکانیەوە، میکایلی، ڕوغزایی، هاروونی، شاتری، تەرخانی، شەمێرانی، نەورۆڵی، یارەویسی، تاوگۆزی، کۆکۆیی، ئیمامی، وەیسەیی، زەردۆیی، بێسەری، قەویلەیی، سوچانی کە بەشی هەرە زۆری ئەو تایفانە لەپارێزگای سلێمانیدان)، گۆرەیی، باجەلانی، جمور، نیرگی، ئەرکەوازی، زەهاوی، بێویانی، قادر مریوەسی، زەنگەنە، بایەخی، دەلۆ، وەنەوەیی، قالقالی، گاباری، کەلهوڕ، کاکەیی، گۆکوری، سورەمەیری (تیرەکانی: کەلهوڕی، توتك، مامەجان، عینە، ئەنتەر)، لەك، وەلمەوەیی، زەند، باژانی، گێژ، لەکوردستانی ئێراندا درێژبوونەوەیان هەیە.

لەپارێزگای سلێمانیدا، جاف(بەهەموو تیرەکانیەوە)، بلْباس و مامەش و مەنگور(بەهەموو تیرەکانیەوە)، کاکەیی، میاوەدەلی، بەگە ڕووتە، هەورامانی، لەکوردستانی ئێراندا درێژ بوونەوەیان هەیە.

لەپارێزگای هەولێردا، عەشیرەتەکانی سەکر، برادۆست (بەهەموو تیرەو تایفەکانیەوە)، هەرکی لەکوردستانی تورکیاو ئێراندا درێژ بوونەوەیان هەیە. لەپارێزگای دهۆکدا عەشیرەتەکانی: نێرۆیی، هورەمان، دۆسکی ژووی، بەرواری، سندی ئاموری، کۆچەر، ئێزدیەکان و دیانەکانیش، لەکوردستانی تورکیادا درێژ بوونەوەیان هەیە.

لەپارێزگای نەینەوادا، عەشیرەتەکانی: کۆچەر، زێتك، هەکاری، خەتاری، ستریزەرك، خالتی، هەسانیان، موسارەشی، میان، لەکوردستانی تورکیاو سوریا درێژبوونەوەیان هەیە. ئەو شوێنانەش کە عەشیرەتی لێ نیە، ئەوا پەیوەندی ژن و ژنخوازی، خزمایەتی، خەلْکی ناوچەکانی بەتوندی بەیەکەوە بەستووە، بۆیە لەبەریەك ترازاندنی ئەو پەیوەندیانە کار لەیەکێتی نەتەوەیی کورد دەکاو لێکیان دادەبڕێ.

ب . تێکدانی قولایی نەتەوەیی دەبێتە هۆی تێکدانی قولایی ستراتیجی جولانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان لەعێراقدا، چونکە دروست کردنی بۆشاییەکی جوگرافی ـ زەمینی لەنێوان کوردی عێراق و پارچەکانی تردا دەبێتە هۆی ئەوەی کوردی عێراق نەتوانێ بۆ گەشەکردن و بۆ پێشەوە بردنی جولانەوەکەی سود لەپارچەکانی تری کوردستان وەربگرێ و قولایی نەتەوەیی هەبێ، واتە: بۆ ئاسانکردنی تێکشکاندنی جولانەوەکەیە لەلایەن هێزەکانی ڕژێمەوە.

جـ. مەسەلەی کورد لەعێراقدا، کە بەشێکە لەمەسەلەی نەتەوەیەکی دابەشکراو بەسەر چەند دەولەتێکی هاوسنوری ناوچەکەدا، چارەسەرنەکردنی ئەم مەسەلەیە لەعێراقدا زەمینەیەکی لەباری ڕەخساندووە بۆ دەستێوەردانی ئەو دەولەتانە و دەولەتانی تریش، هەرچەندە ئەو دەولەتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە، هەر هەموویان لەسەر دژایەتیکردنی جولانەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، لەهێلە ستراتیجیەکاندا یەکدەگرنەوە، کە ڕزگارکردنی خاکی کوردستان و گەیشتنی گەلی کوردە بەمافی چارەی خۆنوسین، وێڕای ئەمانەش هەریەکێ لەو دەولەتانە لەپێناوی مەبەستێکی تایبەتی و تاکتیکی خۆیدا هەولی داوە،

لەسنورێکی دیاری کراودا، دژی دەوڵەتە هاوسێکەی سوود لەو مەسەلەیە وەربگرێت، کوردیش هیچ نەبێ بۆ ئەوەی لەناو نەچێ هەوڵی داوە سوود لەو یارمەتیانە وەربگرێت، کە ئەو دەوڵەتانە ئامادەن بیدەنە کورد، هەروەکو چۆن دەوڵەتی عێراق هەموو جار دەست بۆ ئەم دەوڵەت یا ئەو دەوڵەت رادەکێشێ کە یارمەتی بدا لەچارەسەرکردنی کێشەیەکی خۆیدا، بەتایبەتی لەکوژاندنەوەی کێشەی کورددا، (بەڵام نە هەوڵدانی سەرکردایەتی جوڵانەوەی کورد بۆ وەرگرتنی یارمەتیو بەدەستهێنانی پشتیوانی لەمو لەو، ئیتر ڕاست بوو بێ یا ناڕاست، چاك بووبێ یا خراپ، تەئسیری کردۆتە سەر عەدالەتو ڕەوایی ناوەرۆکی مەسەلەی کورد، نە هەوڵی بێگانەش بۆ دەستوەردان لەمەسەلەی کورد ماهیەتی عادیلانەی جوڵانەوەی کوردی گۆڕیوە[16]). بۆیە ( حکومەتی مەرکەزی عێراق وا تەماشای کوردی کردووە کە گوایا خائینو نیشتمان فرۆشنو دژی ئەمنو سەربەخۆییو پاشەڕۆژی عێراق کار دەکەن، پیاوی بێگانەنو هەمیشە دەست لەگەڵ دوژمنانی عێراقدا تێکەڵاو دەکەن، لەناوچە سنوریەکانەوە دەبن بەبنکەو پرد بۆ هاتنی نفوزی بێگانە، بۆیە دەبێ ڕایانگوێزیو ناوچەکانی سنور بەچۆڵی بهێتەوە[17]).

د. گەلی کورد لەپێناوی بەدیهێنانی مافە نەتەوەیی، مرۆییو دیموکراتیەکانی خۆیدا لەخەباتێکی بێوچانو نەپساوەدا بووە، ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقیش هەمیشە لەهەوڵدانێکی بێ وچانو نەپساوەدا بوون بۆ نەسەلماندنو زەوتکردنی ئەو مافانە. بۆیە گەلی کورد جگە لەخەباتی چەکدارانەو ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سەرسەختانەی ڕژێم، هیچ دەرفەتێکی تری لەبەردەمدا نەماوەتەوە تا داخوازیە ڕەواکانی خۆی بخاتە ڕوو. بەڵام چونکە دەوڵەتی عێراق خاوەن ئیمکانیاتێکی زۆری ئابووری مرۆییو سوپایی ئەوتۆ بووە کە بەراورد ناکرێ لەگەڵ ئەو ئیمکانیاتە ئابووری، مرۆییو پێشمەرگەییە کەمەی لەبەر دەست شۆڕشی کوردابووە، بۆیە هەمیشە جۆری ستراتیجی جەنگی شۆڕشی کورد لەجۆری ململانێو زۆرانبازی لاواز بووە دژی بەهێز. هێزی پێشمەرگەی

---

[16] یەکێتی نیشتمانی کوردستان، عێراقو مەسەلەی کورد چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ.١٩٨٤، ت ٧.

[17]هەمان سەرچاوە، ل١٥.

کوردستان، بەشێوەیەکی سەرەکی پشتی بەو ئیمکانیاتە کەمەی گەلەکەمان بەستووە کە:

* هێزی بنچینەیی شۆڕشەکە جوتیاران بوون.

* سەرچاوەکانی بژێوو پێداویستیەکانی پێشمەرگە هەر لەوێوە دابین کراوە.

* گوندەکانیشیان، بەتایبەتی ناوچە شاخاویە سەختەکان، لێرەوارو گردۆلکەکان، باشترین شوێنی بەگژاچوونەوەی داگیرکەرو هێزە چەکدارەکان بوون. هەر بۆیە وشککردنی سەرچاوەی ئەو ئیمکانیاتەو چۆلکردنی ناوچەکان، بەلێکدانەوەی ڕژێم، لەڕووی سوپایەوە زەمینەی خەباتی چەکدارانە لەکوردستاندا لاواز دەکات، یاهەر ناهێلێ، چونکە سەرەتایەکی گرنگ هەیە دەڵێ: (پارتیزانو جەماوەر وەکو ماسیو ئاون) دیارە وشککردنی ئاوەکە واتە خنکاندنی ماسیەکەیە. ڕژێمی بەعس گوندەکانی سەر سنووری گواستەوە تا ئەو زەمینەیە نەهێڵێ یا زۆر لاوازی بکا، کە خەباتی چەکدارانەی لەسەر بەرپا دەبێ، تا چیتر کورد نەتوانێ شۆڕشی چەکدارانە هەڵبگیرسێنێتەوە.

هـ. مەسەلەی ڕاگواستنی گوندەکانی سەر سنوورو کۆکردنەوەیان لەئۆردوگا زۆرەملێکاندا لایەنێکی دیمۆگرافیشی هەیە، کە پەیوەندی بەجۆری دابەشبوونی دانیشتوانەوە هەیە. ڕژێمی بەعس کە بەدەیان هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەی لەخاکی کوردستان چۆلکردووەو دانیشتوانەکەی لەشوێنێکی تردا کۆکردۆتەوە بۆتە هۆی ئەوەی هەندێ شوێنی کوردستان چۆڵو هۆڵو هەندێ شوێنی تریشی ئاپۆرەو قەڵەبالغو دانیشتوانێکی چڕی هەبێ. ئەمەش خۆی لەخۆیدا مەترسیەکی دیمۆگرافیە لەسەر پاشەڕۆژی کوردو باری ئێستای.

ئەمانەی سەرەوە ئەو هۆو سۆنگانە بوون، کە فاکتەری گرنگ بوون لەرەنگڕشتنی نەخشەی ڕاگواستنی ناوچە سنوریەکان.

- ئێمە کاتێ باسی ناوچە سنووریەکان دەکەین، لێرەدا مەبەستمان لەو بەشەی سنووری کوردستانە، کە دەکەوێتە پارێزگاکانی سلێمانی، هەولێر، دهۆکەوەو هەر لەناوچەی پشتەی سەر بەناحیەی سیوانی قەزای هەڵەبجەوە دەست پێ دەکا تا دەگاتە چۆمی خابوور لەقەزای زاخۆ، باقی ناوچە سنووریەکانی تر لەچوارچێوەی ئەوەرە ستراتیجیەکاندان. جگە لەوە ناوچەکانی تەوەرە ستراتیجیەکان جیا لەڕاگواستن تەعریبیش کراون.

- هەموو ئەو گوندو لادێیانەی بەهۆی سنوورەوە ڕاگوێزراون، لەئۆردوگا زۆرەملێکاندا کۆکراونەتەوە، لەکاتێکدا ئەو شوێنانەی بەهۆی تەوەری ستراتیجیەوە ڕاگوێزراون، کەمیان لەئۆردوگاکاندا کۆکراوەنەتەوە، بەڵکو زۆریان بەشارو ناوچەکانی باشووری عێراقدا پەرش‌و بڵاو کراونەتەوە، یا لەناوچەکانی تری کوردستاندا پەرەوازە بوون.
- لەبەر ئەوەی مەبەستی ڕژێم لەکردنەوەی ئۆردووگاکان مەبەستێکی سوپاییە، تا دانیشتوانی ئەو ناوچانە لەژێر دەسەڵات‌و لەناو ئەڵقەی دەسەڵاتی شۆڕشدا دەربهێنێ، بۆیە ئەو ئۆر دووگایانە گشتیان لەنزیك شارەکان‌و لەسەر جادە سەرەکیەکانی نێوان شارەکاندا ڕۆنراون. تا:

* لەلایەکەوە پێشمەرگە نەتوانێ بیگاتێ‌و ڕێکخستنیان لەناودا دروست بکا یا چالاکی تێدا بکا.
* لەلایەکی ترەوە بەئاسانی بتوانن بەسەر دانیشتوانەکەیدا زاڵ ببن‌و دەوریان بەسەر بازگەو ڕەبایە بتەنن.

### ٢-٤-٢: ئەو ناوچانەی بەهۆی سنوورەوە ڕاگوێزراون

أ. ئەو ناوچانەی بەهۆی سنورەوە بەر ڕاگواستن کەوتون:

* قەزاکانی: هەڵەبجە، پێنجوێن، شارباژێر، دوکان، پشدەر لەپارێزگای سلێمانی.
* قەزاکانی: ئامێدی، زاخۆ لەپارێزگای دهۆك.

ب - ژمارەی گوندە ڕاگوێزراوەکانی پارێزگای سلێمانی: ٥١٧ گوند، ١٨٥٩٩ خێزان.

ژمارەی گوندە ڕاگوێزراوەکانی پارێزگای هەولێر: ١٤٨ گوند، هی ١٣٢ گوندیان ٤٣٨٧ خێزان.

ژمارەی گوندە ڕاگوێزراوەکانی پارێزگای دهۆك: ٢٠٧ گوند، ٧٨٢٨ خێزان.

هی هەر سێ پارێزگاکە: ٨٧٢ گوند، ٣٠٨١٤ خێزان.

بەڵام ژمارەیەك لەگوندەکانی ناحیەی برادۆستی قەزای ڕواندزو، هەر سێ ناحیەکەی سەر بەقەزای زێبار، نەزانراون‌و لێرەدا تۆمار نەکراون.

جـ - بۆ کۆکردنەوەی ئەم گوندانە چەندین ئۆردوگای زۆرەملێ دروست کراون:

١- لەپارێزگای سلێمانی:

- لەقەزای پشدەر: ئۆردوگای پێماڵك (نزیـك قـەلادزێ)، ئۆردوگاکـانی ژاراوە، بەستەستێن، تووەسوران لەسەر جـادەی سـەرەکی قـەڵادزێ – رانیـە دروسـت کراون.
- ئۆردوگای بنگرد (لەتەنیشت بنگرد)
- لەقەزای رانیە: ئۆردوگاکانی رانیە، چوارقوڕنە لەسەر جادەی سـەرەکی رانیـە – چوارقوڕنە دروست کراون.
- لەقەزای شارباژێر: ئۆردوگاکانی کەناروێ، کـارێزە، سـورەقەلات، قەڵاچـوالان لەسەر جادەی سەرەکی چوارتا – سلێمانی دروست کراون.
- لەقەزای هەڵەبجـە: ئۆردوگاکـانی عەنـەب، دوجەیلـە (سـیروان)، زەمـەقی، خورماڵ لەسەر جادەی سەرەکی سیدسادق – هەڵەبجە دروست کراون. هەروەها شانەدەری لەنزیك سید سادق.
- لەقەزای پێنجـوێن: ئۆردوگاکـانی پێنجـوێن )لـەنزیك پێنجـوێن‌و ناڵپـارێز لەسەر جادەی سەرەکی سید سادق – پێنجوێن.
- لەقەزای دەربەندیخان: ئۆردوگاکانی زەڕاین، لەسەر جادەی سەرەکی سـلێمانی – دەربەندیخان.
- لەقەزای سلێمانی: ئۆردوگاکانی قادسیە، تاسلۆجە، ئەڵلاّیی، تەیناڵ لەسـەر جادەی سەرەکی سلێمانی – چەمچەماڵ.
- لەقەزای چەمچەماڵ، ئۆردوگاکانی تەکیە سوتاو لەنزیك چەمچەماڵ.
- لەقەزای کەلار: ئۆردوگاکانی ئەحمەد ئاوا، بەردەسوور، ٥٠٠ ماڵەکە، حەمـە کریم، لەنزیك شـاری کـەلارو ئۆردوگـای بـاوەنوور (پێبـاز) لـەنزیك شـاری باوەنوور.

بەم جۆرە لەپارێزگای سلێمانیدا ٢٩ ئۆردوگا دروست کراوە بـۆ کۆکردنـەوەی گوندەکانی ئەو پارێزگایە.

٢- لەپارێزگای هەولێر:

- لەقەزای هەولێر، ئۆردوگاکانی قوشتەپە (قودس)، قولتەپە (سەدام)، گردمەلا (قادسیە)، لەناحیەی قوشتەپە دروست کراون لەسەر جادەی سەرەکی هەولێر – کەرکوك.

- لەناحیەی خەبات: ئۆردوگاکانی سێبیان، کانی قرژاڵە، هەنجیە.
- لەناحیەی مەرکـەزی هـەولێر: ئۆردوگاکـانی کەسـنەزان، شـاوەیس، پیرزیـن، بەحرکە.
- لەقەزای شەقلاوە: ئۆردوگانی بەستۆرە (لای سەلاحەددین)و حەریر.
- لەقەزای کۆیە، ئۆردوگای شۆڕش (دێگەڵە) لەسەر جـادەی سـەرەکی کۆیـە — هەولێر)
- لەقەزای زێبار ئۆردوگاکای گۆڕەتو لەنزیك مێرگەسور.
ئەوانە بۆ کۆکردنەوەی گونـدو لادێکـانی پارێزگاکـە دروسـت کـراون، هـەر هەمووشیان یا لەنزیك شارەکانن، یا لەسەر جادە سەرەکیەکانی نێوان شـارەکانن. بەجۆرە ١٦ ئۆردوگا لەم پارێزگایەدا دروست کراوە.

٣- لەپارێزگای دهۆك:
- لەسەر جادەی سەرەکی زاخـۆ — بـەرواری بـالاّ ئـەم ئۆردوگایانـە دروسـت کراون:
هیزاڤا، دەرکار، عەجەم، بیرسڤێ، باتیف، بێگۆڤا، کـە گونـدەکانی سـنووری ناحیەکانی سندی، گولی، بەرواری بالاّیان تێدا کۆکراوەتەوە.
- لەسەر جادەی سەرەکی دهۆك — ئامێدی ئەم ئۆردوگایانە دروست کراون:
کورێت گاڤانا، باگێرات، قدش دێرالۆك، کوانێ شێلادزە، سیی.
هەروەها ئۆردوگاکانی تلکەبەرێ، سندیش کە هەر هـەموویان بـۆ کۆکردنـەوەی گوندەکانی سـنووری ئـەم پارێزگایـە دروسـت کـراون، بـەجۆرە ١٤ ئۆردوگـا لەسنوری ئەم پارێزگایەدا دروست کراون.
د — ڕێژەی ئەو خاکەی بەهۆی سنوورەوە ڕاگوێزراوە، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:
- پارێزگای سلێمانی ٣١,١ ٪
- پارێزگای هەولێر ٢٦,٩٥ ٪
- پارێزگای دهۆك ٦٠,٤٦ ٪ (لەگەڵ تەوەری ستراتیجی)

--- ڕێژەی ئەو خاکەی لەهەموو ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا بەر ڕاگواستن کەوتووە:
٣٦,٠٤ ٪ ، واتە زیاتر لە ١٣,١٠٠ ٪ کم٢ لەناوچەی ئۆتۆنۆمی ڕاگوێزراوە (بەهەموو جۆرەکانی ڕاگواستنەوە).

**نەخشەی ژمارە (١٢)**

**ناوچە سنوورییە ڕاگوێزراوەکانی پارێزگای سلێمانی**

سنووری دەولی

سنووری پارێزگا

سنووری ناوچەی ڕاگوێزراو

ناوچەی ڕاگوێزراو

باکور

پارێزگای هەولێر

زێی بچوک

دوکان

ئێران

پارێزگای تەئمیم

جوارتا

سلێمانی

پارێزگای سلاحەدین

هەڵەبجە

ڕوباری سیروان

پارێزگای دیاله

نەخشەی ژمارە (١٣)

ناوچە سنوورییە ڕاگوێزراوەکانی پارێزگای هەولێر



## نەخشەی ژمارە (١٤)

## ناوچە سنووریيە ڕاگوێزراوەکانی پارێزگای دهۆك



# فەسڵی پێنجەم

# جۆرەکانی تری ڕاگواستن

## ٢-٥-١: ڕاگواستن بەهۆی جەنگی عێراق - ئێرانەوە

أ- ڕژێمی بەعسی عێراق لەپێناو گەیشتن بەنیازە فراوانخوازەکانی لە ١٩٨٠/٩/٢٢ دا پەلاماری کۆماری ئیسلامی ئێرانیدا، لەوساوە جەنگێکی سەختو درێژخایەن لەنێوان هەردوو دەوڵەتدا هەڵگیرسا، کە بەرداشی جەنگەکە کەللەی هەزاران ڕۆڵەی لەگەلانی هەردوولا هاڕی، ڕژێمی بەعس گەرچی دەیویست لەپەلامارێکی پڕتاودا بۆ سەر خاکی ئێران ئامانجە سوپایی‌و سیاسیەکانی خۆی بەدی بێنی‌و ئێران پارچە پارچە بکات‌و ناوچە (نەوت)ییەکانی خۆزستان لەئێران دابڕێ‌و بیخاتە سەر عێراق، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی تاکە نیشانێکی ستراتیجی بگرێ، نەك هەر ئەمە بەڵکو وردە وردە بەقازانج‌و بەلای ئێراندا شکایەوە. ئێران پاش سازدانی هەندێ لەهێزی مرۆیی خۆی، کەوتە بەکارهێنانی تاکتیکی شەپۆلی مرۆیی لەهێرشی پێچەوانەیدا بۆ سەر هێزەکانی عێراق، لەخۆرەمشەهرو دزفول‌و شوش گەورەترین زیانی لەسوپای عێراقداو هەموو شوێنەکانی لێ سەندەوە. بەم جۆرە توانی عێراق بخاتە هەڵوێستێکی دیفاعی سەلبیەوەو بەیەکجاری جڵەوی دەستپێکەری سوپایی لەدەس دەربێنێ. هەر لەساڵی ١٩٨٣وە ئێران توانی بەشی باکووری ساحەی عێراق - ئێران بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی‌و لەزۆر شوێنیشەوە بێتە ناوخاکی عێراقەوە، بەجۆرە بەشی باکوری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی عێراق، بەتایبەتی لەپارێزگاکانی سلێمانی‌و هەولێر، کەوتنە نێوان بەرداشی ئەم جەنگە

کاولکەرەوە. ڕژێمی بەعسیش بەدەرفەتی زانیو بیانوی بۆ هەڵکەوت بەهۆی ئـەم جەنگەوە ناوچەی تری کوردستان ڕاگوێزیو دانیشتوانەکەشی پەرەوازە بکات.

ب- ئەو ناوچانەی بەهۆی جەنگی عێراق – ئێرانەوە ڕاگوێزراون.

ئەو ناوچانەی کە بەهۆی جەنگی عێراق – ئێرانەوە ڕاگوێزراون ئەمانەن:

١. لەپارێزگای سلێمانی: قەزای پێنجوێنو ناحیـەی بیـارەو مەرکـەزی ناحیـەی سیوەیل (باسنێ)و ئۆردوگاکانی ناڵپارێزو پێنجـوێنو ٦٦ گونـد کـە ژمـارەی خێزانەکانی هەموویان دەکاتە: (١٦١٢٥) خێزان.

٢. لەپارێزگای هەولێر: قەزای چـۆمانو ٣٥ گونـد کـە ژمـارەی خێزانـەکانیان: (١٧٧٩) خێزانە.

بەمجۆرە دوو مەرکەزی قەزا، دوو مەرکەزی ناحیە، دوو ئۆردوگـاو ١٠١ گونـد کە ژمارەی خێزانەکانیان (١٧٩٠٤) خێزانە بەهۆی جەنگی عێـراق – ئێرانـەوە ڕاگـوێزراونو دانیشتوانەکەشـی بەشـارو گونـدەکانی کوردسـتاندا پـەرشو بڵاوکراونەتەوە.

**٢-٥-٢: ڕاگواستن بەهۆی جەنگی کوردستانەوە.**

أ- سیاسەتی بەسوتماککردنی خاکی کوردستان

١. یەکێ لەو مەبەستانەی ڕژێم، کە لەپشت ڕاگواستنی گوندەکانی ناوچـە سنووریەکانەوە بوو، مەبەستی سوپایی بوو، تا زەمینەی خەباتی چەکدارانە لەبار بەرێتو تەنگ بەشۆڕش هەڵبچنێ، چونکە ناوچە شـاخاویەکانی سـنور شـوێنی لەبارن بۆ پێڕۆکردنی تاکتیکـەکانی جـەنگی پێشـمەرگانەو ڕژێـم ناچـار دەبـێ هێزێکی سوپایی زۆر بخاتە گەڕ تا بتوانێ هەموو قوتـەو لوتکـەو گـردو شـیوو دۆڵەکانی بتـەنێ. بـەڵام چـونکە جۆڵانـەوەی ڕزگـاریی نیشـتمانیی کوردسـتان جوڵانەوەیەکی بابەتی مێژووکردی ناو هەناوی کۆمەڵی کوردستانە، ئەو هـەموو ڕێو شوێنە سوپایی ئابووری سیاسیانەی کە ڕژێمی بـەعس گرتیەبـەر نـەیتوانی ببێتە لەمپەر لەبەردەم گەشەکردنو بۆ پێشەوە چونی شۆڕشدا، هەربۆیە شـۆڕش توانی دوای خـەباتێکی سـەختو دژوار، گـەلێ ناوچـەی کوردسـتان بتەنێتـەوە، سەدان گوندو بەهەزاران کیلۆمەتری چوارگۆشـە لـەخاکی کوردسـتانی عێـراق

ڕزگار بکاتو لەجیاتی دەسەڵاتی سیاسی بەعس، دەسەڵاتی سیاسی شۆڕشی تیا دابمەزرێنێ.

٢. هەر کاتێ شۆڕشی چەکدار لەکوردستانی عێراقدا بەرپا بووبێ، گەشەی کردبێو بەرە بەرە پەرەی بەچالاکیەکانی خۆی دا بێو ئەڵقەی دەسەڵاتی سیاسی خۆی فراوان کردبێ، گورزی کوشندەو گورچکبڕی لەهێزە داگیرکەرەکانی دوژمن وەشاندبێو قورساییەکی سوپای لەسەر دروست کردبێ، ئەوا ڕژێمەکانی عێراق، بەمەبەستی ڕێگەگرتنو تۆڵەسەندنەوە، بەپەلە پرووزێ هەستاون بەدارشتنی نەخشەو پلانو ڕێو شوێنی گونجاو بۆ ئەم مەبەستە. بۆیە لەپەنا هەر گوندێکدا، لەپاڵ هەر شارێکدا چالاکیەکی سەرکەوتوانەی هێزی پێشمەرگە کرابێ، ئەوا ئەو گوندەیان کاول کردووە، یا ئەو گەڕەکەیان تێك داوەو زۆر جاریش وا ڕێکەوتوە دانیشتوانەکەشیان قەتڵو عام کردووە.

ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق، هەر لەسەردەمی هاشمیەکانەوە تا سەردەمی بەعسیەکانی ئێستای عێراق، بۆ تۆڵەسەندنەوە گوندو لادێکانی کوردستانیان کاولو تەخت کردووە، بەڵام ئەگەر ڕژێمەکانی پێش بەعس لەڕوانگەیەکی تاکتیکیو مەیدانیەوە، بۆ تۆڵە سەندنەوەیەکی کاتی، بۆ چاوترساندنی جەماوەرە پشتیوانەکەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان سیاسەتی کاولکردنی هەندێ گوندی کوردستانیان گرتبێتە بەر، ئەوا ڕژێمی بەعس لەڕوانگەیەکی ستراتیجیەوە سیاسەتی بەسوتماك کردنی خاکی کوردستانی عێراقی کردۆتە بناغەی نەخشەکانی خۆی، کە بنچینەیترینیان تواندنەوەی گەلی کوردو پەڕەوازە کردنیەتی لەعێراقدا.

٣. کاتێ بەعس لەساڵی ١٩٦٣دا بۆ جاری یەکەم دەسەڵاتی سیاسی لەعێراقدا گرتە دەست، لەو ماوە کەمەی دەسەڵاتیدا چەندین گوندی کوردستانی بەهۆی جەنگی پێشمەرگەوە کاولو تەخت کردو دانیشتوانەکەشی پەڕەوازەو دەربەدەری گوندو شارەکانی تر کرد. لەوەتەی لەساڵی ١٩٦٨ەوە بۆ جاری دووەم، دەسەڵاتی سیاسیان گرتۆتەوە دەست بەگوێرەی نەخشەیەکی هەمەلایی تر، قوڵترو کاریگەرتر سیاسەتی بەسوتماککردنی خاکی کوردستانیان گرتۆتەبەر، ڕاگواستنی ناوچەکانی تەوەرەی ستراتیجی، ناوچە (نەوت)ییەکان، ناوچەکانی سنوورو ناوچەکانی تەماس، هەموو ئەوانە ئەڵقەی زنجیرەیەکن، کەڕاگواستنو کۆچکردنی کوردە لەشوێنە مێژووییەکانی خۆیدا.

لـەدوای هەڵگیرسـانەوەی شۆڕشـی نوێخـوازی ئـەجارەی گەلەکـەمان، دوای ڕاگواستنی ناوچە سنوورییەکان، ئیتر ڕژێم کەوتە مشورخواردنی خۆیو ئەگەر لە پەنا گوندێکدا یا لادێیەکان چالاکییەکی پێشـمەرگە کرابـێ، ئـەوا گوندەکـەی سوتاندووەو کاول کردووە. هەر لەساڵی ١٩٧٧ەوە، تاکو تەرا، لەم شوێن یـا ئـەو شوێن، لەم پارێزگایە یا ئەو پارێزگایە گوندیان سوتاندووەو تەخت کردووە. ساڵی ١٩٨٠ ناحیەی گەلاڵەیان لەبەر پێشمەرگە ڕاگواست. لەساڵی١٩٨٢ یش کاتـێ هێزی پێشمەرگەی کوردستان تاکتیکێکی نوێی جەنگی پارتیزانی هەڵبژارد کـە شەڕی ناو گوندەو سەرکەوتوانە شەڕەکەی بردەوە، ڕژێم دوایی گوندەکـەی تـەخت کرد کە حەمك بوو. لەوساوە لەهەر گوندێکدا شـەڕ کرابـێ، گوندەکـە تـەختو کاول کراوە. بەڵام لەساڵی ١٩٨٥ەوە رژێمی بەعس بەشێوەیەکی فـراوانتر دەسـتی دایە ڕووخاندنو کاول کردنی گونـدو لادێکـانی کوردسـتانو هـەر لەڕوخانـدنی گوندی گۆپتەپە(١٩٨٥/٢/٧) یەك لەدوای یەك بەگوندو دێهاتەکانی قـوڵایی کوردستانی عێراق دا گەڕاو سوتاندنی یا هیچ نەبێ چەند مـاڵێکی لێ ڕمانـدن. ئەم ناوچانەی کە بەهۆی جەنگی کوردستانەوە بەر شاڵاوی ڕاگواستنو سـوتاندنو تەختکردنی کەوتون، دوو جۆرن:

ئەو ناوچـانەی جێگـای حەسـانەوەو ژیـانی پێشـمەرگەنو لـەژێر دەسـەڵاتی پێشمەرگەدان، بەڵام لەهەمان کاتیشـدا لەناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی ڕژێمـەوە نزیکن، ئەمش زۆر لەو گوندانەی بناری شاخەکانو هەندێکی دەشتاییەکانیشـی گرتۆتەوە.

ئەو گوندو ناوچانەی لەسەر جادە سەرەکیەکانی نێوان شـارەکان دانو دەشـێ هێزی پێشمەرگە بۆ بۆسەنانەوە یا شەڕی گوند سـودیان لێ وەربگـرێ، هەربۆیـە زۆربەی گوندەکانی سەرجادەی ڕانیە- دوکان، دوکان- سلێمانی، کۆیە- هەولێر... لەگەڵ خاكو خۆڵ دا یەکسان کران.

لەڕووی هۆکانی سوتاندنی ئەو گوندو لادێیانە دەشێ بکرێتە چەند جۆرێ:

-هەندێ لەو گوندانە شـەڕو پێکـدادانی هێزەکـانی پێشـمەرگەو سـوپاو هێـزە چەکدارەکانی عێراقـی تێـدا کـراوەو هێزەکـانی دوژمـن زیـانی کاریگـەریان بەرکەوتوە.

-هەندێ لەو گوندانە شەڕیشی تێدا نەکراوە، بەڵام ڕژێم مـەترسی ئـەوەی هـەبووە لەدەرفەتێکی لەباردا شـەڕی تێدا بکرێو زیانی بەرکەوێ، بۆیە سوتاندنی.

- هەندێکی تر لەو گوندانە لەبەر ئەوە بووە رژێم دەسەڵاتی بەسەردا کەم بۆتەوە، بۆیە ناچار خۆی کشاوەتەوەو گوندەکەشی راگواستوە.
- هەندێکی تریان هەر لەژێر دەسەڵاتی خۆی دابووە، شەڕی پێشمەرگەشی تێدا نەکراوە، بەڵام مینێك لەژێر سەربازو جاشەکانی دا، یالەژێر ئۆتۆمۆبیلو زرێپۆشیو تانکەکانی دا تەقیوەتەوە، ئەویش لە تۆڵەدا گوندەکەی سووتاندووەو خەڵکەکەشی پەرەوازە کردووە(یا هەرهۆیەکی تر، کە بۆتە کوژرانی هەندێ لە چەکدارەکانی)،
٤- ئەو گوندو ناوچانەی هێزە چەکدارەکانی رژێم نەیانتوانیوە بیانگەنێو کاولی کەن، ئەوا لە لەلایەن تۆپخانەی سوپای عێراقو هێزی ئاسمانی عێراقەوە بەدڕندانەترین شێوە تۆپبارانو بۆمباران کراونو بە دەیان کەسیان شەهید کراوەو بەسەدانیشیان برینداروپەککەوتەو بە هەزارانیشیان ماڵ وێرانو سەرگەردانو بێجێو رێ کراوە. سەدان گوندی کوردستان بەر شاڵاوی پەیتا پەیتای فڕۆکە مەرگ چێنەکانی بەعس کەوتون، سەدان گوندی کوردستان بەشێوەیەکی هەمیشەییو بەردەوام تۆپ باران کراون، سەدان گوندی کوردستان بەرگەمارۆدانی ئابووری کەوتونو کارەبایان لێ براوە، مەکتەبوخەستەخانەکانیان داخراوە، رێگاوبانەکانیان لێ گیراوە، ئاردو رۆنو شەکرو برنجیان لێ قەدەغە کراوە، گەنمو جۆ کردنیان لێ قەدەغە کراوەو بێ کارو کاسبی کراون، هەر هەمووشی بە مەبەستی چۆڵکردنی ئەو گوندانە بووە تا هیچ شوێنەوارێکی ژیانی ئاسایی لێ نەبێ.
٥- دیارە سیاسەتی بەسوتماککردنی هەموو خاکی کوردستان دوائەڵقەی زنجیرەی ڕاگۆاستنی ناوچەکانی کوردستانە، تا ئیتر شۆڕشی چەکداری کوردستان نەتوانێ زیاتر تەشەنە بکاتو مەترسیی سوپاییو سیاسی زیاتر بخاتە سەر رژێم. هەربۆیە رژێمی بەعس نەخشەیەکی نوێتری دارشت بەناوی (التطویر الریفی : پەرەپێدانی لادێ)وە کە بە گوێرەی ئەو نەخشەیە زۆربەی هەرە زۆری شارو شارۆچکەو گوندەکانی قولایی کوردستان لەپارێزگاکانی سلێمانی، هەولێر، دهۆك، کەرکوكو سەلاحەددین بەر شاڵاوی راگواستن دەکەون*

---

*هێشتا ئەم کتێبە لەژێر چاپدابوو کە رژێمە بەعسی عێراق شاڵاوێکی بەرفراوانی دڕندانەی کردەسەر ناوچەکانی کوردستانو چەندین شارۆچکەی تەخت کردو سەدان گوندیشی لەناوچە جیاجیاکانی کوردستان: دەشتی گەرمیان، دەشتی قەراجو شەمامكو کەندیناوا، سلێمانی، بادینان....

- بۆ ئەم مەبەستە لەهەر پارێزگایەکدا لیژنەیەك بەناوی لیژنەی پەرەپێدانی لادێ (لجنة التطوير الريفي) پێك هات کە پارێزگار راستەوخۆ بەرپرسی ئەو لیژنەیە بووە.

* بەپێی نوسراوی نهێنیی پارێزگای هەولێر ژمارە ٦٤٩٣ی رۆژی ٢/١٠/١٩٨٦ فەرمانگەی تۆمارکردنی عەقارات ئاگادار کرایەوە کە ئەم شوێنانە چۆڵ بکرێن بۆ دروست کردنی ئۆردوگای زۆرە ملێ.

شوێنەکان: بنەسلاوە، باغەمرە، کونە گورگ، دارەتو ( کەسەر بەناحیەی مەرکەزی هەولێرن).

ناحیەکانی: دیانا، تەقتەق، گوێر، دیبەگ، لەگەڵ گشت دێیەکانی سەر بەم ناحیەیە سەر بەو ئۆردوگایانەدا کۆدەکرێنەوە، حەوت ئۆردوگا دروست دەکرێن کە هەریەکەی ١٦هەزار خانوو دەبێ. ئەو ئەندازیارو کرێکارانەی لەو ئۆردوگایانەدا کار دەکەن ئیمتیازاتیان هەیە، کە ناکرێنە جەیشی شەعبی یا بۆیان هەیە هەر ئۆتۆمبیلێك بیانەوێ بەکاری بێنن وێرای (مخصصات)ێکی زۆر.

* هەر لەسلێمانیش لەسەر جادەی قەرەگۆل - زەڕایەن ئۆردوگایەکی ١٠هەزارماڵە دروستکرا، هەروەك نەخشەی دروستکردنی چەند ئۆردوگایەکی تریش هەیە:

*لەپارێزگای دهۆك و کەرکوکیش هەمان شت جێبەجێکرا.

- رژێمی بەعس لەقەزای دوز چەند ئۆردوگایەکی دروستکرد بۆ ڕاگواستنی دانیشتوانی گوندەکانی سنووری ئەو قەزایە.

| | |
|---|---|
| *لەناحییەی نەوجوول:ئۆردوگای ئاخچەمەشەد | ٤٠٠خانوو |
| ئۆردوگای قەڵخانلو | ٤٠٠خانوو |
| ئۆردوگای لەك | ٤٠٠خانوو |
| ئۆردوگای نەوجوول | ٣٠٠خانوو |

---

لەگەڵ خاك و خۆڵ دا یەکسان کردو راگواستن، تەنانەت ئەو گوندانەشی بێبەش نەکرد کە چەکی جاشایەتی یان بۆ رژێم هەلگرتبو. بۆ ئەم مەبەستە دەیان هەزار سەربازو جاش، سەدان تانك و تۆپ و فڕۆکەی جەنگی بەکارهێناو هەروەها چەکی کیمیاویشی بەکارهێنا، غازی فۆسجین و خەردەل...، بەمەبەستی تۆقاندن و زراوبردنی دانیشتوانی گوندەکان تا لەژێر سێبەری ئەو هەل و مەرجەدا رایانگوێزێ بۆ سەر سنورەکانی ئوردون و سعودیە. ئەم شاڵاوە دڕندانەیەی بەعسییە رەگەزپەرستەکان، جارێکی تر شۆفێنیزمی بۆرجوازیی ناسیونالیستی و رەگەزپەرستی عەرەبی عێراق بۆ لەناوبردن و تەفروتوناکردنی کوردو کوردستان بەڕوونی دەردەخا.

*لەناحییەی قادر کەرەم: ئۆردوگای کۆرومور ٤٠٠خانوو

ئۆردوگای زەردە ٤٠٠خانوو

ئۆردوگای چەم سورخاو (قادر کەرەم) ٤٠٠خانوو

ئۆردوگای قەلآمیکایل ٤٠٠خانوو

ب ـ ئەو شارو گوندانەی بەهۆی جەنگی کوردستانەوە راگوێزراون.

لەئەنجامی جەنگی کوردستاندا:

١ـ ٢٢٠ گوند سوتێنرا یا تەختو کاول کران کە ژمارەی خێزانەکانیان : ٩١٤٢خێزانە.

* پارێزگای سلێمانی: ٨٠ گوندو ٣٤٩٨ خێزان.

* پارێزگای هەولێر: ٨٨ گوندو ٣٤٣٢ خێزان.

* پارێزگای تەئمیم:٢٨ گوندو ١٠٥٨ خێزان.

* پارێزگای سەلاحەددین: ٢٣ گوندو ١١٥٤ خێزانیان بەردەکەوێ، کە بەشی هەرە زۆریان بەر ئەم قەزایانە دەکەون: مەخمور:٣٣گوند، کۆیە: ٢٣ گوند، کەرکوك: ٢٥ گوند، دوز: ٢٣ گوند، دوکان: ٢٢گوندو سلێمانی: ١٧ گوند.

٢- بەگوێرەی ساڵەکان ژمارەی گوندە سوتێنراوەکان بەم جۆرەیە:

* لەساڵی ١٩٦٣دا ١٣ گوند سوتێنراو تەختکران کە ئەمانەن:

- گوندەکانی: خدرجە، گاوەرە، کەندالّ لەناحیەی دیبەگە، هەروەها دارەخورما، حەسەن بلّباس، حاجی شێخان، لاوەر لەهەمان ناحیەدا. لەساڵی ١٩٨٥یش دووبارە کاول کرانەوە.

- لەناحیەی قەرەحەسەن: گوندەکانی پەنجا عەلی، مەحمودئاوا.

- لەناحیەی شوان گوندەکانی: قزلّقایە، وەلی پاشا. لە ناحیەی قەرە هەنجیر: سۆنە گۆلی، یاروەلی کە هی دووەمیان جارێکی تر لە ١٠/١٩٨٦ تێکدراوەتەوە.

* لەساڵی ١٩٧٧دا (١) گوند.

* لەساڵی ١٩٨٠دا (١) مەرکەز ناحیەو (١) گوند.

* لەساڵی ١٩٨١دا (١) مەرکەز ناحیە.

* لەساڵی ١٩٨٢دا (٤) گوند. *

* لەساڵی ١٩٨٣دا (١٥) گوند.

* لەساڵی ١٩٨٥دا (١٣٥) گوند.
* لەساڵی ١٩٨٦دا (٥٨) گوند، کە هەندێك لەو گوندانە زیاتر لەجارێك کاولکراون.
٣- ئەم ئامارە گوندەکانی سنوری پارێزگای دهۆکی تێدا نیە.
٤- ئەو گوندانەی بەر راگواستن کەوتون، هەموو دانیشوانەکەی پەرش‌و بڵاون.

### ٢-٥-٣: راگواستن بەهۆی ترەوە

١- راگواستن بەهۆی سەربازگەو بارودخانەوە:

ئەگەرچی کوردستان سمای داگیرکردنی سوپایی بەئاشکرا پێوە دیارە، دەیان قەڵای سەربازی‌و فرۆکەخانەی، سەدان سەربازگەی گەورە گەورەو بە هەزاران رەبیەی قایم لەسەر قوتەو لوتکەی چیاکان، لەسەر زنجیرە چیاو گردۆلکەکان، لەدامێن‌و بناری شاخەکان، لەسەر جادەو رێگاو بانەکان، لە دەوروبەری شارو شارۆچکەو ئۆردوگا زۆرە ملێکان، لەسەر پردو کەناری روبارو دەربەندەکان دروست کراون، کە بە هەزاران کیلۆمەتری چوارگۆشەی گرتۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا رژێم هەر بەوە دانەکەوت کە ئەو سەربازگەو رەبیانە لەمەزراو زەوی زاری جوتیارەکان دروست بکاو بێ بەریان بکا لەبەروبومی زەوییەکانیان، بەڵکوچەندین گوندی بەهۆی دروستکردنی ئەو سەربازگەو رەبیەو بارودۆخانەوە راگواستن‌و دانیشتوانەکەشی پەرەوازە کرد، هەر تەنها رووبەری ئەو زەویانەی لەنێوان هەولێرو کەڵەکی یاسین ئاغادا کرانە سەربازگە، بریتیبوون لە ٤٥ هەزار دۆنم، واتە: ١١٢,٥ کم٢ لە باشترین زەوی‌و زارەکانی کشتوکاڵی ئەوناوچەیەیە.

ئەو گوندانەی بەهۆی دروستکردنی رەبیەو سەربازگەو بارودخانەوە راگوێزران: ١٤ گوندە کەژمارەی خێزانەکانیان دەکاتە (٤٣٤) خێزان:

### ب- راگواستن بەهۆی راپەرینی خەڵکەوە:

رژێمی بەعس نەك هەر لەئاستی داخوازییە نەتەوەیی، مرۆیی‌و دیموکراتی یە رەواکانی گەلی کوردستاندا نییە، بگرە لە ئاستی بەدیهێنانی داخوازییەکانی رۆژانەشیاندا نییە، هەر داخوازییەکی رەوای دانیشتوانی گوندو شارەکان بەشێوەیەکی توندو تیژو درندانە وەڵام دراوەتەوە. ئەوقات‌و قری یەی لەم ساڵانەی

دوایی دا یەخەی خەڵکی کوردستانی گرتووە، لەڕادەی ئاسایی خۆی تێپەڕی کردووە. دیارە ڕژێم دوو مەبەستی هەبوە:

* یەکێکیان: گەمارۆدانی ئابووری کوردستان‌و گوندو ناوچە ڕزگارکراوەکانە تا قورسایی یەکی ئابوریان بخاتە سەرو نەتوانن دابینکەری پێداویستیەکانی هێزی پێشمەرگە بن.
* دووەمشیان: بە مەبەستی ملپێکەچکردنی ئەو دانیشتوانەی لە ژێر رکێفی دەسەڵاتیدا بون، تا هەمیشە چاولەدەستی کاربەدەستە ئیداری، حیزبی‌و سوپاییەکانی بەعس بن بۆ وەرگرتنی ئاردو شەکروچا یا لە ناچاریا ببنە جاش‌و ئەمن‌و ئیستخبارات‌و...

جگە لەمە نەك هەرگوندەکانی کوردستان، بەڵکو شارو شارۆچکەکانیشی لەڕووی ئاوەدانی‌و جوانکاریەوە بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدا، زۆربەی شارو شارۆچکەکان:

* پێویستییان بە پرۆژەی ئاو هەبو.
* پێویستییان بە کارەبای هەمیشەیی هەبو.
* پێویستییان بە نوێکردنەوەی شارو شارۆچکەکان‌و بیناسازی هەبو.
* پێویستییان بە زێراب‌و نۆین بۆ پاك ڕاگرتنی شار هەبو.
* پێویستییان بە راکێشانی جادەی قیرتاوو چیمەنتۆکردن یا قیرتاوکردنی کۆڵان‌و شەقامەکان هەبو.
* پێویستی یان بە باخچەی گشتی‌و یانەو دایەنگەو باخچەی ساوایان هەبو.
* پێویستییان بە سینەمار شانۆ هەبو.
* پێویستییان بە کتێبخانەی گشتی هەبو.
* پێویستییان بەوە هەبو نەخۆشخانەو تیمارگەی تێدا بکرێتەوە یا ئەوەی هەبو پەرەی پێ بدرێت‌و داوودەرمانی باش‌و پسپۆڕو دکتۆری شارەزای بۆ بهێنرێت.
* پێویستییان بەوە هەبو قوتابخانەی زیاتری لێ بکرێتەوە یا پەرە بە قوتابخانەکان بدرایە.
* هەروەك پێویستییان بە پاس‌و ئۆتۆمۆبیل هەبو بۆ هاتوچۆی نێوان شوێنە نزیکەکان، نێوان گەڕەکەکانی شارەکە. بەڵام هەرکات ئەو داخوازی یانە ببرایەتە بەردەم لێپرسراوەکانی بەعس، بەچاوی گومان‌و دڕدۆنگییەوە سەیری

پێشنیارکەرەکانو داواکانیان دەکردو بـۆنی نـاڕەزا بوونیـان لێ دەکـرد. بۆیـە زۆربەی کات بە توندی بەرپەرچیان دەدانەوە.

لە ١٩٨٦/٥/٢٦ دانیشتوانی ناحیەی بنگردو ئۆردوگاکەی لـەپێناوی ئـاوو ئارددا راپەڕینێکیان ساز کرد، چونکە ماوەی ساڵێك بوو لێپرسراوە ئیداریەکانی بەعس پارەیان لە خەڵکەکە کۆکردبۆوە بـەو مەبەسـتەی گوایـا نیازیـان هەیـە پرۆژەی ئاویان بۆ بکەنەوە، کەچی ساڵێك زیاتری بەسەرا تێپەڕیبوو نـە پرۆژەیـان بینی نە پارەکەش، بۆیـە لـەو رۆژەدا دەسـتیان کـرد بەخۆپیشـاندانو نـاڕەزایی دەربڕین بۆ داواکردنی ئاوو ئارد. رژێمیش لـە وەڵامـی دواکانیانـدا لـە ٢٨/٥- ١٩٨٦/٦/٢دا ناحیـــەی بنگـــردو ئۆردوگاکـــەیو گونـــدەکانی دەوروبـــەری ئۆردوگاکەی تەختو کاول کرد، کە هەر هەموویان ١٠٧١ خێزانی تێدا بوو.

ج- راگواستن بەهۆی بەستی ئاسکی موسڵەوە:

مەبەست لە کردنی ئەو پرۆژەیە راگواستنی زیاتری گونـدەکانی کوردسـتانو کۆکردنەوەی ئاوی دیجلە بوو لەخاکی کوردستاندا تا لە کاتی پێویسـیدا سـودی لێ وەربگرن. ئەم پرۆژەیە لەساڵی ١٩٨٣دا کراوەو لەئەنجام دا ٨ گوند ژێـر ئـاو کراون کە ژمارەی خێزانەکانیان(٢٠٥) خێزانە.

## پوختەی بەشی دووەم

١- مەسەلەی ڕاگواستنی شارو گوندو لادێکانی کوردستان لەبەرنامەی سیاسی بەعس دا مەسەلەیەکی بنەڕەتی پێکدەهێنێ کە: هەڵکەندنی کـوردە لەسـەر خـاكو نیشـتیمانەکەیو دەربـەدەرکردنو پـەڕاوازە کردنـی، بـە مەبەسـتی نەهێشتنی ((مەترسی کورد)) لەسەر پاشـەڕۆژی عێـراق. راگواسـتنی کـورد گەلێ ناوچەی جیاجیای گرتۆتەوە:

- هەموو ئەو ناوچانەی بەتەوەرەی سـتراتیجی دادەنرێـت بـۆ پارێزگـاری کردنـی عێراق لەمەترسی یـەکانی دەرەوە: ئێـران، تورکیـا، سـوریا، کـە بۆتـە هـۆی ڕاگواستنو کۆچپێکردنی کورد لە هەموو قەزاکانی: خانەقین، مەندەلی، بەدرە، شنگار، تەلەعفەر، سمێل، بەشێکی زاخۆ. هەروەها هەموو ئـەو ناوچـانەی بـە تەوەرەی ستراتیجی دادەنرێن بۆ پارێزگاریکردنی عێراق لە مەترسی داهـاتووی کورد کە بۆتە هۆی راگواستنی بـە شـێك لەگونـدەکانی ناحیـەکانی: ئـاڵتون

کۆیری، قەرەهەنجیر، تازەخورماتو، هەروەها قەزای شێخانو بەشێك لە قەزای تلکێف. ژمارەی ئەو گوندانەی بەهۆی تەوەرە ستراتیجی یەکانەوە راگوێزراون، دەکاتە زیاتر لە ٥٩٣ گوند (کە لەو بەشەدا کۆکراونەتەوە)و ژمارەی خێزانەکانی تەنها ٣٢٠ گوندیان دەکاتە: ٢٢٥٢٩ خێزان.

- هەروەها هەزاران ماڵ لەشارەکانی کەرکوك، خانەقین، مەندەلی، شنگار، سمێل، شێخان، تەلەعفەر راگوێزرانو بە شارو ناوچەکانی تری عێراقو کوردستاندا پەرشو بلاّوکرانەوە، ئەویش بەهۆی راکێشانی جادەو رێگاوبان بەناو شارەکەدا، یا بەهۆی تێکدانی گەڕەکە گەلییەکانەوەو بەناوی سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی شارەکەوە، یا بەمەبەستی تر.
- زۆربەی ناوچە (نەوت)ییەکانی کوردستان بەر شالاّوی راگواستن کەوتونو دانیشتوانەکەشی کۆچپێکراون، ئەمەش بەپلەی یەکەم پارێزگای کەرکوك (قەزاکانی دوبزو کەرکوك)و قەزای کۆیەی گرتۆتەوەو زیاتر لە ٧١ گوند (کە لەو بەشەدا کۆکراوەتەوە) راگوێزراون کە ژمارەی خێزانەکانیان هی ٥٥ گوند: ٢٦٥٨ خێزانە.
- هەموو ئەو ناوچانەی جەنگی عێراق- ئێرانی لێ نزیك بوو، بەم بۆنەیەوە زیاتر لە ١٠٧ شارو ئۆردوگاو گوند راگوێزران کە ژمارەی خێزانەکانی ١٧٩٠٤ خێزانە.
- هەموو ئەو ناوچانەی لەقوڵایی کوردستاندایەو بەهۆی جەنگی کوردستانەوە کاول کراونو سیاسەتی بەسوتماککردنی خاکی کوردستان گرتویەتیەوە کە زیاتر لە ٢٢٠ گوندو شارە (بێجگە لەهی پارێزگای دهۆك)و ژمارەی خێزانەکانی ٩٠١٢ خێزانە.
- زیاتر لە٣٢ شارو ئۆردوگاو گوند بەهۆی جۆراوجۆرەوە راگوێزراون، کە ژمارەی خێزانەکانیان: ١٣٣٣ خێزانە. بەمجۆرە لەم لێکۆڵینەوەیەدا ١٨٩٥ گوندو شار بەر راگواستن کەوتون، کەژمارەی خێزانەکانی ١٤٧٦ گوندیان دەکاتە ٨٤٨٧٧ خێزان (جگە لە ٤١٩ گوند کە نەتوانراوە زانیاریان لەسەر کۆبکرێتەوە. بەشێك لە خانەقینو قەزاکانی: بەدرە، مەندەلی، شێخان، شنگار... ئەویش نەتوانراوە زانیاریان لەسەر کۆبکرێتەوە).
- هەروەها بەسەدان گوند لەژێر زەبری تۆپو بۆمباراندا چۆڵ کراون.

٢- ڕاگواستن، کۆچپێکردن، هەروەها تەسفیرکردنی کوردە فەیلییەکان بۆ ئێران بەمەبەستی تێکدانی نەخشەی دیمۆگرافیی عێراق و داڕشتنی ئەم وەزعەیە بە گۆڕەی بیرو بۆچونەکانی کاربەدەستان کە هەڵقوڵاوی گیانێکی شۆڤێنیانەو ڕەگەزپەرستانەیە.

٣- زیاتر لە ٣٦٦٨٤ کم[٢] لەخاکی کوردستان بەر شاڵاوی دڕندانەی (تەرحیل و تەهجیر) کەوتوە کە ٤٢,٦٦٪ی خاکی کوردستانی عێراق پێکدێنێ.

٤- ڕاگواستنی گوندو لادێکانی کوردستان بووە هۆی لاوازکردنی باری ئابووری لەکوردستانی عێراقدا، چونکە بووە هۆی سوتاندنی سەدان هەزار ڕەزو باخ و ملیۆنان سەر مەڕو بزن و ڕەشە وڵاخ و وڵاخە بەرزە (سامانی ئاژەڵی) و هەزاران پورە هەنگ لەبەین بران. دانیشتوانی ئەو گوندو ناوچانەشی لە هێزێکی بەرهەمهێنەوە کردە هێزێکی بەرخۆر.

٥- نەوتی کوردستان ڕۆڵێکی زۆری هەبووە لەوەی ڕژێم بەهێز بکات و یارمەتیی جێ بەجێ کردنی نەخشەو پلانەکانی بدات.

٦- گەلی کورد بۆ بەرگریکردن لەبوونی خۆی و هەڵوەشاندنەوەی نەخشەکانی ئەم سیاسەتە لەخەباتێکی بێ ڕچان و نەپساوەدابوەو شۆڕشی چەکداری، وەك تاکە ڕێگایەکی گونجاو، هەڵبژێردرا.

نەخشەی ژمارە (١٥)

ئەو ناوچانەی لە پارێزگای سلێمانیدا بەهۆی جەنگی عێراق-ئێران راگوێزراون



## نەخشەی ژمارە (١٦)

## ئەو ناوچانەی لە پارێزگای هەولێردا بەهۆی جەنگی عێراق-ئێران راگوێزراون



**نەخشەی ژمارە (١٧)**

**ئەو ناوچانەی لە پارێزگای هەولێر دا بەهۆی جەنگی کوردستانەوە ڕاگوێزراون**



## نەخشەی ژمارە (١٩)

## ئەو ناوچانەی لە پارێزگای تەئمیم دا بەهۆی جەنگی کوردستانەوە راگوێزراون

## نەخشەی ژمارە ( ٢٠ )

## ئەو ناوچانەی لە پارێزگای سەلاحەددین دا بەهۆی جەنگی کوردستانەوە راگوێزراون



## نەخشەی ژمارە ( ٢١ )

## ئەو ناوچانەی لە پارێزگای سلێمانی دا بەهۆی سەربازگەو بارودخانەو ڕا پەڕینی خەڵکەوە ڕاگوێزراون



## نەخشەی ژمارە ( ٢٢ )

## ناوچە ڕاگوێزراوە جۆراوجۆرەکانی کوردستان



## فەسلی یەکەم

## بەعەرەبکردنی کوردستان

### ٣- ١- ١: سیاسەتی تەعریبو مەترسی لەسەر کورستان

سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستانو کورد چوکلەیەکی تری سێ کوچکەی: تەحیلو تەعریبو تەبعیسە، کەڕوو لە هەڵلوشینی خاکی کوردستانو تواندنەوەی نەتەوەی کوردە، روو لەوەیە نیشتمانی کورد بکاتە خاکی مێژوویی عەرەبو بەشێکیش لەکورد بەعەرەب لەقەڵەم بدا، تا لە لایەکەوە چەند بۆی دەکرێو بۆی دەلوێ کوردستانی عێراق پارچە پارچە بکاتو بەعەرەبی بکا، لەلایەکی تریشەوە نەخشەی دیمۆگرافی کوردستانو عێراق بگۆڕێ بەوەی بەشێك لەنەتەوەی کورد بکاتە عەرەب.

سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستان هەر زادەی بیرو لێکدانەوەی بەعس نییە، سیاسەتێکی نوێو داهێنراوی دەستی کاربەدەستە بەعسیەکانی ئێستای عێراق نیە، بەڵکو سیاسەتێکی لەمێژینەی کاربەدەستە سیاسیو سوپاییەکانی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقو بگرە پێشتریشە. بەڵام بەعس جیا لەهەر رژێمێکی تری عێراق، لە روانگەیەکی ستراتیجیەوە بۆ مەسەلەی بەعەرەب کردنی کوردستانو کورد چووە ، هەمەلاییتر بیری لێ کردۆتەوە، هێڵە گشتی یەکانی جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتەی دارشتووە، توندوتیژترو درندانەتر، بەرفراوانترو هەراوتر جێبەجێیکردووە، جا لە رێگەی زەبروزەنگ و تەنگ پێ هەڵچنینەوە یاخود لە رێگەی فریودانو هەڵخەڵەتاندنەوە بوبێ.

بەعەرەب كردنی خاكی كوردستان لەبیری ستراتیجی بەعسدا شوێنێكی گرنگی هەیە، چونكە بەعس عێراق بە بەشێك لەنیشتمانی عەرەب دادەنێ، كوردیش بێ خاكو نیشتمانو بە میوانی ئەو خاكە. هەر بۆیە بە عەرەب كردنی كوردستان، بەلای بەعسەوە، كارێكی پێویستە بۆ ئەوەی عەرەب بتوانێ ئەو خاكەی گەلی كوردی لەسەرە، بخاتە ژێر دەسەلاتو قەڵەمڕەوی خۆی.

گەرچی مێژوو گەلێ نمونەمان دەربارەی هەوڵی تواندنەوەی نەتەوەو گەلانی دنیاو تەفروتونا كردنیان بۆ دەگێڕێتەوە، بەلام بەدەگمەن نمونەیەك دەبینینەوە كەنەتەوەیەك لەنەتەوەیەكی تردا توابێتەوەو خاسیەتە تایبەتیەكانی خۆی: لەزمانو كەلەپورو فەرهەنگ لەدەستدا بێ.

پێویستە ئێمە جیاوازی لەنێوان ((بەعەرەب بوون))و ((بەعەرەب كردن))دا بكەین، چونكە لە بنەڕەتەوە لەیەك جیانو دەربڕی دوو پرۆسەی جیاجیان. دیارە توانەوەی گەلانو نەتەوەكان لە بۆتەی یەكتری دا یا لەبۆتەی نەتەوەیەكی گەورەترو بالادەست تردا، لەڕووی تیۆرییەوە لەدوو ڕێگەوە دەبێ:

یەكەمیان: لەئەنجامی پرۆسەیەكی درێژخایەندا، لەئەنجامی كارلێكێكی بەردەوامی شارستانێتییەكی، مرۆیی، ئابووریدا بەشێوەیەك ئەو نەتەوەی خاوەنی شارستانێتی یەكی پێشكەوتوتر، گەشەكردوتر، بالاترە، دەتوانێ لەئەنجامی رەوتێكی درێژخایەنی مێژوویدا ئەو نەتەوەو كەمە نەتەوانەی لە چوارچێوەی دەسەلاتی سیاسیو قەڵەمڕەوكەی خۆیدایە، بەحكومی ئەو فاكتەرانەی سەرەوە، لەبۆتەی نەتەوەكەیدا بتوێنێتەوە بەجۆرێ ئەو نەتەوە یا كەمە نەتەوانەی لەو بۆتەیەدا تواونەتەوە، هەست بە چەوساندنەوە نەكەن، بەلكو شانازیش بكەن بەوەی لە نەتەوەیەكی پێشكەوتوتر، گەشەكردوتر، بەدەسەلات تردان. مێژووی گەلانی ئەورووپاو ئەمریكا ئەم راستیەمان بە باشی بۆ ساغ دەكاتەوە. ولایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ئەنجامی تێكەڵ بوونو لەناریەكان توانەوەی چەندین نەتەوەو گەلی جیاجیای ئەورووپایە، كە ئێستا كە هەر هەمویان شانازی بەوەوە دەكەن كە ئەمریكین. هەروەها گەلێ لە ولاتانی ئەورووپاش بەهەمان شێوە نەتەوەكانیان لەئەنجامی توانەوەی چەندین رەگەزو كەمە نەتەوەی تر پێك هاتوون، چونكە شارستانێتی پێشكەوتوی ئەو گەلانە توانای ئەوەی هەبووە هەموو ئەو توخمانەی لە دەرەوەی ئەو شارستانێتیەوە دێن، لەبۆتەی خۆیدا قال بكاتەوەو بیتوێنێتەوە.

بە هەمان شێوە عەرەب کە لەپێش پەیدابوونی ئایینی ئیسلامدا تەنها لەنیوە دورگەی عەرەبو خوارووی عێراق تا سنووری حللەو شام تا باکوری دیمەشق بوون، لە ئەنجامی پەیدابوونی ئیسلامدا توانیان گەلێ ناوچەو ولاّتی جیهان بگرن، هەر ئەو خاکەی ئێستا بەخاکی عەرەبو نیشتمانی عەرەب دەژمێردرێت، بەر لە پەیدابوونی ئیسلامەتی خاکی نەتەوەو گەلانی تر بوون، بەلاّم زۆربەی ئەم گەلو نەتەوانە لەئەنجامی کارلێکی مێژوویی-شارستانێتی دا، ئەگەرچی زەبروزەنگیشی لەگەلّ بوبێ، بون بە عەرەبو لە بۆتەی نەتەوەی عەرەب دا توانەوە. لەباشوری عێراق پاشماوەکانی سۆمەریو ئەکەدیو بابلی، لەسوریا فینیقیو لەمیسر قیبتیو لەباکوری ئەفریقاش دا بەربەرەکان هەر هەموو ئەوانە لەئەنجامی ئەو کارلێکەدا کە یا زۆرلەبۆتەی نەتەوەی عەرەب دا توانەوە، هەرچەندە تا ئێستاش قبتی یەکانی میسرو بەربەرەکانی باکوری ئەفریقا خۆیان بەعەرەب نازانن، بەلّکو خۆیان بەخاوەنی زمان، مێژوو، کەلەپورو فەرهەنگی تایبەتی خۆیان دەزانن، بەلاّم لەبەر هەر هۆیەك بووبێ، عەرەب ئەوکاتە نەیتوانی کۆمەلێ گەلو نەتەوەی تر لەبەین بەرێتو لەبۆتەی خۆیدا بیانتوێنێتەوە وەك:کورد، فارس، بەلووچ، ئەفغان، ئازەر.

دووەمیان:تواندنەوەی گەلو نەتەوە بچوکەکانە لەرێگای بەکارهێنانی زەبروزەنگ‌وگۆڕینی ڕاستیە مێژوویی، جوگرافییەکانەوە، مێژوو بە تەواوەتی ئەوەی سەلماندووە کە نەك گەلانی دواکەوتو لەڕووی شارستانێتیەوە نەینتوانیوە و ناشتوانن گەلان لەرێگای زەبروزەنگ و توندوتیژی یەوە بتوێننەوە، بەلّکو ئەو گەلو نەتەوانەی تا ئەندازەیەکی زۆریش خاوەن شارستانێتیەکی بالاّتر بوون لەو نەتەوانەی ویستویانە بیانتوێننەوە، نەیانتوانیوە ئەو گەلو نەتەوانە لە بۆتەی نەتەوەی خۆیاندا بتوێننەوە، چونکە بۆ تواندنەوەی ئەو نەتەوانە گەلێ فاکتەر پێویستن:

- دەبێ نەتەوە بالاّدەستەکە خاوەن شارستانیەتێکی بالاّ تربێ.
- هێزێکی مرۆیی زۆرترو ئابوورییەکی بەهێزتری هەبێ.
- قەناعەتێکی ئایدیۆلۆجیو سایکۆلۆجی لای نەتەوە بچوکەکان دروست ببێ کە توانەوەیان لەو نەتەوانەدا دەبێتە هۆی پێشکەوتنیان، پلەیەك بەرەو ژورتر دەچن، باریان باشتر دەبێ.

بـێ بـوونی ئـەو فاکتەرانـە، مەحاڵـە تواندنـەوەی نەتەوەیـەك لەبۆتـەی نەتەوەیـەکی تـردا روو بـدات، هەرچـەند بـوونی ئـەو فاکتەرانـە مانـای ئـەوە ناگەیەنێت کە پرۆسەی تواندنەوە کە روو دەدات، بەڵکو تەنها فاکتەری پێویستن، بەڵام کافی نین بۆ روودانی پرۆسەکە.

ئەگەر سەرنجێکی عێراق بدەین، ئەو راستیەمان بۆ روون دەبێتەوە کە هـەوڵی رژێمی بەعس بۆ گۆڕینی سـیمای کوردسـتانو بـە عـەرەب کردنـی هـەوڵێکی نەزۆكو پوچە، چونکە لەلایەکەوە عەرەب خاوەنی شارستانییەتێکی پێشـکەوتوو و بالاّ نین، ئەوانیش هەر لە ریزی گەلو نەتەوە دواکەوتوەکانی رۆژهەلاّتدان، جگە لەوەی رێژەی کورد لە عێراقدا کەزیاتر لە ١/٣ی دانیشتوانە، بەو ژمارە کەمەی عەرەبی عێراق قوت نادرێتو ناتوێتەوە.

رژێمی بەعس لەعێراقـدا، هـەروەها رژێمـەکانی پـێش بەعسـیش، چـونکە نەیانتوانیوە لەرێگەی کارلێکی شارستانێتی، مرۆیی، کورد نەك هەرلـە بۆتـەی نەتەوەی عەرەبدا بتوێننەوە، بەڵکو لەچوارچێوەی بـەعێراقی بـوونیش لـەقاڵبی بـدەن، بۆیـە هـەموو هـەوڵێکیان روو لەبـەکارهێنانی زەبـرو زەنـگ بـووە بـۆ جێبەجێکردنی نەخشەکانیان لەمەڕ بەعەرەبکردنی کوردستانو دانیشتوانەکەی.

سیاسەتی بەعەرەب کردنی کوردستان، بەپلەی سەرەکی، رووی لـەم شـوێنانە کردووە:

١- بەعەرەبکردنی ناوچە تێکەڵاوەکان: ئەو ناوچەو تخوبانـە دەگرێتـەوە، کـە دەکەوێتە سەر سـنووری هاوبەشـی کوردسـتانو ناوچـە عەرەبیـەکانی عێـراق، کەتیایدا کورد، تورکمان، عەرەب نیشتەجێن. ئـەم ناوچـانە هـەر هـەمووی بـە عەرەب کراوەو دانیشتوانە کوردەکەیشی دەرکراوە.

بەعەرەبکردنی ناوچە (نەوت)ییەکان: هەموو ئەو ناوچانەی چاڵگەی نەوتیان تێدایە، وا کراوە لەکورسـتان دابـڕێنو دانیشتوانەکەشـی پـەڕەوازەو دەربـەدەر بکرێن.

٢- بەعەرەبکردنی ناوچەکانی تەوەرە ستراتیجی یەکان: زۆربەی ئەو ناوچانەی کە بە تەوەرەی ستراتیجی دادەنرێن بۆ پاراستنی عێراق لە مەترسـیەکانی دەرەوەو ناوەوە، دوای کۆچپێکردنی دانیشتوانەکەی بەعـەرەب کـراون بـەو بیـانووەی کـە پاراستنی ئەو شوێنانە هەر بەعەرەب دەکرێـتو کـورد دەسـت لەگـەڵ دەوڵەتـە هاوسنوورەکانی عێراق تێکەڵ دەکاو جێگای بڕواو متمانە نین.

٣- گۆڕینی ناوی شارو گوندو کتێبخانەو قوتابخانەو جادەو شەقامەکان، هەروەها لوتکەی شاخ‌وگردۆلکەکان، ڕوبارو ئاوەکان، لەئەنجامی جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتەدا زیاتر لە ٤٢٤٨٨ کم[٢] لەخاکی کوردستانی عێراق بەر شالاوی بەعەرەبکردن کەوت، کە دەکاتە ٤١,٤٩٪ی گشت خاکی کوردستانی عێراق کە ٨٦ هەزار کم[٢] یە.

### ٣-١-٢: قۆناغەکانی بەعەرەبکردنی کوردستان

دیارە سیاسەتی بەعەرەبکردن، وەك سیاسەتێکی لەمێژینەی کاربەدەستانی عێراق، هەمیشە چونیەك‌و وەك یەك نەبووە، بەیەك هەنگاو جێبەجێ نەکراوە، جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتە پەیوەندی بەگەلێ فاکتەرەوە هەبوە، کەگرنگترینیان سروشی چینایەتی و فەلسەفەی تایبەتی حوکمڕانی چینە دەسەلاتدارەکان‌و ئیمکانیاتی ئابوری، سیاسی، سوپایی‌و مرۆیی دەوڵەتی عێراق‌و بەهێزی‌و لاوازی شۆڕشی کوردستان‌و بەهێزی‌و لاوازی دەوڵەتی عێراق بووە. هەر بۆیە ناشێ جۆرو چۆنیەتی بەعەرەبکردنی کوردستان لە قۆناغە جیاوازەکانی دا تێکەڵ بەیەکتر بکەین، بۆیە بەمەبەستی زانستی‌و مێژوویی بەسەر چەند قۆناغێکی جیاوازدا دابەشی دەکەین:

## نەخشەی ژمارە ( ٢٣ )

## قۆناغەکانی بەعەرەب کردنی کوردستان



**قوناغی یەکەم: ١٨٦٩ - ١٩١٤**

ئەم قۆناغە بەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق دەست پێ دەکا، لەو کاتەوە کە مەدحەت پاشای والیی بەغدا ویستی هەندێ ریفۆرم بکا کە یەکێ لەو ریفۆرمانە: نیشتەجێکردنی عەشیرەتە عەرەبەکانی عێراق بوو. عەشیرەتە کۆچەرە عەرەبەکانی عێراق لەپێناوی گەڕان بەدوای پوشو پاوانو لەوەڕگادا ئەو سنورەیان بەزاند، کە وەختی خۆی دەوڵەتی عوسمانی لەدوای داگیرکردنی کوردستانو عێراقی عەرەب کردبویە سنووری ویلایەتی شارەزورو سنورێکی سروشتی نێوان عەشیرەتەکانی عەرەبو عەشیرەتە کوردەکان بوو، واتە چیای حەمرین. هەر بۆیە چەندین عەشیرەتی عەرەبی جیاجیا (رەبیعە، بەنی ئەوس، جبور) دەشتەکانی مەندەلی - بەلەدروز قزلرباتو عەشیرەتەکانی (کرێو، لهێب) دەشتەکانی قەرەتەپەیان پڕ کرد. هەروەها خێڵە جیاجیاکانی بەیات (پیاووت)ی مەغۆلی تێکەڵ بوو بەعەشیرەتە عەرەبەکانو لەو دەشتانەدا نیشتەجێ بوون، کە دەکەوێتە نێوان کفری – توز هەتا ئاوە سپی (ئاق سو)، هەروەك عەشیرەتە عەرەبە جیاجیاکانی عوبێد لە زەوییەکانی حەویجە لەنێوان زێی بچوكو ئاوەسپی دا نیشتەجێ بوون. هەندێ لەخێڵەکانی عەشیرەتی تەیو جبوریش لەزەوییەکانی قەراج، لەباشوری مەخمور، لەنێوان هەردوو زێی گەورەو بچوکدا نیشتەجێ بوون، لەکاتێکا چەندین عەشیرەتو کۆچەری تری عەرەب بەدەشتەکانی دەورووبەری موسڵدا بلاوبونەوە وەك: تەی، شەمەر،[1]... ئەم عەشیرەتو خێڵانە چەندین گوندیان لە ناوچانەدا دروست کردو دەستیان گرت بەسەر زەویو زارو پوشو پاوانو لەوەڕگای عەشیرەتە کوردەکانی ئەم ناوچانەدا. دیارە ئەم قوناغە لەڕوی ناوەڕۆكو شێوەی بەعەرەبکردنی کوردستاندا جیاوازە لەقۆناغەکانی دواتر، چونکە بەعەرەب کردنی کوردستان، ئەو کاتە، لەسەر دەستی عەشیرەتە کۆچەرەکانو لە ئەنجامی دۆزینەوەی مەیدانی ژینی نوێ دا روی داوە، بەلاّم قۆناغەکانی دواتر رژێمە عەرەبەکانی عێراق بەپێی نەخشە جێبەجێیان کردوە.

---

[1] ـ بروانە: الروژبیانە، محمد جمیل الملا احمد: داقوق ((دقوقا)) فی التاریخ، مجلة المجمع العلمی العراقی – الهیئة الکردیة، المجلد العاشر، ص ٤٠٩، الحاشیة.

قۆناغی دووەم: ١٩٢٥-١٩٥٨

ئەم قۆناغە سەرتاسەری سەردەمی پاشایەتی عێراق دەگرێتەوە، لەو کاتەوە بۆ یەکەمین جار لە مێـژوودا دەوڵـەتێك بـەناوی عێراقـەوە دامـەزرێنراو لەسـاڵی ١٩٢٥یشدا کوردستانی باشوریان، بـەپێی نەخشـەیەکی ئیمپریالیسـتانە، پێـوە لکاند. چونکە دەوڵەتی تـازە دامـەزراوی عێـراق قوڵایـیەکی مێـژوویی نـەبوو، سوپایەکی بەهێزو مۆدێرن، ئیمکانیاتی ئابووری، مرۆیی لەبـەر دەسـت نـەبوو. بۆیە سیاسەتی بەعەرەبکردن لەم قۆناغەدا بەشێنەیی و لەسەرەخۆ، بەخشکەیی ئەنجم دراوە، هەندێ ناوچەی کەمی گرتۆتەوەو درێژەپێدانو تەواوکـەری قۆنـاغی یەکـەمی بەعـەرەبکردنی کوردسـتان بـووە. مەبەسـتی یەکـەمو سـەرەکی حکومەتەکانی ئەو سەردەمە جێگیرکردنو چەسـپاندنی بـیری عێراقچـێتی بـووە لەمێشکی کورددا، تا بەو دەوڵەتە تازەیەو ژیانی لەچوارچێوەیدا قایل بێت.

لەسیەکانی ئەم سەدەیەدا ناوچەی حەویجە عەشیەتی عەرەبی تری بۆ هێنـراو تەعریب کرا، عەشیەتەکانی حەمدانیو کلیبات لەو شوێنانەدا نیشتەجێ کران. ئەفسـەرە ناسیونالیسـتەکانی عـەرەب لەچـلەکانی ئـەم سـەدەیەدا ناوچـەکانی قەرەخان (جەلەولا) و مەندەلیو بەدرەیان بە عـەرەب کـردو چـەندین عەشـیەتی دواکەوتەی عەرەبیان لێ نیشتەجێ کرد. هەروەها بەشێك لە ناوچـەکانی موسـڵ بەر شاڵاوی بەعەرەبکردن کەوت. هەروەك ناوچەی قەراج زیاتر بە عـەرەب کـراو عەشیەتی (سنبس)یان بۆ هێنا لەگەڵ بەشێك لەعشیەتەکانی تر.

قۆناغی سێیەم: ١٩٥٨ - ١٩٦٣

ئەم قۆناغە ماوەیـەکی کـورت دەگرێتـەوە، لـەو کاتـەوە بـۆ یەکـەمین جـار لەمێژووی عێراق دا رژێمی کۆماری راگەیەنراو کۆتایی بەسـەردەمی پاشـایەتی هێنا تا ئەو کاتەی بۆ یەکەمین جار بـەعس هاتـە سـەر حـوکم. لـەو ماوەیـەدا دەوڵەتی عێراق لە دەستوری کاتی خۆیدا رایگەیاند کـە عێـراق خـاکی کـوردو عەرەبەو گەلی عێراق لەدوو نەتەوەی سەرەکی پێکدێت: کە عەرەبو کوردە. لەم قۆناغەدا جولانەوەی رزگاریی نیشتیمانیی کوردستان روو لە هەڵچونو بوژانـەوە بوو. روو لەبەهێزبوونو لە گەشەکردنو هەستانەوەو خورتبوون بوو. بـەڵام وێـڕای ئەمانە سیاسەتی بەعەرەبکردنی کوردستان تا ئەندازەیـەك بـەردەوام بـوو، لـەم

قۆناغە کورتەدا ئەو ناوچانەی دەکەونە نێوان زمار – شنگارو سنوری عێراق – سوریا تەعریب کراون خێڵو عەشیەتی عەرەبیان بۆ هێنرا.

قۆناغی چوارەم:١٩٦٣ – ١٩٨٧

پڕ مەترسیترین قۆناغە بەنیسبەت گەلی کوردەوە، چونکە لەم قۆناغەدا بەشێوەیەکی بەرفراوان، هەراوتر ئەم سیاسەتە جێبەجێکراوەو ئیمکانیاتێکی سوپایی، دارایی زۆریشی بۆ تەرخان کرا، بەلام لەبەر ئەوەی بەعس لە عێراقدا دوو جار هاتۆتە سەر کارو جڵەوی حوکمڕانی بەدەستەوە گرتووە، بۆیە ئەم قۆناغە دەکەینە دوو بەشە، قۆناغو خاسیەتەکانی هەر یەکێ لەم دوو بەشە قۆناغە بەجیا باس دەکەین.

- بەشە قۆناغی یەکەم ١٩٦٣

بەعس لە ١٩٦٣/٢/٨ لە ئەنجامی کودەتایەکی سوپایی خوێناوییدا جڵەوی حوکمڕانی گرتە دەس، هەر دوای گرتنە دەستی دەسەڵاتی سیاسی رژێمێکی خوێناوی دامەزاند، سیاسەتی تۆقاندنو کوشتو بڕو ئاگرو ئاسنی بەکارهێنا. دژی جوڵانەوەی رزگاریی نیشتمانیی کوردستانو شۆڕشەکەی چی لەدەست هات، کردی. بەدەیان گوندی کاولو تەخت کرد، سەدان کەسی لەتیکۆشەرو هاوڵاتییانی کورد لەناو شارو جادەو شەقامەکان کوشتو لەسێدارەدا، چەندین گوندو شاری کوردستانی بۆمباران کرد. بەهەمان شێوە دژی جوڵانەوەی دیموکراتیو شۆڕشگێڕانە عێراقیش درێخی نەکرد لە بەکارهێنانی هیچ جۆرە شێوازێك کە بە لایانەوە باشو پەسەندە. سەدان کەسیان لەسێدارەدا، بەندیخانەکانیان پڕ کرد، گشت حزبو رێکخراوە شۆڕشگێڕو نیشتمانپەروەرەکانیان لەکارخست. بەعس تەنها ٦ مانگ لەسەر حوکم مایەوە، نەیتوانی درێژە بە سیاسەتی دڕندانەو دژی مرۆیی خۆی بدا، بەعس ئەو کاتە حزبێك بوو کەخاوەنی تەجروبەو تاقی کردنەوە نەبوو، خاوەن ئیمکانیاتی ئابووریو سوپایی ئەو تۆ نەبو، نەیتوانیبوو جوڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی عێراق بەتەواوەتی تەنگ پێ هەڵبچنێو لەبەینی بەرێ، دەشیویست لەماوەیەکی کەمدا هەموو سیاسەتەکانی خۆی لەمەڕ دامرکاندنەوەی جوڵانەوەی ڕزگاریی نیشتمانی کوردستان جێبەجێبکا. بەعس لەو ماوە کەمەی دەسەڵاتیدا توانی گەلێ ناوچەی

کوردستان ڕاگوێزێت‌و بەعەرەب بکا، کەگرنگترینی ئەو ناوچانە کەرکوك بوو.
ئەم ناوچانەی خوارەوە لەسەردەمی دەسەڵاتی یەکەمی بەعسدا بەعەرەب کراون:

*لەقەزای دوبز

گوندەکانی: قەرەدەرە، عەمشە، مەڕعی، قوشقایە، قەڵاعەریەت، هەنجیەی بچوك، قوتانی خەلیفە، قوتانی کوردەکان، سێکانیان، شۆڕاو، باجوان، گورگە چاڵ، شێخان، نادراوا، دڕکەی کوردان، غەڵاغێر، مامە، شیرناو، تەقتەق، کونە ڕێوی، چەخماخە، مەڵحە،... هەموو ئەو گوندانە لەساڵی ١٩٦٣ سوتێنراون‌و ڕووخێنراون‌و بەعەرەب کراون.

*لەناحیەی سەرگەڕان (جاران سەر بەهەولێر بوو ئێستا سەر بە قەزای دوبزی کەرکوکەو ناونراوە قودس) گوندەکانی جاستان، دەربەند، سەربەشاخ، بەرکانە، عەوڵاقات، سارەلو، شناغە، دڕکەی گەورە، دڕکەی گچکە، چەرت، گێسمە، تەل هەلالە، گەزوەشان، گەڕاو..بەعەرەبکران‌و عەشیەتی بەدوی عەرەبیان بۆ هێنا کە سەرۆکەکەیان ناوی عەواس سەدید بوو.

* لەقەزای مەخمور (ناحیەی کەندیناوا) گوندەکانی: خدرجە، گاوەرە، کەندال، دارەخورما، حاجی شێخان، لاوەر، لەهەمان ساڵدا بەعەرەبکراون‌و بەدویان بۆ هێنا. بەڵام دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس دانیشتوانی دەرکراوو ڕاگوێزراوی ئەو ناچەو گوندانە گەڕانەوە سەر جێگاو ڕێگەی خۆیان‌و سیاسەتی بەعەرەب کردنی ئەم ناوچەیە هەڵوەشایەوە.

- بەعس لە ١٩٦٨/٧/١٧دا، بۆ جاری دووەم دەسەڵاتی سیاسی لە عێراقدا گرتەوە دەست، بەعس کە لە قۆناغی یەکەمی حوکمڕانی خۆیدا تەجروبەو تاقیکردنەوەی هەڵێنجا بوو، بەشێوەو شێوازێکی ترەوە هاتەوە ناو گۆڕەپانی ململانێی سیاسی‌و چەکدارانە لەعێراقدا. ئەم بەشە قۆناغە جیاوازیەکی بنەڕەتی لەگەڵ بەشە قۆناغەکەی پێشوترو، سەرجەم قۆناغەکانی تردا هەیە. نەك لەبەر ئەوەی بەعس وازی لەسیاسەت‌و بیرو بۆچونەکانی لەنەخشەو پلانەکانی هێنابێ، بەڵکو لەڕووی ئەو شێوازانەی لەم بەشە قۆناغەدا بەکاری هێناون، بەتایبەتی بەعەرەبکردنی کوردستان‌و کوردو ئەو مەترسیە زۆرەی خستویەتیە سەر نەتەوەی کورد کە هەڕەشە لەبوون‌و مانی دەکاو ڕوو لەتواندنەوەیەتی. دەشێ بەشە قۆناغی دووەم بەگوێرەی چەند فاکتەرێك

بکەینە چەند ماوەیەك، کەگرنگترینی ئەو فاکتەرانە: چەسپاندنی دەسەلاتی ڕژێم، بەهێز بوونو لاوازبوونی جولاتەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستانی عێراقە.

* ماوەی یەکەم: تەموزی ١٩٦٨-ئازاری ١٩٧٠ لەم ماوەیەدا هێشتا بەعس لە گێژەنگی ڕووداوەکانی ئەوسای عێراق ڕزگاری نەبوو بوو، کێشەی کورد وەك یەکێك لەکێشە سەرەکیەکانی عێراق ڕووبەڕووی دەسەلاتی تازەی بەعس ببۆوە، ((مەترسی))ی شیعەو حزبەو ڕێکخراوەکانیان هەر لەزیادبووندا بوون، جولانەوەی دیموکراتیو شۆڕشگێڕانەی عێراق دانەمرکابۆوە، بەلکو هەر لە کلپەو بلێسەدا بوو، بەعس نەیتوانی بوو خۆی بەتەواوەتی جێگیر بکات، نەیتوانی بوو سوپای عێراق لە ناحەزانی خۆی پاك بکاتەوە، جگە لەوە ڕووبەڕووی ئابووریەکی داتەپیوو لاوازی عێراقیش بوو بوو. بۆیە ئەم ماوەیە وای دەخواست هەنگاوەکانی بەعس روو لەزیاتر جێگیرکردنو چەسپاندنی دەسەلاتی خۆی بێ، روو لەچارەسەرکردنێکی تاکتیکیو کاتی شۆڕشی کوردو مەسەلەی کورد بێ، روو لەتەخت کردنی ناحەزو نەیارەکانی ناو سوپاو دامو دەزگا گرنگەکانی دەولەت بێ تابتوانێ ئاسانترو لە بارودۆخێکی هێمنانەتردا نەخشەو پلانە ستراتیجی یەکانی خۆی لەمەڕ ناوچەکەو کوردستان دابڕێژێتەوەو هێلە گشتییەکانی دیاری بکا.

* ماوەی دووەم: ئازاری ١٩٧٠- ئازاری ١٩٧٥

ڕژێمی بەعس لەئەنجامی ئەو گوشارە سیاسیو ئابووری...هتد کە لەسەری بوو لەپێناوی دەربازبوون لەو گێژەنگەی تێیدا بوو، بۆ ئەوەی زیاتر بپەرژێتە سەر جێبەجێکردنی نەخشەکانی خۆی، ناچار هەندێ ریفۆرمی کرد، تا وەك هەر ڕژێمێکی فاشی بتوانێ بنکەیەکی ئابووری – کۆمەلایەتی بۆ خۆی ساز بکاو رای گشتی ناوەوەو دەرەوەش بەلای خۆیدا راکێشێ.

- بەعس ناچار بوو لە ١٩٧٠/٣/١١دا دان بەهەندێ مافی نەتەوەیی گەلی کوردا بنێ، تا بتوانێ بەشێوەیەکی کاتی مەسەلەی کورد هێور بکاتەوە.
- لەگەلّ حزبی شیوعی عێراقدا رێککەوتو بەرەیەکیان بەناوی ((بەرەی نیشتیمانیو نەتەوەیی پێشکەوتنخواز)) وە دروست کرد، تا بەهۆیەوە بتوانێت نارەزایەکانی یەکانی ناوخۆو ئۆپۆزسیۆن بەرە بەرە لەبەین بەرێ.

- هەستا بە خۆماڵیکردنی کۆمپانیای نەوتی کەرکوك(ڕاستتر بوترێ بە بەعسیکردنی کۆمپانیاکە)تا بتوانێ دەرامەتێکی باش کۆ بکاتەوە کە بەهۆیەوە بتوانێ لەشکرێکی مۆدێرنو چەکدار بە نوێترین چەك پێکەوە بنێ بۆ ئەوەی لەداهاتودا لەعۆدەی شۆڕشی کوردستان بێ.
- توانی لەم ماوەیەدا بەشێك لە ئەفسەرە پایە بەرزە نەیارەکانی لەناو سوپادا نەهێڵێتو خانەنیشینیان بکا یا بیانکوژێ.

لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا ڕێککەوتو پەیمانێکی دۆستایەتیو هاوکاری فرەلایەنەی لەگەڵدا مۆر کرد.

- دانی بە کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی دا نا، پەیوەندی لەگەڵ وڵاتە سۆسیالیستەکان باش کرد.
- پەیوەندی لەگەڵ گەلێ ڕێکخراوو جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی لە دنیادا بەست. هەر هەموو ئەمانەی لەپێناوی ئەوەدا کرد کە ڕای گشتی جیهانو ناوچەکەو ناوخۆ بەشێوەیەك بگۆڕێ، جوتو یەکانگیر بێ لەگەڵ نەخشە ستراتیجییەکانی داهاتویدا، تا زەمینەیەکی لەبار بۆ جێبەجێکردنیان ساز بکا، بەعس لەئەنجامی ئەو دەرامەتە زۆرەی نەوت دا توانی توێژێکی کۆمەڵایەتی وا لەعێراق دا پێکەوە بنێ کە ببێتە بنکەی ئابووری — کۆمەڵایەتی ڕژێمەکەی، بەعس توانی سوپایەکی زۆرو چەکدارکراو بە نوێترین جۆری چەك پێکەوە بنێ، مەشقی پێ بکاتو سازی بدات بۆ جەنگەکانی داهاتوی، بەعس توانی لەئەنجامی چەواشەکردنی بیروڕای چەندین حیزبو ڕێکخراوی پێشکەوتنخوازی عێراقو دەرەوە، سەرلەنوێ زەمینەی پەلاماردانی جوڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی عێراقو بەتایبەتیش جوڵانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان ساز بکات.
- هێشتا چەند مانگێك بەسەر بەیاننامەکەی ئازاردا تێ نەپەڕیبوو، کە دەستی کرد بەعەرەبکردنی شاری کەرکوكو هێنانی عەشایری عەرەبی خواروی عێراق.
- لەساڵی ١٩٧٢دا دیسان گەڕەکێکی تری تەعریبی لەناو شاری کەرکوکدا دروست کرد. هەروەها لەهەمان ساڵدا کەوتە هاندانو یارمەتیدانی چەند دەرەبەگێکی عەرەب بۆ ئەوەی لەدەوروبەری کەرکوك زەویو زاری جوتیارو موڵکدارانی کورد بکڕن، لەهەمانکاتدا کەوتە هاندانی دەرەبەگە کوردەکانی ئەو ناوچانە بۆ ئەوەی زەویو زاریان بەو عەرەبانە بفرۆشن. لەئەنجامدا سەدان خێزانی کورد لەناوچەی داودەو کاکەیی دەربەدەر کرانو عەرەبنشین کران،

لەوانە گوندی: حەشیشە، دڵسی گەورە، دڵسی بچوك، ڕەبعـاوا، كـۆمبز، گـرد رابیعە، سێكانی، كەراكرە، كەرعیە، سەی محەمـەد، عەتشـانە، تـەل مـەغار، ئەرغوون، پەنجا عەلیو هەفت تەغار.

- لە ساڵی ١٩٦٣دا بە یەكجار(١١٨) كرێكاری كـوردی لـەكۆمپانیای نـەوتی كـەركوك دەركـردو لـەجیاتی ئـەوان كرێكـاری نەشـارەزای عـەرەبی هێنـاو لەكەركوك دا نیشتەجێیكردن.
- لەهەمان ساڵدا كەوتە بەعەرەبكردنی ناو شاری (شنگار)و گەڵێ كێشەو گێرو گرفتی دروست كرد.
- لەنێوان ساڵەكانی ١٩٧٠- ١٩٧٥ بەدەیان هەزار كوردی لەشارەكانی بەغـدا، بەسرە، خانەقین، مەنـدەلی، بـەدرەو ناوچـە جیاجیاكـانی كوردسـتانو عێـراق دەركردو (تەسفیر)ی ئێرانی كردن بەو بیانووەی كە ئێـرانینو مەترسـی لەسـەر ئەمنی ستراتیجی عێراق دروست دەكەن.
- هـەروەها ئـازاردانو ئەشـكەنجەدانی كـوردو شۆڕشـگێڕانی تـری عێـراق لەزیندانی(قصر النهایـة) بۆتـە پەڵەیـەكی ڕەش بـە ناوچـەوانی بەعسـەوە، كەهەرگیز سپی بونەوەی بۆ نییە.
- لەسـاڵی ١٩٧٤دا دوای زەمینـە سـازكردنی جـەنگو پێداویسـتیەكانی، جەنگێكی كاولكارو دڕندانەی بەگەلی كـورد فرۆشـتەوە، بـەم جـۆرە كەوتـەوە كاولكردنو و وێـران كردنـی كوردسـتانو بـە تـۆپو فڕۆكـە زۆبـەی گونـدو شارەكانی كوردستانی بۆمباران كـرد لەژێرپـەردەی دان نـان بـەمافی كـوردو یاسای ئۆتۆنۆمیـدا. بـەعس لـەم ماوەیـەدا لـەجیاتی نكـۆڵیكردن لـەكوردو مەسەلە ڕەواكەی تاكتیكی دانـان بـەو مەسـەلەیەو چـارەكردنی گرتـە بـەر، لەجیاتی ئەوەی نكۆڵی لەبوونی كورد بكـا، یاسـایەكی سـاختەی دەركـرد تـا لـەژێر پـەردەی ئـەو یاسـایەدا بتوانـێ باشـترو زیـاتر نەخشـەكانی لەمـەڕ تەعریبكردنی كوردستانو كاولكردنی بگرێتەبەر.

ماوەی سێیەم ئازاری ١٩٧٥ — كۆتایی ١٩٨٦ (هەربەردەوامە)

ڕژێمی بەعس كاتـێ بـۆی دەركـەوت ناتوانـێ لـەرووی سـوپاییەوە شكسـت بەشۆڕشی كورد بێنی، كەوتە هەوڵدان بۆ ڕێككـەوتن لەگـەڵ شـای ئێرانـدا تـا بتوانێ شۆڕشی كورد تێك بشكێنێو تووشی شكسـتی سیاسـیو پێشـمەرگەیی

بکا، هەر بۆیە دوای وازهێنان لەمافەکانی عێراق لە( شط العرب)و کەنداو، لە ٦/٣/١٩٧٥دا رێککەوتننامەیەکی لەگەڵ ئێراندا مۆر کرد کە ناسراوە بە رێککەوتننامەی شا- صدام یا رێککەوتننامەی جەزائیر. بەجۆرە لە ئەنجامی ئەو رێککەوتنەدا شۆڕشی کورد تووشی شکستێکی سیاسیو پێشمەرگەیی گەورە بوو و بۆ ماوەیەکی کورت ئاشبەتاڵی بەهێزەکانی کرد، لەئەنجامی ئەوەدا تەرازووی هێزەکانی بەقازانجی بەعسو بەزەرەری کوردو جوڵانەوەکەی خۆی لەمەڕ بەعەرەبکردنو راگواستنی کوردستان جێ بەجێ بکاو گەلی کورد بتوێنێتەوە. لەم ماوەیەدا:

- هەزاران گوندی سەر سنوورو قوڵایی کوردستان کاولکرانو دانیشتوانەکەی راگوێزران.
- ناوچە گرنگەکانی کوردستان بەر شاڵاوێکی بەر فراوانی بە عەرەبکردن کەوتن لەوانە:
  * ناوچەکانی تەوەرە ستراتیجییەکان.
  * ناوچە (نەوت)ییەکانی کوردستان.
  * شارە گرنگو ناودارەکانی کوردستان.
  * ناوچەکانی تەماس.
- دیسانەوە دەیان هەزار خێزانی تری کوردیان تەسفیر کردەوە بۆ ئێران بەبیانووی ئێرانی بوونەوە.

### ٣- ١- ٣: نشینگەکانی تەعریب لەکوردستانی عێراقدا

نیشتەجێکردنی عەرەب، یا سیاسەتی (استیطانی)ی بەعس، شێوازی سەرەکی بە عەرەبکردنی کوردستانو داگیرکردنی خاکەکەیەتی، کەهەر لەسەرەتاوە بەعس بیری لێ کردۆتەوەو رەنگی بۆ رشتووەو هەر کاتێکیش دەرفەتی جێبەجێکردنی بوبێ، جێ بەجێ کردووە. ئەو نشینگانەی بەعس لەکوردستاندا دروستی کردوون، دوو شێوە یا دوو جۆرن:

١- راگواستنی کورد لە گوندو لادێکانی ناوچەیەکداو روخاندنو کاولکردنی گوندەکان، ئەوجا دروست کردنی نشینگەی نوێ، بەشێوەو شێوازی نوێ لەچەند شوێنێکی دیاریکراوی ناوچەکەدا کەبایەخی ستراتیجی هەبێ.

٢- کۆچ پێکردنی کوردەکان لەگوندو لادێکانیاندا و هێنانی عەرەب بۆ شوێنەکانیان و نیشتەجێ کردنیان لەخانووبەرەی جوتیارە کوردەکاندا (دواییش نوێ کردنەوەی خانووەکان) و گۆڕینی ناوی گوندەکە بەهی عەرەبی. ئەرك و ڕۆڵی ئەو نشینگانەی بەعس لەکوردستاندا دروستی کردوون فرە لایەنە، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

* چەکدارکردنیان بەمەبەستی پاراستنی شوێنە گرنگ و ستراتیجییەکان، پاراستنی دامەزراوە نەوتی و پەترۆڵییەکان و دام و دەزگاو بەرژەوەندیەکانی تری دەوڵەت.

* دەستگرتن بەسەر سەرچاوەی ئاو و زەوی‌وزاری کشتوکاڵی فراواندا، بۆ ئەوەی سەرچاوەکانی ژیان بۆ ئەو عەشیرەتە عەرەبانەی نیشتەجێیان دەکەن، پەیدا بکەن.

*جاسوسیکردن بەسەر دانیشتوانی ناوچەکەوەو ڕێگەگرتن لەچالاکی پێشمەرگەو گەشەکردنی شۆڕش لەو ناوچانەدا، واتە: دروستکردنی لەمپەرێکی مرۆیی لەبەردەم گەشەکردن و فراوانبوونی شۆڕش لەناوچەکانی تردا، بەتایبەتی ناوچە دەشتاییەکان و ئەو ناوچانەی لە ناوچەی عەرەب نشینەکانەوە نزیکن.

*گۆڕینی سیمای ناوچەکە بەتێکدانی باری ئیتنۆگرافی و دیمۆگرافی ناوچەکە. بەراوردکردنی ئەو نشینگانەی بەعس لەکوردستاندا دروستی کردوون لەگەڵ ئەو نشینگانەی ئیسرائیل لەخاکی عەرەبی فەلەستیندا دروستی کردوون، کلۆڵی و دواکەوتویی ڕژێمی بەعس و پوچەڵبوونەوەی حەتمی ئەو سیاسەتە دڵنیا دەکاتەوە. لەکاتێکدا (مستوطنات)ە کانی ئیسرائیل: کیبوتزو موشاف بەپێشکەوتوترین (مستوطنة) دەژمێردرێت لەڕووی بەرهەمهێنان و بوارەکانی تری کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، زانستیدا کە بوونەتە یەکەیەکی بەرهەمهێنانی ئابووری ئیسرائیل، ئەوا ئەو (مستوطنات)ە تەعریبیانەی لە کوردستان دا ڕۆنراون لەبواری بەرهەمهێناندا هیچ ڕۆڵێکیان نییە، بگرە بونەتە هۆی دواکەوتنی باری ئابووری عێراق لەڕووی بەرهەمهێنانی بژێوو.. هتدەوە. لەگەڵ ئەوەش دا ئەو عەرەبانەی هێنراونەتە کوردستان، کە لەدواکەوتوترین عەشیرەت و توێژەکانی کۆمەڵی عەرەبی عێراقن و هیچ پاڵنەرێکی ئایدیۆلۆجی گرنگیان نیە بۆ بە عەرەبکردنی کوردستان، لەگەڵ ناوچەی ئاودارو خاوەن زەوی و زاری بەرفراواندا نیشتەجێ کراون، بەلام تا ئێستا نەیانتوانیوە ئەو

زەویانە ڕەنێو بهێنن، بەڵکو سەر لەنوێ بەکرێ دەیدەنەوە بەو کوردانەی کەخاوەنی ئەسڵی ئەو زەویانەن‌و خۆشیان لەبەری ڕەنج‌و ماندوبوونی جوتیارە کوردەکان ژیانی خۆیان فەراهەم دەکەن، جگە لەو پارەو پولەی ڕژێم بۆ درێژەدانی سیاسەتەکەی دەیانداتێ، هەروەك لەپێشدا باسکرا، گەلێ ناوچەی کوردستان بەر شاڵاوی بەعەرەبکردن کەوتووە، کە ئێمە بە پێی پارێزگاکان دابەشیان دەکەین:

## ١- ناوچە (نەوت)ییە بەعەرەب کراوەکان

گرنگترین ناوچەی (نەوت)ییەکان لەکوردستانی عێراقدا: کەرکوکە، بۆیە هەر لەسەرەتاوە جێی سەرنجی داگیرکەرانی کوردستان بووە لەپێناوی هەڵلوشینی سەروەت‌و سامانەکەیداو بەعەرەب کردنی ناوچەکە. دیارە گرنگترین شوێنیش لە پارێزگاکەدا شاری کەرکوکە کە دەمێکە کەوتۆتە بەر شاڵاوی دڕندانەی بەعەرەبکردن‌و گۆڕینی سیمای، شارەکەو سڕینەوەی شوێنەواری کوردەواری تێیدا.

١- بەعەرەب کردنی شاری کەرکوك[2]

ڕژێمی بەعس لەساڵی ١٩٧٠وە دەستی کردووەبە عەرەبکردنی شاری کەرکوك، لەسەرەتادا نەخشەی (حي الكرامة) یان کێشاو زۆر بەزوویی جێبەجێیان کرد، بەجارێك (٦٠٠) خانوویان لەجێگایەکی گرنگ‌و ستراتیجیدا دروست کرد، کە باکوری ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوك-سلێمانیدا، ئەوەی لەسەرووی (حي الكرامة)وەیە. لەساڵی ١٩٧١ یشدا لەدووری یەك کیلۆمەتر لە (حي الكرامة)وە، بەلای باکورو لەنێوان گەڕەکی ئیسیکانی کۆن‌و ئازادیدا نەخشەی (حي المثنى)یان کێشا کە (٥٠٠) خانوو بوو، لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٢و سەرەتای ١٩٧٣دا نەخشەکە جێبەجێکرا. بارودخانە بەناوبانگەکەی شاری کەرکوکیش تەنیا ٣ کم لەم (مستوطنة)یە دوورە. لەنێوان (حي الكرامة)و (حي المثنى)دا زیاتر لە (٢٠٠) پارچە زەوییان لەساڵی ١٩٨٠- ١٩٨١وە بەناوی شەهیدانی

---

[2]- بۆ زیاتر شارەزابوون دەربارەی بەعەرەب کردنی کەرکوك، بڕوانە:

* یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، دەزگای: کەرکوك‌و سیاسەتی تەعریب، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، ئازاری ١٩٨٥.

* کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان، دەزگای لێکۆڵینەوەی زانستی: سیاسەتی بەعەرەب کردنی کەرکوك، ١٩٨١.

قادسیەی سەدامەوە بەسەر عەرەبەکاندا دابەش کرد، کە تـا ئێستـا هـەموویان کراون بەخانو. لەبەرامبـەر رەحیماواشـدا کەئیستـا ناویـان نـاوە(حی الانـدلس مستـوطنة)یەکیان بۆ کرێکارە عەرەبەکانی کارگەی کۆکا کۆلا دروست کـردووە. لەلای کەرکوکی نـوێش کـە دەکەوێتـە رۆژئـاوای شـارەوە، پـڕۆژەی (دوو هـەزار خانوو)و (چوار هەزار خانوو) دەستی پێ کردوە کە یەکەمیان لەساڵی ١٩٧٩ دا دەستی پێ کراوەو لەلایـەن کۆمپانیایـەکی بیانیـەوە بـەجێ هێنـراوە. لەوبـەری عەرەفەوە، واتە بەلای باشووری رۆژئـاواوە، جـادەی کـەرکوك- دوبـز دەسـت پـێ دەکات، بەوبەری جادەکەوە بارەگاکانی فرقەی دوو، فەیلەقی یەك، فڕۆکەخانەیـە کە بەرەو باشوری کەرکوك دادەکشێ. جا لەم بـەرو ئەوبـەری جـادەی کـەرکوك- دوبز، زیاتر لە (١٠٠٠) خانوو دروست کراوە بۆ کرێکـارانی کارگـەکانی غـازو کبریت، پاڵاوتنی نەوت، کەپێ یان ئەوترێت (خانووەکانی عەمەل شەعبی)، ئـەو کرێکارە عەرەبانەیان تێدا نیشتەجێ کراوە، کە لە شوێنی کرێکارە کـوردە نـەقل کراوەکـان تـەعین کـراون لـەو کارگانـەدا. هەرلەسـەر هـەمان جـادە کۆمەڵـە خانووێکی تر بەناوی (حي الضبـاط) لەبەردەم ئۆردوگا سەربازیەکەی کـەرکوك‌و گۆڕەپـانی فڕۆکەخانـەوە دروسـت کـراوە بەشـێوەیەکی کەوانـەیی بـەرەو هێڵـی شـەمەندەفەر درێـژ دەبێتـەوە تـا دەگاتـە ئاسـتی (محطة کـەرکوك). تەنانـەت لەنێوان(باب النظـام)ی فڕۆکەخانەو (بـاب النظـام)ی فرقـەی دوو، ئـەو ماڵاتـە تێکەڵی ئۆردوگا دەبن‌و سنووریان لەبەیندا نەماوە کە ژمارەی ماڵەکانیش زیاترە لە(٥٠٠) خانوو. لەنێوان ئۆردوگـای کـەرکوك‌و (محطـة) ی شـەمەندەفەرەوە تـا دەگاتە تسعینی کۆن‌و جادەی تکریت، ئینجا بەرەو جـادەی کـەرکوك – بەغـداو ئیستگەی تەلەفزیۆن، لەوێشەوە بەرەو خاسە چەندین (مستـوطنة)ی تـر دروسـت کراون، کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

زیاتر لە (٨٠٠) خانوو لەتسعینی کۆن بەناوی (حي البعث) دروست کـراوەو عەرەبی لێ نیشتەجێ کراوە. لەنێوان جادەی بەغدا – تکریت، بەر لەوەی بگەیتە ئیستگەی تەلەفزیۆن، زیاتر لە (١٥٠٠) خانوو بەناوی (حي الواسطي) دروسـت کراوە. هەر لەهەمـان ناوچەدا زیاتر لە(٤٥٠) خانوو بەناوی (دور السکك) لەوێ دروست کراوە. لەسەر جادەی بەغدایش زیاتر لە (١٠٠) خانوویان دروست کردووە بەناوی (حي الاشـتراکیة) وە، بەدەسـتە چـەپی جـادەی بەغـدا، لـەنێوان جـادەو خاسەدا زیاتر لە (١٦٠٠) خانوویان بەناوی (حي غرناطـة)وە دروسـت کـردووەو

بەرەو تسعینی تازە هەڵدەکشێت، لەودیو خاسەشدا، واتــە لەئاســتی ئیســتگەی تەلەفزیۆن و لەباشووری شارەکەوە بەرەو مەمدودەو مەجزەرە (قەسابخانەی تازە) تا دەگاتە رێگای لەیلان – شۆریجە، چەندین (مســتوطنة)ی جۆربــەجۆرو فراوانیــان دروست کردوەو نەخشەی چەندین پرۆژەشیان رشتووە، ئەو (مستوطنة)انــە بــەرەو باشووری رۆژهەڵات درێژ دەبنەوە تا دەگەنە نزیکی (حي الكرامة)، ئــەو گەڕەکــە عەرەبنشینانەش بریتین لەمانەی خوارەوە:

لەسەر جادەی لەیلان زیاتر لە (۱۰۰۰) خانوویان بە ناوی (حــي الحجــاج)ەوە دروست کردووە.

* لەنێوان قەسابخانەی تازەو (حي الحجــاج)دا (۱۵۰۰) خانوویــان بــەناوی (حــي العروبة)وە دروست کردوە.
* هەر لەهەمان ناوچەداو لەسەروی (حي الحجاج)ەوە (۳۰۰) خانوویــان بــەناوی (حي الوحدة)وە دروست کردوە.
* بەرامبەر بە (حي الوحدة)و سەیتەرەی لەیلان(۱۵۰) خانوویان بــەناوی (حــي الحرية)وە دروست کردوە.
* ئینجا لە (حي الحرية)ەوە بەرەو شۆرجە (۲۲۰) مــاڵی عەرەبنشــین هــەن کــە هەموو پیاوەکانیان ئەمنن، بۆیە ئەو خانوانەیان ناوناوە بە (دور الامن).
* لە (دور الامن)ەوە بەرەو خوارتر (۱۰۰) خانوو بــەناوی (دور ضــباط الصــف) دروست کراوە، بەردەمی ئەم کۆمەڵــە خــانووەش خەیمــەی تایبــەتی هەیــە بــۆ پارێزگاریکردنیان.
* لەبەرامبەر (دور الامن) و (دور ضباط الصف) بەرەو خوار (۷۵۰) خانویــان دروست کردووە بەناوی (حي قتيبة).
* لە (حي قتيبة)ش بەرەو خوارەوە (حي الشرطة) دەست پێ دەکا، کــە ژمــارەی خانووەکانی (۱۰۰۰) خانووە.
* لەهاوینی ۱۹۸۱ دا وەك وەجبەی یەکەم لەپشت سەیتەرەکەی لەیلانەوە زیــاتر لە (۸۰۰۰) پارچە زەوی یان بەسەر عەرەبە تــازە هاتووەکانــدا دابــەش کــرد، لەپاڵ یارمەتی دانێکی ۱۹ هەزار دیناردا، واتە ۱۰ هــەزار دینــار مەغــەو ٦ هەزار دینار عەقاریو ۳ هەزار دینــاریش بــۆ دروســتکردنی ژێــر زەمــین. لــە وەجبەی دووەمیشدا (۲۵۰۰۰) پارچە زەوی تریان دابەش کــرد، کــە ئەمــەیان درێژی ۱۸ کم دەگرێتەوە تا دەگاتە ناحیەی لەیلان. سەرباری دروستکردنی ئەو

هەموو (مستوطناتانة) و عەرەبنشینکردنی، چەندین نەخشەو پڕۆژەی تریان لەناو جەرگەی شارەکەدا، بەتایبەتی لەناو گەڕەکە کوردەکاندا جێ بەجێ کردووە. لەنێوان موسەڵلاو قەسابخانەی کۆندا (٤٠٠) شوقەیان بەسەر ماڵە عەرەبەکاندا دابەش کردووە، هەر ماڵێکیش ١٠ هەزار دیناریان داونێ، بەمەرجی ئەوەی شوێنی ناونوس و جێگای لەدایکبوونی خۆی بگۆڕێتە کەرکوك. لەگەڕەکی ئیمام قاسمیشدا (٣٠٠) پارچە زەویان بەسەر ماڵە عەرەبەکاندا دابەش کردو کردیان بە خانوو، ناویشیان نا (حی البعث). دەسەڵاتدارانی بەعس لەکەرکوکدا هەر بەوە نەوەستان، ئەو هەمو خانوانەیان دروست کردو عەرەب نیشینیان کرد، بەڵکو بەبیانووی پڕوپوچ کەوتنە ڕووخاندنی گەڕەکە میللییەکان، بەتایبەتی گەڕەکە کوردیەکان کە بەناوی ئاوەدانکردنەوەو پەرەپێدانو نەخشاندنی شارستانیەتی شارەکەو کردنەوەی ڕێگەوبانی تازەو دامەزراندنی پڕۆژەی جۆراوجۆری دایرەی ئەمنو (منظومة)وە، پانکردنی هێڵی شەمەندەفەری کەرکوك-هەولێرەوە پڕۆژەی پردی تەپە-زێویە سەدان ماڵیان ڕوخاندو بەبلدۆزەر تەختیان کردن. بەمجۆرە دەبینین شاری کەرکوك سەرباری ڕوخاندنی هەزاران ماڵی کوردو دەربەدەرکردنی دانیشتوانەکەی، بەپشتێنەیەکی (٢,٠٠٠) لە دواکەوتوترین ماڵە عەرەب، بە ڕەبایەو ئۆردوگانی سەربازی ئابلۆقە دراوە. ئەگەر تێکڕای سەرژمێری هەر ماڵێك بە ٤-٥ کەس دابنێین، ئەوا سەرژمێری ئەو عەرەبە نیشتەجێ کراوانە دەگاتە ٨٠-١٠٠ هەزار کەس، کە بەشی هەرە زۆریان بریتین لە ئەفسەرو پۆلیسو ئەمنو ئیستخباراتو مخابراتو کەسانی حزبیو کارگێڕانی تایبەتی ئیشو کارەکانی خۆیانو دایرەکان. بەشێوەیەکی شۆڤێنیانەی ئەوتۆش پەروەردە کراون، کە هەموو دانیشتوانە تورکمانو کوردەکانی شارەکە بەدوژمنی خۆیان بزانن، بۆیە دۆخێکی نالەبار لەجیاوازی ڕەگەزپەرستانەی نەتەوەییو سیاسیو کۆمەڵایەتی لە شاردا بڵاوبۆتەوە. هەروەها سیاسەتی ترسو تۆقاندنو خەفەکردنو گرتنو ئازاردانو هەڵواسینی بەکۆمەڵ، زاڵبووە بەسەر خەڵکەکەدا، ئەویش بەمەبەستی چۆڵ کردنی تەواوی شارەکەیە لە کوردو تورکمانو، جێبەجێکردنی تەواوی بە عەرەبکردنیەتی.[3]

---

[3] یەکێتی نیشتمانی کوردستان، دەزگای ڕاگەیاندن: کەرکوكو سیاسەتی تەعریب، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، ئازاری ١٩٨٥، ل ٢٣-٢٧.

رژێمی بەعس هەر بەوەندە نەوەستا، چەندین (مستوطنة)و گەڕەکی عەرەبنشین لە ناو شاری کەرکوك دا دروست بکا، بەڵکو دەستتێوەردانو گۆڕینی نەخشەی ئیداری شاری کەرکوك هەوڵێکی تری بەعس بوو بۆ باشتر زەمینە خۆشکردنی بە عەرەبکردنو هەڵلوشینی ئەو ناوچە (نەوت)یانەو داپچڕینی زۆربەی قەزاو ناحیە کوردو تورکمانەکانی سەلاحەدینو دیالەو سلێمانی دا. هەروەها داپچڕینی بەشێك لە ناحیەی کەندیناوای پارێزگای هەولێرو لکاندنی بەقەزای دوبزەوە کە سەر بە پارێزگای کەرکوکە.

* دابڕینی قەزای دوبز (توز خورماتو) بە هەموو ناحیەکانیەوە (قادر کەرەمو نەوجول، کە هەموو دانیشتوانەکەی کوردن، ناحیەی مەرکەز کە تێکەڵاون، ناحیەکانی سلێمان بەگو ئامرلی کە زۆربەیان تورکمانن) و لکاندنی بە پارێزگای سەلاحەدینەوە.

* دابڕینی قەزای کفری بەهەموو ناحیەکانیەوە (سەر قەڵاو جەبارەو کۆکزو قەرەتەپە)و بەستنەوەی بەپارێزگای دیالەوە. دیارە دابڕینی ئەم دوو قەزایەو لکاندنیان بەپارێزگاکانی دیالەو سەلاحەدینەوە لەبەرچەند مەبەستێکە:

- بۆ ئەوەی کوردو تورکمانەکانی شاری کەرکوك بڵاوە پێ بکەنو پەرشو بڵاوبن.
- بۆ ئەوەی لەو پارێزگایانەدا ببنە کەمینەو ئاسانتر بتوانن بیانتوێننەوە.
- بۆ ئەوەی قوڵاییەکی جوگرافی بۆ پارێزگاکانی دیالەو سەلاحەدین دروست ببێ کە لەنەخشەی بەرگری شاری بەغدادان.
- دابڕینی قەزای کەلار (بە هەموو ناحیەکانی: مەرکەز، پێباز، تیلەکۆ)و قەزای چەمچەماڵ (بە هەموو ناحیەکانی: مەرکەز، ئاغجەلەر، سەنگاو)و بەستنەوەی بە پارێزگای سلێمانیەوە. بەجۆرە ٢/٣ی پارێزگای کەرکوك بەر شاڵاوی هەڵوەشاندنەوەی نەخشەی ئیداری کەوتووە. لەلایەکی ترەوە دێهاتە کوردەکانی: جاستان، دەربەند، سەربەشاخ، پەرکانە، عەوڵاقات، سارەلو، شناغە، دڕکەی گەورە، دڕکەی گچکە، چەرت، گێسمە، تەل هەڵاڵە، گەزوەشات، گەڕاو، هەمین مردی، شەعل، سێ بیان، قۆچ، قەیران، سێقوچان، لهێبان، قەبری عەلی، خۆشاو، دەرماناو، مەڵحەوالی، مەلاوەیس، حەسەن بەگ، سەرگەڕان، گابەرەکە، دوازدە هەوار، هەمزاغە، مهێدی، کەندە بەکرە، داود گورگە، سلێمان بەخشیان، کەنداڵ قوتنی،...و چەند گوندێکی تریش لەناحیەی کەندیناوای سەر بەقەزای مەخموری پارێزگای هەولێر

پچڕێنراون‌و کراونه‌ته ناحیه‌یه‌ك‌و ناویان ناوه ناحیه‌ی قودس، که مه‌رکه‌زه‌که‌ی سه‌رگه‌ڕانه، که ناوه‌که‌ی ئه‌ویشیان کردۆته قودس‌و لکاندویانه به‌قه‌زای دوبزه‌وه. مه‌به‌ستی حکومه‌ت له‌سیاسه‌تی هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی نه‌خشه‌ی ئیداری که‌رکوك بۆ که‌مکردنه‌وه‌ی ته‌واوی چڕی دانیشتوانی پارێزگاکه‌یه [4]، به‌تایبه‌تی رێژه‌ی چڕی کورده‌کان، ئینجا رێژه‌ی تورکمانه‌کان، به‌رانبه‌ر به رێژه‌ی دانیشتوانی عه‌ره‌ب له‌سه‌رانسه‌ری پارێزگاکه‌دا[5] .

## ١- به‌عه‌ره‌بکردنی قه‌زای دوبز

ئه‌م ناوچه‌یه گرنگترین ناوچه‌ی په‌ترۆڵیه له کوردستاندا هه‌ر بۆیه ده‌مێکه بۆته جێگای چاوتێبڕین‌و سه‌رنجی داگیرکه‌ران، ئه‌م ناوچه‌یه، بۆ جاری یه‌که‌م، له‌ساڵی ١٩٦٣دا، گشت کورده‌کانیان لێ راگواست‌و به عه‌ره‌بیان کرد، بۆ جاری دووه‌میش له‌ساڵی ١٩٧٤دا دووباره ته‌عریب کرایه‌وه.

- ناحیه‌ی مه‌رکه‌ز:

سنووری ئیداری ئه‌م ناحیه‌یه هه‌ر هه‌مووی ته‌عریب کراوه، هه‌ر له که‌رکوکه‌وه تا شاری دوبز چه‌ندین (مستوطنة) ی ته‌عریبیان دروست کردووه که ئه‌مانه‌ن:

* مستوطنة (دور إستخلاص الكبريت- موظفين) که هه‌موویان عه‌ره‌بی باشووری عێراقن‌و به‌عسین.
* مستوطنة (دور إستخلاص الكبريت- عمال) که هه‌موویان عه‌ره‌بی باشووری عێراقن.
*شاكر العزاوی که سه‌ره‌ك عه‌شیره‌ته‌و به‌دووری یه‌ك کیلۆمه‌تر له (معمل استخلاص الكبريت) کۆمه‌ڵێ خه‌ڵکی کۆکردۆته‌وه بۆ پارێزگاریکردنی کارگه‌که، ئێستا زیاتر له ١٥ ماڵن.
* مستوطنة (مه‌یسه‌لون) لای چراغ ١٠٠ ماڵ/ساڵی ١٩٧٧ دامه‌زراوه.
* مستوطنة (حه‌یفا) لای عومه‌ریه‌ك به‌رامبه‌ر قوتانی ئه‌وبه‌ر ١٥٠-٢٠٠ ماڵ/ عه‌شیره‌تی شرگاوین له‌ساڵی ١٩٧٧ نیشته‌جێ کراون.

---

[4] - هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل ٢٩- ٣١.

[5]- له‌تشرینی یه‌که‌می ١٩٨٦وه رژێم ده‌ستی کرد به دابه‌ش کردنی ٣٠ هه‌زار پارچه زه‌وی.

* مستوطنة (يافا) لای قوشقایه ۱۰۰ – ۱۵۰ ماڵ/ ساڵی ۱۹۷۷ دامەزراوە.
* مستوطنة (رافدين) سەرووی قەرەدەرە بەلای قەرەعەربەتەوە.
*دوو مستوطنة تر بەناوی (حطين)ەوە بۆ ضباط صف کراوە / هەر یەکەی ۵۰۰ ماڵ.
* مستوطنة (قدس) بەلای دوبزەوە ۱۰۰-۱۵۰ ماڵ.
* مستوطنة (دور الاذاعة).
* مستوطنة (دور منتسبي الامن والاستخبارات).
* مستوطنة (حي المثنى).
* مستوطنة (التاميم).
* مستوطنة (۳۰تموز).
-ناحیەی سەر گەڕان (قدس).

سنووری ئەم ناحیەیە لەساڵی ۱۹٦۳دا تەعریب کراوەو سەرلەنوێ لەساڵی ۱۹۷٦ تەعریب کراوەتەوە. ئەم ناوچەیە هەموو عەشیرەتی (جبور)ی بۆ هێنراوە.

* جاستان ۲۰ ماڵ تەعریب. ئێستا نەماوە.
* دەربەند ۲۰ ماڵ تەعریب.
* سەربەشاخ ۵۰ ماڵ تەعریب.
* پەرکانە ۱۰۰ ماڵ تەعریب / مەرکەزی شێخی عەرەبەکانە.
* سارەلو ۱۰ ماڵ تەعریب.
* شەناغە ۵۰ ماڵ تەعریب.
* گێسمە ٤۰ ماڵ تەعریب.
* چەرت ۲۰ ماڵ تەعریب.
* تەل هەلالە ۱۵ ماڵ تەعریب.
* گەزوەشان ۵۰ ماڵ تەعریب.

ب- ناوچە بەعەرەبکراوەکانی تەوەرە ستراتیجییەکان:

١- پارێزگای کەرکوک:

- ناحیەی ئاڵتون کۆپری — پردێ (قەزای دوبز) لە نێوان کەرکوک — پردێ چەندین سەربازگە دروست کراوە، بۆ هەر سەربازگەیەکیش ٥٠٠ خانوویان دروست کردووە، کە ئەمانەن:

* سەربازگەی دارەمان.
* سەربازگەی سەقزی.
* سەربازگەی پردێ.
* مستوطنة (حي عمل الشعبي ١٩٧٤) نزیکەی ١٠٠٠ ماڵە لەبەرامبەر دارەمان دروست کراوە، بە رێژی ئەوبەری ساڵەیی بۆ مستخدمینی هەمە جۆر (جاش، ئەمن،...) بەلاّم لەپێشدا بۆ تەعریب بووەو نەیانتوانیوە بیانهێنن.
* لەبەرامبەر ئەودا قەلاّیەکی سەربازی دروست کراوە، لەگەڵ ١٠٠ خانووی رۆژئاوایی تایبەت بەهێزی ئاسمانی.
* لای گەلۆزی پێش ئەوەی بگەیە پردێ، ئۆردوگایەکی سەربازی دروست کراوە لەگەڵ قەلاّیەکداو دوو (مستوطنة)یان لەگەڵ دروست کردووە، یەکێکیان ١٠٠ خانوو، ئەوی تریان ٥٠ خانوو بۆ (دور الضباط).
* کتکە ٧٠ ماڵ تەعریب / ١٩٧٦
* گورزەیی ٤٠ ماڵ تەعریب/١٩٧٦، لەشوباتی ١٩٨٥ەوە چۆڵیان کردووە.

- ناحیەی قەرەهەنجیر (قەزای کەرکوک) مەرکەزی ناحیەکە، لەساڵی ١٩٧٧دا تەعریب کراوەو ٤٠٠ ماڵیان بۆ هێناوە.
- ناحیەی قەرەحەسەن-لەیلان (قەزای کەرکوک)

* لەیلان لەساڵی ١٩٧٨ دا ٣٠٠ ماڵە عەرەبیان بۆ هێناوەو نیشتەجێیان کردووە.
* (مستوطنة) گامێشەوان، لەنێوان کەرکوکو تەرجیل ٧٠ ماڵ، ١٩٧٧، ساڵی ١٩٨٣ دەرکراون.
* تەرجیل ١٥ ماڵ/ساڵێ ١٩٧٧، هەروەها دوو (مستوطنة) تریش لەتەرجیل کراونەتەوە کە هەریەکەی ٥٠ خانووە.
* ترکە شکانی خوارو ٦٠- ٧٠ ماڵ تەعریب/لەپێش ساڵی ١٩٧٠وە تەعریب کراوە.

- ناحیەی داقوق (قەزای کەرکوك) ئەم مستوطنانە لەسنووری ئەم ناحیەیەدا دروست کراون:
* مهاوش ۳۰ ماڵ، عەشیرتی عەلگاوین، ساڵی ۱۹۷۹ نیشتەجێ کراون.
* عەسریە (لەنزیك هەفت تەغار) ٤٨٠ ماڵ/تێکەڵاو لەعەشیرەتی جیاجیا، ساڵی ۱۹۷٦ نیشتەجێ کراون.
* حسێن ئاغا ٤٠٠ ماڵ، ساڵی ۱۹۸۱ نیشتەجێ کراون، کە تێکەڵن لە عەشیرەتی عەرەبی جیاجیا.
* لەنێوان ئەلبوسەراج‌و هەفت تەغاری زەند بن عێز، ۳۰ ماڵ، ساڵی ۱۹۷۹ نیشتەجێ کراون.
* داقوق ٥٠٠ ماڵ، ساڵی ۱۹۸۲ نیشتەجێ کراون کە هەر هەموویان (بەدو)ن.
* کلێسە ۳٥ ماڵ، ساڵی ۱۹۸۲ نیشتەجێ کراون/ بەدو.
* دوو مستوطنة تر، کە هەریەکەی ۱۰۰ ماڵ دەبێ، لای عەسریە دروست کراوەو لە ساڵی ۱۹۸۰وە (بەدو)یان بۆ هێناوە.
* گوندی لهێبش تەعریب کراوە.
- ناحیەی یایچی (قەزای کەرکوك)
* ۱۰۰ ماڵ بەناوی مستوطنة (جمهوری)لای یایچی دروست کراوەو عەرەبی باشووری لێ نیشتەجێ کراوە. هەروەها چەندین مستوطنة تریش کەلەناحیەی (تازە خورماتو)و شوێنەکانی تری ئەم پارێزگایەدا دروست کراون‌و عەرەبی لێ نیشتە جێ کراون.

۲-پارێزگای سەلاحەدین:
- قەزای دووز:
- لە سنوری ناحیەی مەرکەزدا چەند (مستوطنە ) یەك دروست کراوە بۆ بەعەرەبکردنی ناوچەکە کە ئەمانەن:
* مستوطنة (یافا العصری) لە لای ئەلبوصباحەوە ۳۰۰ ماڵە لە ساڵی ۱۹۷۷دا نیشتەجێ کراون.
* مستوطنة (موسلاوییەکان) ٥٠٠ خانووە.
* مستوطنة یەکی تر لای دووزە کە ئەویش ٥٠٠ خانووە، بەڵام چۆڵە.
- لە سنوری ناحیەی ئامرلی دا چەند گوندێك تەعریب کراوە:

* ئامرلی مەرکەزی ناحیەکە.
* ئۆچ تەپە.
* بئر الذهب.
- لەسنوری ناحیەی سەلێمان بەگ:
* عەمماس تەعریب کراوە.

٣- پارێزگای دیالە:
١- قەزای کفری:
- ناحیەی کۆکز:
* گوندی قەڵا ڕاگوێزراوەو تەعریب کراوە.
- ناحیەی قەرەتەپە: ئەم گوندانەی خوارەوە لەسنوری ئەم ناحیەدا تەعریب کراون:
*عەکسە لە ساڵی ١٩٨٥ دا تەعریب کراوە.
* خدران ١٠ ماڵ تەعریب/١٩٧٥.
* ابو علك ١٢ ماڵ تەعریب/١٩٧٨.
* لهێب تەعریب کراوە.
*عظیم لە ساڵی ١٩٨٠ دا تەعریب کراوە.
* هەروەها مستوطنة (مجمع حي الاشتراكية) کە ٥٠٠ خانووە، لە ساڵی ١٩٨٠دا دروست کراوەو عەرەبی تێدا نیشتەجێ کراوە.

ب- قەزای خانەقین:
لە ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٧ هەموو گوندەکانی سنووری ئەم قەزایە ڕاگوێزراو هەمو ناوچەکەش تەعریب کرا، هەر گوندە بە ئەندازەی ژمارەی ماڵە کوردەکان، عەرەبیان هێناو لە شوێنی ئەواندا نیشتەجێکران.
- ناحیەی قەرەخان (جەلەولا) : ئەم گوندانەو چەندین گوندی تری ئەم ناحیەیە تەعریب کراون:

* قەلا ٥٠ ماڵ تەعریب/عەشیرەتی کرێوی/١٩٧٥
* بنەباخ ٣٠ ماڵ تەعریب/عەشیرەتی کرێوی/١٩٧٥
* سێڵەوەنی ٣٥ ماڵ تەعریب/منصورية/١٩٧٥
* تەپە چەرمین ٤٠ ماڵ تەعریب/ منصورية ١٩٧٥
* ئاوایی گەورە ٢٥٠ ماڵ تەعریب/ منصورية /١٩٧٥
* عەسریە ٨٠ ماڵ تەعریب/ منصورية /١٩٧٥
* ئەحمەدگوڵە ٣٢ ماڵ تەعریب/عەشیرەتی کرێوی/١٩٧٥
* ئاوایی فەرەج ٣٠ ماڵ تەعریب/عەشیرەتی کرێوی/١٩٧٥
* ئاوایی سلێمان ٣٠ ماڵ تەعریب/کرێوی ١٩٧٥
* عەلۆش ١٠٠ ماڵ تەعریب/دلێمی/١٩٧٥
* بەگالی ١٥ ماڵ تەعریب/دلێمی/١٩٧٥
* سەیدەلان ١٥ ماڵ تەعریب/جبوری/١٩٧٥
* کەشکەوڵ ٢٠ ماڵ تەعریب/جبوری/١٩٧٥
* مەعدان ١٢ ماڵ تەعریب/١٩٧٥

لەگەڵ چەندین گوندی تر کە ناویان نەزانراوە.

- ناحیەکانی مەکەز، قۆرەتو، مەیدان، هەر هەموویان تەعریب کراون، بەئەندازەی ژمارەی خانووەکان، ماڵە تەعریبیان بۆ هێناون، زیاتر لە ٣٠٠ گوندی سنوری ئەم ناحیانە تەعریب کراون، بەڵام ئێمە تەنها ناوی هەندێ لەو عەشیرەتە عەرەبیانە دەست نیشان دەکەین، کە لەو ناحیەدا نیشتەجێ کراون (بڕوانە ئاماری گوندە ڕاگوێزراوەکانی قەزای خانەقین). ئەم گوندانەی خوارەوە هەموو عەشیرەتی شرگاوییان لێ نیشتە جێ کراوە: باریکە، دەورە، بانزەمین، جەبراوەی عەبدوڵلا بەگ، ئیمام محەمەد، دەکەی حاجی برایم، دەکەی حاجی قادر، ئاوایی شێرگ، سەوز بلاخی گەورە، سەوز بلاخی بچوک، ئاوایی ساڵە خان، ئاوایی قادراغا، ئاوایی وەلیاغا. هەروەها عەشیرەتی کرێوی لە گوندی: قولە یەهودیو چەندین گوندی تر نیشتە جێ کراون، تازەدێ، موسا عوسمان، سەوز بلاخیش عەشیرەتی بدێریان لێ نیشتە جێ کراوە.

* بەڵام ئەم شوێنانەی خوارەوە زیاتر لە ژمارەی خانووەکان عەرەبیان بۆهێناوە:

| | |
|---|---|
| قۆرەتو | ۹۰ ماڵ تەعریب/عەشیەتی فراتی |
| تایر بەگ | ۱۰۰ ماڵ تەعریب |
| سالّە خان | ۱۰۰ ماڵ تەعریب |
| خدری شێخ غەریب | ٦ ماڵ تەعریب |

- هەروەها چەندین (مستوطنة)ش دروست کراونو عەرەبیان بۆ هێناونو تیایدا نیشتەجێ یان کردوون:

| | |
|---|---|
| * تولّەفرۆش: مستوطنة (تأميم) | ۳۰۰ ماڵ |
| * دێی عەلی مراد: مستوطنة یەکی | ۱۵۰ ماڵی |
| * دەرەوە نجف: مستوطنة یەکی | ۱۵۰ ماڵی |
| * کارێزی عەلی خان: مستوطنە ی (۷ی نیسان) | ۱۰۰ ماڵ تەعریب |
| * کارێزی خوارو: مستوطنة یەکی | ۱۰۰ ماڵی |
| * مەلەك شای: مستوطنة (حي الاشتراكية) | |

- هەروەها ناوی هەموو گوندو شوێنەکانی سنووری ئەم قەزایەیان گۆڕیوەو کردویانەتە عەرەبی، کە ئەمانە بەشێکن لەو سیاسەتەی بەعەرەب کردنی ناوچەکانی کوردستانو ناوی شوێنەکانی:

* ئەرکەوازی کراوەتە: شعلة.
* سەوزبلاّخی گەورە کراوەتە: مثنى.
* یوسف بەك کراوەتە: حارث الشيباني.
* تۆلّەفرۆش کراوەتە: التاميم.
* عەلیاوا کراوەتە: ابو عبیدەی جراح. بەهەمان شێوە گشت گوندەکانی تریش ناویان گۆڕدراوەو کراون بە عەرەبی.

- جگە لە بەعەریکردنی ناو شاری خانەقین کە بەسەدان خێزانی عەرەبیان بۆهێناوە.

ج- قەزای مەندەلی: گشت گوندو ناحیەکانی سنووری ئەم قەزایە تەعریب کراوە، بە مەرکەزی قەزاکەشەوە.

٤- پارێزگای واست:

* قەزای بەدرە: گشت گوندو ناحیەکانی سنوری ئەم قەزایەو مەرکەزی قەزاکە تەعریب کراون.

٥- پارێزگای دهۆك:

هەموو ئەو ناوچانەی لەو پارێزگایەدا بەر تەوەرە ستراتیجیەکان کەوتون، ڕاگوێزراون و بەعەرەبکراون کە ناحیەی ڕزگاری قەزای زاخۆو زۆربەی گوندەکانی قەزای سمێل دەگرێتەوە، کە سنوورەکەی بەم شێوەیەیە: هەموو ئەو زەوییانەی دەکەونە نێوان ڕووباری دیجلەو چیای بێخێرەوە، ئینجا هێڵێکی ڕاست لەچیای بێخێرەوە بەرەو باشوور دادەکشێ تا دەگاتە مەرکەزی قەزای سمێل، ئەوجا لەوێوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات دەڕوا تا دەگاتە ناحیەی (فەیدێ).

لەم پارێزگایەدا چەندین مستوطنة بۆ نیشتەجێکردنی عەرەب دروست کراوە، کە ئەمانەن:

١- قەزای زاخۆ:

- ناحیەی رزگاری

* مستوطنة یەك لە (فیشخاپور) دروست کراوە کە ٦٥٠ خانووەو عەرەبی باشوری لێ نیشتەجێ کراوە.

* مستوطنة یەکیش لە (دێرەبین) دروستکراوە، کە ٦٥٠ خانووەو عەرەبی باشوری لێ نیشتەجێ کراوە.

ب- قەزای سمێڵ: مەرکەزی قەزاکە بەر تەعریب کەتووەو چەندین ماڵە عەرەبی بۆ هێنراوە.

ئەم مستوطنانەش لەسنووری ناحیەی مەرکەزدا دروست کراون:

*سەرشۆر: ٤٠٠ خانووە.

*کانی سپی: ٣٠٠ خانووە.

- ناحیەی فەیدێ.

* مستوطنة (فەیدێ) کە ٥٠٠ خانووەو پڕ کراوە لەعەرەبو کراوەتە مەرکەزی ناحیەی (فەیدێ).

- ناحیەی سلێڤانی: ئەم مستوطنانەی لێ دروست کراوە:

*گرِ ڕەش ناویشی نراوە (٧ی نیسان).

*باستکێ سەری: ٥٠٠ ماڵ تەعریب.

*باتێل: ٥٠٠ ماڵو کراوەتە مەرکەزی ناحیەی سلێڤانی.

*ئاف زریك: ٣٥٠ ماڵ تەعریبی لێیە کە عەرەبی سوریان.

*خراب دێم: ٤٥٠ ماڵ تەعریب.

* کێلك: ٤٠٠ ماڵ تەعریب.

* گرشین: ٣٠٠ ماڵ تەعریب.

* باجت کەنداڵە: ٢٠٠ خانوو

د-پارێزگای نەینەوا:

زۆربەی ناوچە کوردنشینەکانی سنوری ئەم پارێزگایە بەر شاڵاوی ڕاگواستن‌و بە عەرەبکردن کەوتوون، چونکە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان، کە کەوتۆتە سنووری ئەم پارێزگایە، لە ناوچە گرنگەکانی تەوەرە ستراتیجییەکانن.

١- قەزای شێخان:

دەشێ ئەم قەزایە لە ڕووی جۆری بەعەرەب کردنەوە بکرێتە دوو بەش:

- ئەو گوندانە: یەزیدی، دیان، کیکانی تێدایە، ڕانەگوێزراون‌و بەعەرەب نەکراون، چونکە خەڵکەکانیان بەعەرەب ناونوس کردووە.
- ئەوانی تر ڕاگوێزراون‌و هەر هەموویشی تەعریب کراوە، (بڕوانە ئاماری گوندە ڕاگوێزراوەکانی قەزای شێخان) هەر گوندەش بە ئەندازەی ژمارەی ماڵە کوردەکان عەرەبیان بۆ هێناوە.
- عەین سفنی، کە مەرکەزی قەزاکەیە تەعریب کراوەو (٧٠٠) ماڵە عەرەبی بۆ هێنراوە.
-ئەتروش، کە مەرکەزی ناحیەی مزورییە، تەعریب کراوەو (١٥٠) ماڵە عەرەبی بۆ هێنراوە.

-ب- قەزای تەلەعفەر:

-لە دوای ساڵی ١٩٧٥وە هەموو ناوچەی زماری سنووری ئەم قەزایە ڕاگوێزراو بە عەرەب کراوە، چەندین عەشیرەتی عەرەبی یان بۆ هێنا، کە هەندێکیان بەدوون. ئەم عەشیرەتانەی کە بۆ ئەم ناحیەیە هێنراون (بە عەشیرەتە تەعریبیەکانی کۆنیشەوە) ئەمانەن: بەدو (شەمەر)، جبور، شەرابی، ئەلب متیوب، معامرە، جحێش.

- هەروەها بەشێکیش لە ناحیەی ئالگەنی بەر شاڵاوی تەعریب کەوتووە.

ج-قەزای شنگار:

دانیشتوانە یەزیدیەکەی سنوری ئەم قەزایە هەمووی بە عەرەب دانراوە، گەرچی ڕاشکوێزراون، ناو شاری شنگاریش بە عەرەب کراوە.

## فەسڵی دووەم

## بەعەرەبکردنی کورد

### ٢-١-٣: مەبەستی رژێمی بەعس لە بە عەرەبکردنی کورد

دەوڵەتی عێراق بەم سنوورەی ئێستای، بە پێی ویستو ئارەزوی بەریتانیا پێکهاتووە، بۆیە لەمەسەلەی پێکهاتنی نەتەوەیی، کۆمەڵایەتی، ئایینی، مەزهەبی دا، پەیڕەوی هیچ سەرەتایەك نەکراوە، بەڵکو بەرژەوەندیە بنچینەیی یەکانی بەریتانیا کراوەتە بناغەو پێوانەی دروستکردنی ئەم دەوڵەتە، عێراق بەم پێکهاتنە نەتەوەیی، ئایینی، مەزهەبییەی ئێستا دەشێ پێ بوترێ ((مەتحەفی ئەجناس)) چونکە:

لە نەتەوەدا: عەرەب، کورد، تورکمان، ئاشوری، کلدانی، سریانی، ئەرمەنو فارسی تێدایە...

لە ئاییندا: موسڵمان، مەسیحی، یەزیدی، جولەکە، سوببی تێدایە... لەمەزهەبدا: سوننی جۆراو جۆر (شافعی، حەنەفی، ئەحمەدی، حەنبەلی)، شیعەی جۆراو جۆر (جەعفەری، عەلەوی،...)، کەنیسەی جۆراو جۆر (ئەرسۆدکس، کاتۆلیك،...)ی تێدایی[6]. ئەم پێکهاتنە فرەنەتەوەیی، فرەئایینیو فرە مەزهەبییە، لەلایەکەوە زەمینەی بێ ئۆقرەییو نائارامیو تێکچونو پێکاهەڵپرژانو شەڕو شۆڕی لەناو عێراقدا بەجۆرێ ساز کردووە، کە دەسەڵاتی ناوەندی هیچ کاتێ نەتوانێ وەکو پێویست بەسەر ئەو کێشەو گیروگرفتانەدا زاڵ

---

[٦] یەکێتی نیشتمانی کوردستان، دەزگای ڕاگەیاندن: عێراقو مەسەلەی کورد، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، ١٩٨٤، ل ٣.

بێت، یا بیپەرژێتە سەر چارەسەرکردنیان، لەلایەکی تریشەوە هەم هەلی بۆ رژێمەکانی عێراقیش رەخساندووە، لەکاتی پێویستداو بە گوێرەی بەرژەوەندیە چینایەتی‌و نەتەوەییەکانی خۆیان سوود لەم بارە ببینن‌و بەگژ یەکتریاندا بکەن، هەم راستییە مێژوویی‌و دیمۆگرافیەکان بگۆڕن بە سوود وەرگرتن لە جیاوازی ئایینی، مەزهەبی،...هتد.

رژێمی بەعس هەر لەسەرەتای هاتنە سەر حوکمەوە، زیاتر لەهەر رژێمێکی تر، هەوڵی گۆڕینی سیمای دیمۆگرافی عێراقی داوە، بەجۆرێ کە لەگەڵ هێڵە گشتییەکانی بیرو بۆچوونەکانیاندا یەکانگیر بێ.

دیارە وەك چۆن نەتەوەی عەرەب ئایینی جیا جیا، مەزهەبی جیا جیاو عەشیرەتی جیا جیای تێدایە، هەر بۆیە ناشێ‌و نەبووە ئەم جیاوازیانە لە رووی لێکدانەوەی مێژوویی، کۆمەڵایەتیەوە، بە گوێرەی بنچینەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی‌و پێودانگ‌و سەنگ‌و تەرازووەکانی ببنە هۆی دابڕینی بەشێك لە نەتەوەیەك و بە زۆر لکاندنی بە نەتەوەیەکی ترەوە، بە بێئەوەی ئەم دابڕینە لەسەر بنچینەیەکی زانستی‌و پشت ئەستوور بە بەڵگەی مێژوویی بێ.

رژێمی بەعس هەر بەوەوە نەوەستاوە، دەیان هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشە لە خاکی کوردستان داگیرو تەعریب بکاو لە کوردستانی دابڕێ، بەڵکو هەنگاوی بەعەرەب کردنی کوردیشی پێبەپێی هەنگاوی بە عەرەبکردنی کوردستان هەڵهێناوە. بۆیە لەساڵی ۱۹۷۷ دا بڕیارێکیان دەرکرد، کە بە گوێرەی ئەو بڕیارە چەندین عەشیرەت‌و پەیڕەوی کەرانی ئایینی جیا جیای کوردستان بە عەرەب لە قەڵەم دراون‌و لە ناونوسی گشتیی ۱۷/۱۰/۱۹۷۷ دا عەرەب نوسیان کردن، بە بێ ئەوەی ئەو خەڵکانە فریان بەسەر بە عەرەب بونەوە هەبێ، بە بێئەوەی هیچ هەستێك بە ئینتمای نەتەوەی بۆ عەرەب لایان دروست بوبێ. دیارە ئەمە هەر چۆنێك لێك بدرێتەوە لە هەر شتێك بیرو بۆچونی شۆڤێنیستی‌و رەگەزپەرستانەی بەعس دەردەخا، دواکەتویی‌و کلۆڵیی رژێمەکە پیشان دەدا. گەر نا، هیچ سەرەتایەکی زانستی، مێژوویی‌و تەنانەت مرۆییش ئەوە بە رەوا نابینێ خەڵکانێك خۆیان بەئەندامی نەتەوەیەك نەزانن، لە زمانەکەی حاڵی نەبن، بەزۆرەملێ هەر بە ئەندامی ئەو نەتەوەیە حساب بکرێت. بەعەرەبکردنی کورد لەبیری ستراتیجی بەعسدا روو لە کەم کردنەوەی ((مەترسی دیمۆگرافی کوردە))، بۆ ئەوەی رێژەی کورد لەچاو رێژەی عەرەبدا کەم بکاتەوە، بەجۆرێ عەرەبی عێراق

ڕێژەی هەرە زۆری دانیشتوانی عێراق و کوردیش ڕێژەی هەرە کەمی دانیشتوانی عێراق پێکبهێنێ، ئەمەش تەنها لەڕێگەی گۆڕینی ڕاستیە مێژووییەکان و دەرکردن و کوشتن و بڕی بەردەوام و هەمیشەیی کوردەوە دەکرێ، کە بەعس هەنگاوی جدی بۆ ناوە.

### ٣-٢-١: ئەو ئایین و عەشیرەتانەی لەکوردستاندا بەعەرەب دانراون

لەکوردستانی عێراقدا، گەلێ عەشیرەت و ئایینی جیاجیا بەر شالاوی بەعەرەبکردن کەوتوون، کە ئەمانەن:

أ- ئەو ئایینانەی لەکوردستانی عێراقدا بەعەرەب دانراون:

پەیڕەوانی ئەم ئایینانەی خوارەوە لەکوردستاندا بەعەرەب کراوە:

١- یەزیدی[7]: یەزیدییەکان، یا پەیڕەوانی ئایینی یەزیدی، بەشێوەیەکی سەرەکی لەقەزاکانی شێخان و شنگاردا بڵاوبونەتەوە، هەروەك بەشێوەیەکی پەرش و بڵاویش لەقەزاو ناحیەکانی دەوروبەری موسڵدا هەن. یەزیدییەکان لە کوردستانی سوریا، تورکیا، هەروەها لە ئەرمەنستان درێژبوونەوەیان هەیە. ژمارەی یەزیدییەکانی ئێستای کوردستانی عێراق بەزیاتر لە ٤٠ هەزار کەس مەزەندە دەکرێ، ئایینی یەزیدی یەکێکە لە ئایینە کۆنەکانی کوردەواری و کتێبە پیرۆزەکانیشی هەر بە زمانی کوردی (دیالێکتی کرمانجی ژوورو) نوسراونەتەوە، کە بریتین لە (جیلوە) و (مەسحەفا ڕەش)، هەروەك نوێژو پاڕانەوەو نزاشیان هەر بەکوردییە، لاشیان وایە لەڕۆژی قیامەتدا خوا بە زمانی کوردی لەگەڵیاندا دەدوێ و حەق و حسابی هەموو خەڵکیش هەر بەو زمانە دەکا، یەزیدییەکان لەساڵی ١٩٧٧ەوە بە عەرەب لەقەڵەم دراون، لەگەڵ ئەوەشدا لەسنووری قەزای شنگار بەر سیاسەتی ڕاگواستنی زۆرە ملێ کەوتوون و لە ئۆردوگای زۆرەملێدا کۆکراونەتەوە.

---

[7] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: لاوك، یەزیدییەکان لەمێژووی نەتەوەکەیاندا، لەبڵاوکراوەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، دەزگای ڕاگەیاندن/ دەنگی شۆڕشی عێراق (٥)، چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ، چاپی یەکەم، ١٩٨٤.

٢- دیانەکانی کوردستان:

بەپێی بڕیاری ساڵی ١٩٧٧ هەموو مەسیحییەکانی کوردستان (بێجگە لەئەرمەنەکان) بە عەرەب لەقەڵەم دران، شتێکی ڕوونو ئاشکرایە کە مەسیحیەت ئایینی عەرەب نییەو تەنها عەرەبیش مەسیحی نین، بەڵکو چەندین گەلو نەتەوەی جیاجیا لەئەوروپا، ئاسیا، ئەفریقاو ئەمریکا پەیڕەوی لەئایینی مەسیحی دەکەن. ئایینی مەسیحیش زۆر دەمێکە لە کوردستاندا بڵاوبۆتەوەو، کوردیش یەکێك بووە لەو نەتەوانەی کە بەشێکی چۆتە سەر ڕێبازی ئەم ئایینەو بڕوای پێ هێناوە. وێڕای ئەمە ئەگەر بەشێك لەپەیڕەوانی ئەم ئایینە لە کوردستاندا بە ڕەگەزیش کورد نەبنو لە کەمە نەتەوایەتییەکانی کوردستان بن، ئەوا هەر بەشێکن لەگەلی کوردستانو بەدرێژایی سەدان ساڵ لەناو کوردستانو لەباوەشی گەلی کورددا ژیاونو هەرگیز خۆشیان بە عەرەب نەزانیوەو تەنانەت زۆربەی گوندە دیانەکانی سنووری پارێزگای دهۆك، بەهۆی شریتی سنوورەوە ڕاگوێزراون، ئەگەر ئەم دیانانە عەرەب بن چ پێویست بە ڕاگواستن دەکا؟!.

٣- کاکەییەکانی بەر جادە:

کاکەییش، وەك ئایینی یەزیدی، یەکێکە لە ئایینە کۆنەکانی کورد، ڕاستە ڕژێمی بەعس بۆی نەلواوە هەموو کاکەییەکان بە عەرەب لەقەڵەم بدا، بەڵام گشت ئەو کاکەییانەی لەبەر جادەی بەغدا – کەرکوکن، هەموویان بە عەرەب لەقەڵەم دراونو لەساڵی ١٩٧٧ دا عەرەبنووس کراون.

ب- ئەو عەشیرەتە کوردانەی بەعەرەب دانراون:

گەلێ عەشیرەتو تایفەو کۆمەڵە خەڵکی جیاجیا لەکوردستانی عێراقدا بەر شاڵاوی بەعەرەبکردن کەوتون، کە ئەمانەی خوارەوەن:

١- کیکان:

ئەم عەشیرەتە لەقەزای شێخانو ناحیەی (ئەلکیش)ی سەر بەقەزای تلکێف نیشتەجێن. خۆیان بە درێژبوونەوەی عەشیرەتی (شکاك)ی کوردستانی ئێرانو تورکیا دەزانن.

